


چاپی دووەم

# گوزەرێك بۆ یادكردنەوەی ڕابردوو

نیكۆلاس سپاركس ● وەرگێڕانی بەرزان عوسمان





# ناوەندی ڕۆشنبیری و هونەریی ئەندێشە

## بەڕێوەبەری گشتیی ناوەند: هەژار مەجید

## بەڕێوەبەری چاپ و بڵاوکردنەوە: سیروان مەحمود

ناوەندی ڕۆشنبیری و هونەریی ئەندێشە - ناوەندی بڵاوکردنەوەی ئەندێشە

سلێمانی - شەقامی مەولەوی - تەلاری بازرگانیی سیروانی نوێ - نهۆمی چوارەم

http://www.endeshe.net

andesha.library@yahoo.com ● andesha@outlook.com

http://www.facebook.com/Andeshalib

07501026400

# گوزەرێك بۆ یادكردنەوەی ڕابردوو

نیكۆلاس سپاركس

وەرگێڕانی بەرزان عوسمان



ناوی کتێب: گوزەرێک بۆ یادکردنەوەی ڕابردوو

ناوی نووسەر: نیکۆلاس سپارکس

وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە: بەرزان عوسمان

بابەت: ڕۆمان

دیزاینی تێکست: دانا حەسەن

نۆبەتی چاپ: دووەم ٢٠١٧

چاپخانە: تاران

تیراژ: (٢٠٠٠) دانە

نرخ: (٦٠٠٠) دینار

ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە (١٠٥٨)ـی ساڵی (٢٠١٦)ـی پێ دراوە.

وەرگێڕانی ئەم ڕۆمانە پێشکەشە بە

شەهیدانی ڕێی ڕزگاریی کوردستان و پێشمەرگە و شەڕڤانان،

بە سەروەرانی بەرگری لە نیشتمان.

# ١

لە ساڵی ١٩٥٨دا، شارۆچکەی بیوفۆرت لە ویلایەتی کارۆلاینای باکوور، کە لەسەر کەناری دەریا هەڵکەوتووە، نزیک شاری مۆرهێد، شوێنێک بوو وەک زۆربەی شارۆچکە بچووکەکانی تری باشوور. لە وەرزی هاویندا، ڕێژەی شێی هێند بەرز دەبووەوە، بە جۆرێک، گەر پیاو بۆ کەمێکیش سەری لە ماڵ دەر بکردایە، دەبوو دواتر ئاوێک بکات بە خۆیدا. منداڵەوردکەش لە مانگی ئاب بۆ مانگی ئەیلوول، ئەو دەمەی گەرما پیاو هەراسان دەکا، بە پێی پەتی بەژێر داربەڕووەکاندا دێن و دەچن و ڕاکەڕاکیانە. خەڵکەکەشی لە ئوتومبێلەکانیانەوە کەسێکیان بدیتبایە لەسەر شەقام یان کۆڵانێک، بیانناسیایە و نەیانناسیایە، سەلامیان بۆ دەکرد. هەوای ئەو شارۆچکەیە بۆنی سنەوبەر و خوێ و هەڵمی دەریا پڕی کردبوو، بۆنێک بوو، تایبەت بەو ویلایەتە. زۆرینەی دانیشتووانەکەی لەسەر ڕاوکردنی ماسی، لە کەنارە تەنکاوەکان، یاخود لە ڕووبارەکەی سەرەوە بە ڕاوکردنی قرژاڵ گوزەرانی ڕۆژانەیان دابین دەکرد. لە هەرشوێنێکەوە تەماشای ئاوی ڕووباری ئینتراکۆستڵت بکردایە، بەڵام و یەختەکانت دەبینی

لەنگەریان گرتووە. تەنها سێ کەناڵی تەلەڤزیۆنییش هەبوو لەو شارۆچکەیە، هەرچەند بەلای ئێمەومانانەوە، کە لەوێ گەورە ببووین، گرنگییەکی ئەوتۆمان نەدەدا بە تەلەڤزیۆن. بەڵکوو زۆرینەی کاتەکانی ژیانمان بە کڵێساکانەوە سەرقاڵ دەبووین. ژمارەی کڵێساکان، تەنیا لە سنووری شارۆچکەکە خۆی، هەژدە کڵێسا دەبوون. هەندێکیان بریتی بوون لە کڵێسای مەسیحیی هۆڵی هاوڕێیەتی، کڵێسای بەخشراوەکان، کڵێسای تەوبەکاران، جگە لەمانەش، کڵێساکانی پیرۆزکردن هەبوون. ئەو دەمەی تەمەنم بەرەو سەر هەڵدەکشا، لەبیرمە ئەم کڵێسایانە باوترین و پەسەندترین مەزهەبی ئایینی بوون. دەچوویتە هەر سووچێکی شارۆچکەکە، کڵێسایەکی پیرۆزکردنت بەرچاو دەکەوت، هەریەکەشیان خۆی لەوی تر بە باشتر لەقەڵەم دەدا. ئەمانیش زۆر بوون، لەوانە، کڵێسای باشوور، کڵێسای خوداپەرستی، کڵێسای پەیام، کڵێسای سەروەری... ئیتر زۆرن.

لەو دەمەدا، کار و چالاکییەکانی خوێندکارانی ئەو ساڵە، لەلایەن کڵێسای باشوور سپۆنسەری بۆ کرا، بە هاوکاریی خوێندنگە ئامادەییەکە. هەموو ساڵێک فێستیڤاڵی کریسمسیان لە هۆڵی شانۆی بیوفۆرت نمایش دەکرد، لە ڕاستییشدا ئەم شانۆیە لەلایەن هێگبێرت سولیڤەنەوە نووسرابوو. ئەم کابرایە قەشەیەکی مەسیحی بوو، هەر لە زەمانی مەغۆلەکانەوە لە کڵێسا بووە، دەی ئێجگار ئەوەندەش پیر نەبوو، بەڵام تەمەنی هەبوو، پێستی هێند تەنک ببووەوە پیاو، گەر تەماشای بکردایە، ئێسقانەکانی دەبینی - منداڵەوردکە سوێندیان دەخوارد، دەیانگوت خوێنی دەمارەکانی دیارە - قژی وەک

بەفری سپی وا بوو، دەتگوت خووریی کەروێشکە.

دەی بە هەرحاڵ، با ئەوەندە غەیبەتی نەکەین. ئەم کابرایە شانۆنامەیەکی نووسی بە ناوی فریشتەی کریسمسەوە، چونکە نەیدەویست ئەمساڵیش دیسان هەر شانۆییی گۆرانیی مەسیحیی چارلز دیکنز دووبارە نمایش بکرێتەوە. بۆیە هەوڵی دا لە مەیدانی نووسینی شانۆدا، ئەسپی خۆی تاو بدا و دەست بکات بە نووسینی شانۆیەک. پێشتر لە ژیانیدا چەندین وتاری ئایینیی نووسیبوو، جا پیاو ڕاستییش بڵێت، هەمووی وتاری باش و بەپێز بوون، بەتایبەت کاتێک وتاری لەسەر غەزەبی خودای گەورە بەرامبەر زیناکاران دەخوێندەوە. بڕوات بێت، هەر کە باسی زیناکارانی دەکرد، هێند گەرم دەبوو، دەماری ملی هەڵدەستا و خوێنی دەکولا. ئیتر ئەمە گرنگترین بابەتی ئەو بوو. ئەو کات کە ئێمە منداڵتر بووین، لەگەڵ منداڵانی گەڕەک و هاوڕێکانمان، هەر کە چاومان بەو کابرایە دەکەوت، خۆمان لەپشت درەختەکانەوە دەشاردەوە و هاوارمان لێ دەکرد، "هێگبێرت زیناکەرە!" ئەوجا دەکەوتینە تریقەی پێکەنین، دەتگوت هیچ زیندەوەرێکی تری سەر زەوی لە ئێمە ئاقڵتر نییە.

پیرە هێگبێرتی داماویش کە گوێی لێمان دەبوو، لە شوێنی خۆی ڕەق دەوەستا و گوێقولاخ دەبوو - درۆم نەکردبێ، سوێند بە خوا گوێی قوت دەبووەوە - سوور هەڵدەگەڕا، دەتگوت تەماتەیە، دەمارەکانی ملی ڕەق دەر دەپەڕین، لە نەخشەی ڕووبارەکانی ئەمازۆن دەچوون، کە لە کەناڵی ناشناڵ جیۆگرافیک پیشانی دەدا. چاوی بەملا و ئەولادا دەگێڕا بۆمان، کوڕە گەر دەتانبیی چەند دەهری دەبوو، هەر

مەپرسن، دۆ و دۆشاوی تێکەڵ دەکرد.

ئێمە لەپشت درەختێکەوە خۆمان دەشاردەوە و هێگبێرتیش، بەڕاست، نازانم دەبێت چ دایک و باوکێک منداڵەکەیان ناو بنێن هێگبێرت؟ ئەوەندە داماو بوو، چاوەڕوانی دەکرد خۆمان ئاشکرا بکەین، وای دەزانی هێندە کەرین، هیچ ناکەین دەچینە بن دەستی. دەستمان دەگرت بە دەممانەوە، تا بە تریقەی پێکەنینمان ئاشکرا نەبین. بەڵام هەموو جارێکیش لەپشتی درەختەوە چاوی لێمان دەبوو، دەهات بەدەوری درەختەکەدا سەری دەهێنا و دەبرد، ئەوجا کە چاوی دەکردین، دەوەستا، بەو چاوە زەقە بزانەیەوە تەماشای دەکردین، دەیگوت، "دەزانم تۆ کێیت، دەتناسم، لاندن کارتەر. خوداش دەزانێ." کەمێک بلمەبلمی دەکرد و دواتر ملی خۆی دەشکاند و دەڕۆیشت. بۆ نەگبەتی، کۆتایی هەفتەش لە کەنیسە، لە کاتی وتارخوێندنەوەیدا، ئێمەی بەدی دەکرد و تێکەڵ بە وتارەکەی دەیگوت، "خودای مەزن گەلێک بەبەزەییە بەرامبەر منداڵان، بەڵام منداڵانیش پێویستە لاسار نەبن و شایانی ئەو بەزەییە بن." ئێمەش لە جێی خۆمانەوە سەرمان دادەخست، نەک لەبەر ئەوەی تەریق دەبووینەوە، نەوەڵڵا، خوا هەڵناگرێ نەماندەزانی تەریقبوونەوە چییە، بەڵکوو لەبەر ئەوەی نەبا تریقەی پێکەنین لە زارمان دەر بپەڕێ. پیرە هێگبێرت هەرگیز لە ئێمەی منداڵ تێنەدەگەیشت، کە ئەمەش بەڕاستی شتێکی سەیر بوو، چونکە بۆخۆیشی ساحێبی منداڵێک بوو. منداڵەکەشی کچ بوو.

بە هەرحاڵ، وەک باسم کرد، هێگبێرت ساڵێکیان شانۆنامەی فریشتەی کریسمسی نووسی و بڕیاری دا

نمایش بکرێت. قسەیەکیش بۆ خوا بکەین، شانۆییەکەی خراپ نەبوو، ساڵی یەکەم کە نمایش کرا، هەمووانی سەرسام کرد. ئەم شانۆییە باسی لە پیاوێک دەکرد، کە چەند ساڵێک بوو ژنەکەی وەفاتی کردبوو. ئەم پیاوە کە ناوی تۆم سۆرنتن بوو، پیاوێکی ئایینی و لەخواترس بوو، بەڵام دوای ئەوەی ژنەکەی لە کاتی منداڵبووندا دەمرێت، بیروباوەڕی لاواز دەبێت و تووشی لادان دەبێت. کچە تاقانە بچووکەکەی بەتەنها بەخێو دەکات، بەڵام باوکێکی زۆر باش نەبووە. ئەم کچە بچووکە وڕکی گرتبوو، دەیویست بۆ کریسمس دیاریەکی بۆ بکڕێ، ئەویش سندوقێکی مۆسیقای بچووکی تایبەت بوو، کە وێنەی فریشتەیەکی لەسەر هەڵکۆڵرابوو، لەوانەی سەری سندوقەکە دەکەیتەوە و مۆسیقا لێدەدات. ئەم سندوقەی لە وێنەی کەتەلۆگێکی کۆندا بەرچاو کەوتبوو، وێنەکەی لێ کردبووەوە و دابوویە دەستی باوکی، تا بۆی پەیدا بکات. باوکی کچەش بێوچان دەگەڕێت، زۆر دەگەڕێت، بەڵام بێسوودە، لە هیچکوێیەک ئەم دیارییەی چنگ ناکەوێت. دەی ئەوە ئێوارەی جەژنی کریسمس هات، کەچی هێشتا دیاری بۆ کچە نەهاتووە و بابی داماویش هەر وا لە گەڕاندایە. لەو عانەدا کە لەو دوکان و بازاڕانەدا وێڵی گەڕان بوو، ڕێکەوتی ژنێکی غەریب دەکات، کە هەرگیز پێشتر نەیبینیبوو. ژنەش بەڵێنی دەداتێ یارمەتیی بدات لە پەیداکردنی ئەو دیارییە بۆ کچەکەی. دەی پێکەوە دەگەڕێن. سەرەتا لە ڕێیاندا دەرۆزەکەرێک دێتە ڕێیان، ئەمانیش شتێک پارەی دەدەنێ و بەڕێی دەکەن. دواتر دەچنە هەتیوخانەیەک تا چاویان بە هەندێک منداڵانی بێ دایک و باب بکەوێت،

ئەوجا دەچن سەردانی ژنێکی بەساڵاچووی تەنیا دەکەن، کە تەنیا دەیویست لە ئێوارەی جەژنی کریسمسدا کەسێکی لا بێت هاودەنگیی بکات. لەو کەینوبەینەدا، ژنە غەریبەکە لە بابی کچە دەپرسێت، "ئەی بۆخۆت چیت دەوێت بۆ کریسمس؟" ئەمیش لە وەڵامدا دەڵێت، دەمەوێت ژنەکەم زیندوو ببێتەوە. ژنەکەش دەیبات بۆ فوارەکە و پێی دەڵێت، تەماشای ناو ئاوەکە بکە، ئەوجا مرازی دڵت حاسڵ دەبێت. کاتێک ئەویش تەماشای ناو ئاوەکە دەکات، چ ببینێت باشە؟ ڕوخساری کچە بچووکەکەی خۆی دەبینێت. لەسەر چۆکان دادەنیشێت و دەست دەکات بە گریان. لەو سەروبەندەدا ئەم خەریکی گریان و هەنسکە، ژنە غەریبەکە لە چاوان بزر دەبێت. کابراش بە هەرچوار لادا چاوی بۆ دەگێڕێت؛ ئەملا دەکات، ئەولا دەکات، بەڵام دەتگوت زەوی قووتی داوە، لە هیچ کونێکەوە دیار نامێنێت. دواجار بەرەوماڵەوە ملی ڕێ دەگرێت، لە ڕێگە شەپۆلی ئەم ڕووداوانەی بەسەری هاتن، بەردەوام لە بیروهۆشیدا دێن و دەچن. پێ دەنێتە ژووری کچە بچووکەکەیەوە، دەبینێت خەوتووە، کە تەماشای دەکات، ئەوجا بۆی دەر دەکەوێت تاکە شتێک لە ژنەکەی بۆی مابێتەوە، ئەم کچە خنجیلانەیەیە. دووبارە دەست دەکاتەوە بە گریان، چونکە بۆخۆیشی دەزانێ باوکێکی باش نەبووە لەگەڵ ئەم کچەیدا. بۆ ڕۆژی دواتر، دەبینێت سندوقە مۆسیقاکەی عەودالی بوو پەیدای بکات، ئەوەتا لەژێر درەختی حەوشەکەیاندایە، ئەو فریشتەیەی لەسەر سندوقەکەش هەڵکۆڵرابوو، ڕاست لەو ژنە غەریبە دەچوو، کە شەوی ڕابردوو ڕێکەوتی کرد.

لەبەر ئەوە، بۆیە پێتان دەڵێم شانۆییەکی خراپ نەبوو. گەر پیاو قسەیەک بۆ خوا بکات، کە خەڵکی دەهاتنە سەیری ئەم شانۆییە، کۆڵێک دەگریان و فرمێسکیان دەڕشت. هەموو ساڵێک کە نمایش دەکرا، پارەیەکی ئێجگار زۆری پەیدا دەکرد، جا بە هۆی ئەوەی لەنێو خەڵکدا ناوبانگێکی باشی بەدەست هێنا و خەڵکی حەزیان لێ دەکرد، بۆیە هێگبێرت ئیدی ناچار بوو نمایشی شانۆییەکەی لە کڵێساوە بگوازێتەوە بۆ هۆڵی شانۆی بیوفۆرت، چونکە ژمارەی کورسییەکانی گەلێک زیاتر بوون. ئەو ساڵەی من دوا قۆناغم بوو لە خوێندنگەی ئامادەیی، شانۆگەرییەکە بە هۆی ئەوەی ژمارەی ئامادەبووان هێند زۆر بوون، دەبوو بۆ ئەوانی دیکەش دووبارە بکرێتەوە.

هێگبێرت کەسانی گەنج و لاوی دەویست بۆ نمایشی شانۆگەرییەکەی – خوێندکارانی دواقۆناغی ئامادەیی، نەوەک گروپی شانۆکارەکانی تر. من وای بۆ دەچم، هێگبێرت پێی وا بووە ئەمە دەبێتە ئەزموونێکی باش بۆ ئێمە، پێش ئەوەی بچینە کۆلێژ و تووشی کەسانی زیناکار ببین. لەو جۆرە کەسانە بوو، هەمیشە لە خەمی ئەوەدا بوو، لە کار و کردەوەی خراپ دوورمان بخاتەوە. دەیویست هەموو کات ئەوەمان لەیاد بێت، کە خودای گەورە ئاگای لێمانە، لە هەرکوێیەک بین، هەوڵی دەدا فێرمان بکات، گەر بڕوامان بە خودای مەزن هەبێت، ئەوا پەروەردگار چاکمان بۆ دەکات و عاقیبەتمان خێر دەبێت. ئەمە وانەیەک بوو، کە من لە کۆتاییدا فێری بووم، بەڵام لە هێگبێرتەوە نا، بەڵکوو لە کەسێکی ترەوە. دواتر دەزانن...

وەک پێشتریش عەرزم کردن، بیوفۆرت، هەر وەک شارۆچکەکانی تری باشوور، نموونەیی بوو، لەگەڵ ئەوەشدا مێژوویەکی جوانی هەبوو. دەگێڕنەوە، دەڵێن چەتەیەکی دەریایی بە ناوی کابرای ڕیشرەش لێرە خانووی هەبووە، کەشتییەکیشی هەبووە بە ناوی تۆڵەی شاژنە ئاناوە، ئەم کەشتییە وەک باسی دەکەن، لە کەناری دەریاکە، ژێر لم و خۆڵ کەوتووە. لەم دواییانەدا هەندێک شوێنەوارناس و زەریاناسەکان، یان با بڵێین ئەوانەی بەدوای ئەم جۆرە شتانە دەگەڕێن، دەیانگوت ئەو کەشتییەیان دیوەتەوە، لێ تاکوو ئێستا، هیچکەس دڵنیا نییە، چونکە ئەم کەشتییە زیاتر لە دوو سەد و پەنجا ساڵ بەر لە ئێستا نقوم ببوو، ئێ زەحمەتیشە دڵنیا ببیت ئەو کەشتییەیە یاخود نا. لە ساڵی ١٩٥٠ەوە، شارۆچکەی بیوفۆرت بە گەلێک ڕووداوی ڕۆژگاردا تێپەڕیوە، بەڵام هێشتا نەبووەتە شارێکی گرنگی ناوچەکە. بیوفۆرت لە سەردەمانی ڕابردوودا و لە داهاتووشدا هەر بەبچووکی دەمێنێتەوە، ئەو کاتەی منداڵ بووم، بەدەگمەن لەسەر نەخشەش شوێنی دیار بوو.

ئەو هەرێمەی شارۆچکەی بیوفۆرتیشی دەگرتەوە، دەسەڵاتێکی سیاسیی جیاوازی هەبوو لە کارۆلاینا و هەموو بەشەکانی ڕۆژهەڵاتی ویلایەتەکەی دادەپۆشی - ڕووبەرەکەی نزیکەی بیست میل چوارگۆشە دەبێت - کەچی هیچ شارۆچکەیەکی تێدا نەبوو، کە دانیشتووانەکەی بگاتە زیاتر لە بیست هەزار کەس. لەگەڵ ئەوەشدا، بە بەراورد لەگەڵ ئەو شارۆچکانەدا، بیوفۆرت هەمیشە بە شوێنێکی بچووک لەقەڵەم دەدرا. لە ئەنجوومەنی نوێنەرانی ئەمەریکا، هەموو

ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی ڕالیف و باکوری ویلینگتن و هەتا سنووری ڤێرجینیا، هەمووی باوکم نوێنەرایەتیی دەکردن.

وا بزانم ناوی باوکمتان بیستووە. بگرە ئێستاش هەر ناوبانگی خۆی هەیە. ناوی وۆرس کارتەرە، بۆ ماوەی سی ساڵ ئەندامی ئەنجوومەنی نوێنەران بوو. هەموو دوو ساڵ جارێک، لە سەروبەندی هەڵبژاردنەکاندا ئەم دروشمەی دەگوتەوە، "وۆرس کارتە نوێنەری ـــــ" ئیدی دەنگدەرانیش لەسەر فۆرمی دەنگدانەکان، تەنیا پێویست بوو ناوی شارەکە و شوێنی نیشتەجێی خۆیان پڕ بکەنەوە. بەبیرم دێ، کە لەگەڵ دایکمدا دەچووینە نێو جەماوەر و خەڵک تا پیشانی بدەین پیاوێکی بەڕاستی باش و نموونەییە، خەڵکمان دەبینی بە لافیتە و لەوحەی دروشمەوە هاتبوونە سەر شەقام. لەم ڕۆژگارەدا، ئەو شتانە باویان نەماوە، بەڵام ئەو سەردەمە باشترین پروپاگەندەی جەماوەری بووە لە کاتی هەڵبژاردنەکاندا. دەیهێنمە پێشچاو، گەر باوکم لەم سەردەمەدا ئەمەی بکردایە، نەیارەکانی کۆڵێک تانەوتەشەریان لێ دەدا، بەڵام شکور بۆ خوا، شتی وامان نەبیست. لێ، جارێکیان کابرایەکی جووتیار لەو شاری دبلنە هەندێک قسەی ناشرینی نووسیبوو، کاتێکیش دایکم ئەم قسانەی بینی، چاوی منی داخست و کەوتە نزاکردن، تا خوای گەورە لەو کابرا دەبەنگە داماوە ببوورێت. دایکم ئەو جنێوانەی بۆ بەکار نەهێنا، بەڵام من لە بۆنی وشەکانی تێگەیشتم.

هەرچۆنێک بێت، باوکم کەسایەتییەکی ناودار بوو، هەموو کەس ئەمەی دەزانی، تەنانەت پیرە هێگبێرتیش. ئەم دووانە پێکەوە دانوویان نەدەکوڵا، پەیوەندییان پێکەوە باش نەبوو،

لەگەڵ ئەوەشدا، باوکم هەرکاتێک لە ماڵ بووایە، دەچووە سەردانی کەنیسەکەی، ڕاستییەکەی، یەکجار بەو جۆرەش نەبوو. هێگبێرت جگە لەوەی بڕوای وا بوو زیناکاران لە دۆزەخدا سزای ئەو کارانەیان وەر دەگرن، لەگەڵ ئەوەشدا دەیگوت کۆمۆنیستی بەڵایەکە، مرۆڤ بێبڕوا دەکات و دەیخاتە سەر ڕێی خراپ. هەرچەند من لێی حاڵی نەدەبووم مەبەستی چ بوو، بەڵام ئەهلی کڵێسا چاک دەیانزانی ئەم کابرایە ڕووی دەمی لە باوکمە، باوکیشم چاوەکانی دادەخست و وای دەر دەخست، کە گوێی لێ نییە، هیچی نەدەگوت. باوکم یەکێک بوو لە ئەندامانی لیژنەی لێکۆڵینەوە و ڕاوێژکاریی ئەنجوومەنی نوێنەران، کە چاودێریی ترسی سووری* دەکرد، کە ئەو کاتە دزەی دەکردە نێو هەموو کایەکانی دەوڵەتەوە، وەک دەزگای بەرگریی نیشتمانی و خوێندنی باڵا و بگرە هەموو کێڵگەکانی تووتنیش. دەبێت ئەوەشتان وەبیر بێنمەوە، کە ئەمەی باسم کرد، لە سەردەمی جەنگی ساردی نێوان یەکێتیی سۆڤیەت و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بوو، گرژی و ئاڵۆزییەکان ڕوویان لە زیادبوون دەکرد، ئێمەی خەڵکی کارۆلینای باکووریش پێویستمان بە شتێک بوو، ئەم ئاڵۆزییە نەهێڵێت. باوکیشم بێوچان لەدوای ڕاستییەک دەگەڕا؛ ڕاستییەک، کە خەڵکی وەک هێگبێرت بەلایانەوە گرنگ نەبوو.

---

* ترسی سوور، یان کاریگەریی سوور؛ Red Influence: لە سەردەمی جەنگی ساردی نێوان یەکێتیی سۆڤیەت و ویلایەتە یەکگرتووەکاندا سەری هەڵدا، کە ڕەنگی سوور ئاماژە بوو بۆ لایەنگرانی یەکێتیی سۆڤیەت، بە هۆی ئەوەی ڕەنگی ئاڵاکەیان سوور بوو، کاریگەرییەکی زۆری خستە نێو کۆمەڵگەی ئەو کاتەی ویلایەتە یەکگرتووەکانەوە و بیروباوەڕی کۆمۆنیستییان بڵاو دەکردەوە.

دوای ئەوە، کە باوکم لە کڵێسا هاتەوە، دەیگوت، "قەشە هێگبێرت سولیڤن ئەمڕۆ جۆرێکی تر بوو. هیوادارم ئەو بەشەی تەوراتی پیرۆزت بیستبێت، کە مەسیحی نەمر باسی هەژاران دەکات..."

"بەڵێ، بێگومان باوکە..."

باوکم، هەرکاتێک پێویست بووایە، هەوڵی دەدا گرژی و ئاڵۆزییەکان هێور بکاتەوە. پێم وایە هەر لەبەر ئەوەشە، کە سەردەمانێکی زۆر لە ئەنجوومەنی نوێنەراندا مایەوە. گەر ناشرینترین و سەرزلترین منداڵی ئەم دنیایەی بدیتبایە، ماچی دەکرد و دەیگوت، "ماشەڵڵا چەند منداڵێکی جوانە." یان گەر منداڵێکی کچ هەموو ڕوخساریشی پەڵە و نیشانەی زگماکی بووایە، هەر دەیگوت، "جوانترین کچی دونیایە." جارێکیان ڕێکەوتی خانمێکمان کرد، منداڵێکی پێ بوو لە عەرەبانەیەکدا پاڵی دەنا، باوکم تەماشایەکی کرد و پێی وت، "ڕەنگە تۆ زیرەکترین منداڵی پۆلەکەی خۆت بیت." هەر واش بوو! بەڵێ. باوکم لەو جۆرە پیاهەڵدانانەدا کارامە بوو. کابرایەکی خراپیش نەبوو، گەر تەماشا بکەیت، بە تەمەنی تێی هەڵنەداوم.

بەڵام زۆر لەلامان نەدەمایەوە، هەتا گەورەش بووم، زۆر نەمدەبینی. حەزیش ناکەم ئەم قسەیە بکەم، چونکە ئێستا هەندێک خەڵک فێر بوون ئەوها باسی دایک و باوکیان دەکەن، بگرە گەر خراپیش نەبن لەگەڵیاندا، بەڵام ئیتر گەنجی ئێستا بەهانە بۆ هەموو شتێک دەهێننەوە. من بۆ ئەوە باسی ناکەم بەهانە بۆ خۆم بێنمەوە، بەڵام ئەمە ڕاستییە. باوکم لە ساڵێکدا، نۆ مانگی لە ماڵ نەدەکەوتەوە، لە باڵەخانەیەکدا دەژیا لە واشنتۆن دی سی، کە سێ سەد میل ڕێ لە ئێمەوە

دوور بوو. دایکم لەگەڵی نەدەچوو، چونکە هەردوو لایان ئامانجیان ئەوە بوو، من بەباشی گەورە ببم، وەک خۆیان چۆن گەورە بوون، ئەوها.

وەک باسی دەکەن، باپیرم زۆر جاران باوکمی لەگەڵ خۆیدا بردووە بۆ ڕاوکردن، فێری یاریی کردووە، لە هەموو یادێکی لەدایکبوونیشیدا، بە دەست و دیارییەوە هاتووە بۆ لای، ئیتر هەموو ئەو شتانەی پێش هەرزەکاری، باوک بۆ منداڵەکەی دەکات. بەڵام شانسی منی داماو، بە پێچەوانەوە، هەر نەمدەبینی لەماڵ بکەوێتەوە. لە پێنج ساڵی سەرەتای تەمەنمدا، وام دەزانی هەموو باوکێکی تریش لە شوێنێکی دوورتر دەژی، هەتاکو ڕۆژێکیان لە باخچەی ساوایان بووم، هاوڕێیەکی خۆشەویستم هەبوو بە ناوی ئێریک هەنتەر، لێی پرسیم، "ئەو پیاوە کێ بوو کە دوێنێ شەو هات بۆ ماڵتان؟" ئەوجا هەستم بە شتێک کرد.

منیش بە شانازییەکەوە وتم، "باوکم بوو."

ئێریکیش دەستی کردبوو بەناو کیسی خواردنەکەمدا، بەدەم گەڕانەوە وتی، "بەڕاست؟ وەڵا نەمزانیبوو باوکت ماوە."

دەتگوت یەک کەرتەخشتیان داوە بە تەپڵی سەرمدا، مەگەر خوا بۆخۆی بزانێت چیم بەسەر هات.

ئیدی ئەوە بوو، بە دەستی دایکم گەورە بووم. ئێستا دایکم ژنێکی خانومان و شیرینە، یەکێکە لەو دایکانەی خەڵکی ئاواتی بۆ دەخوازن. بەڵام ئەوەشی هەبوو، هەرگیز جارێک لە جاران نەیدەتوانی توند بێت لەگەڵمدا و دەسەڵاتی بەسەرمدا نەدەشکا، لەولاشەوە باوکم ئەوها بەجێی دەهێشتین، ئیتر

ئەمـەش وای کـرد لـە تەمەنێکـی منداڵیـدا کەسـێکی بێگـوێ و هاروهاجـم لـێ دەر بچێـت. ئێجـگار زۆر خراپیـش نـا، غایلـەی خـراپ نەخەنـە بیروهۆشـتانەوە. مـن و هاوڕێکانـم درەنگانێـک بەدزییـەوە دزیـەوە دەر دەپەڕینـە دەرەوە و جامـی ئۆتومبێلـی گەڕەکمـان کەفـاوی دەکـرد، یاخـود دەچووینـە پشـت کڵێسـاکەوە، چەرەسـمان دەخـوارد. لەوسـاڵانەدا دایـک و باوکـی تـر سـەری بێزارییـان ڕادەوەشـاند و بـە منداڵەکانـی خۆیـان دەگـوت، "تـۆ ئاقـڵ بـە، وەک ئـەو لاندنـە بێحەیایـە مەبـە. ڕۆژێـک دێـت خـۆی بـە گرتـن دەدات بـە دەسـتی پۆلیـس."

مـن کوڕێکـی خراپـم. تەنیـا لەبـەر ئـەوەی چەرەسـم دەخـوارد. گـەر لەبـەر ئـەوە بـێ، چـش تـوو خـوا، بـا هـەر خـراپ بـم، بـە جەهەننـەم.

بـە هەرحـاڵ، باوکـم و هێگبێـرت نێوانیـان بـاش نەبـوو، ئـەوە نەبـێ تەنیـا لەبـەر هـۆکاری سیاسـەت بێـت. نـا، بەڵکـوو دیـار بـوو ئـەم دووانـە زۆر لەمێـژ یەکدییـان دەناسـی. هێگبێـرت نزیکـەی بیسـت سـاڵ لـە باوکـم بەتەمەنتـر بـوو، پێـش ئـەوەی ببێتـە قەشـەی کڵێسـا، لەگـەڵ باپیرمـدا کاری دەکـرد. باپیریشـم – هەرچەنـد زۆربـەی کاتەکانـی ژیانـی لەگـەڵ باوکمـدا وەک هـاوڕێ بەسـەر بردبـوو – بـەڵام بەڕاسـتی کەسـێکی چاوچنـۆک و پارەپیـس بـووە. توانیـی ماڵباتـی خـۆی ببوژێنێتـەوە و دەوڵەمەندیـان بـکات، لـێ وەک پیاوێکـی کاسـب و ئیشـکەر نەیهێننـە بـەر زەینـی خۆتـان، هەڵـەی وا نەکـەن وا بزانـن بـە کەسـابەت و ئارەقـەی ناوچەوانـی خـۆی پەیـدای کردبێـت و وردەوردە دەوڵەمەنـد بووبێـت. نەوەڵـڵا، خـوا هەڵناگـرێ ئـەو ڕێگەیـەی ئـەو پـارەی پـێ پەیـدا دەکـرد، گەلێـک سـانا بـوو –

سەرەتا وەک قاچاخچیی دەرمان و ماددەی قەدەغەکراو دەستی پێ کرد، لە کوباوە ماددەی هۆشبەری بەقاچاخ دەهێنا و ساغی دەکردەوە، بەو شێوەیە پارەی چنگ دەکەوت. دواتر هات زەویی کڕییەوە و جوتیاری دەهێنا لە زەوییەکانیدا کاری بۆ بکەن و جووتیارەکانیش لەبەرامبەردا بەشێک لە بەرهەمەکانیان دەدا بە باپیرم. لەو بڕە پارەیەی جووتیارەکان دەستیان دەکەوت، لە سەدا نەوەدی بۆ باپیرم بوو، لە هەقی ئەوەی لە زەوییەکەی ئەودا بەرهەمیان چاندبوو. پاشان هەرکاتێک جووتیارەکان پێویستییان بووایە، قەرزی پێ دەدان و بە قازانج و سوویەکی زۆرەوە لە قوڕگیانی دەر دەهێنایەوە. لە ڕاستییشدا کە قەرزی دەدانێ، مەبەستی ئەوە نەبوو پارەکانیان لێ بستێنێتەوە، بەڵکوو دەستی بەسەر ماڵ و موڵکی جووتیارەکاندا دەگرت لەبەرامبەر قەرزەکانیاندا. هەرچییەکیان هەبووایە، لێی داگیر دەکردن. دواجار بانقێکی کردەوە بە ناوی بانقی قەرز و وەبەرهێنانی کارتەر. لەو کاتەدا تەنیا بانقێکی تر هەبوو لە سنووری هەردوو هەرێمەکەدا، ئەویش بە هۆکارێکی نادیار داڕمابوو، بە هۆی قەیرانی ئابووریی ئەو سەردەمەشەوە، نەتوانرابوو جارێکی تر بکرێتەوە. هەرچەند هەموو خەڵک ڕاستیی ڕووداوەکەیان دەزانی، بەڵام لە ترسی سزادان، کەسێک زاتی نەدەکرد هیچ بدرکێنێت. ئەو بانقەش تەنیا بینا نەبوو، کە بەو دەردەیان بردبێت و کەسیش هیچ نەڵێت.

باپیرم ئەو قازانج و سووەی وەری دەگرت، گەلێک زۆر بوو، وردەوردەش دەستی کرد بە داگیرکردنی ئەو زەوی و موڵکانەی خەڵک، کە نەیاندەتوانی قەرزەکانیان

بدەنـەوە. کاتێکیـش قەیرانـی ئابـووری خراپتـر بـوو، دەسـتی گـرت بەسـەر چەندیـن کار و پیشـەی خەڵکدا و لـە هەمـان کاتیشـدا خاوەنکارەکانیشـی لـە شـوێنەکانیان دەهێشـتەوە، تـا بە مووچەیەکی کـەم بـەردەوام ببن لـە کارەکانیـان، ئەوەندەی دەدانـێ، تـا بـە کولەمەرگـی پێـی بژیـن. ئـەو داماوانـەش چـی بکەن، شـوێنێکی تریـان شک نەدەبرد ڕووی لێ بکەن. پێیانی دەگـوت، کاتێـک ئابووریـی وڵات بـەرز بـووەوە، ئـەو کاتـە کاروپیشـەکانی خۆیـان پێ دەفرۆشێتەوە، خەڵکیش بە داماوی و سـاویلکەییی خۆیـان بڕوایـان پـێ دەکـرد.

کەچـی بـۆ جارێکیـش بەڵێنـی خـۆی نەبـردە سـەر. دواجـار توانیی دەسـت بەسـەر بەشـێکی زۆری ئابووریی وڵاتدا بگرێت. ئـەو سـەروەتەی هەشـیبوو، دوو پیاوەتیی پێوە نەدەکرد.

ئێسـتا حـەزم دەکـرد پێتـان بڵێـم ئـەم باپیـرە چاوچنۆکـەم تووشـی مردنێکی کتوپڕی غەزەبـاوی بـوو، بـەڵام بڵێیـن چـی، ئـەوەی خـوا نەیـکا، نابێـت. لـە تەمەنێکـی زۆر پیـردا، کاتێـک لەنـاو بەلەمەکەیدا بوو لـە دوورگەکانی کایمـان، قەحبەیەکیشـی لە باوەشـدا بـوو، لـە شـیرینیی خـەودا گیانی دەر چـوو. سـەری هـەردوو ژن و تاقـە کوڕەکەشـی خـوارد، لەوان زیاتر ژیا. ئـەو جـۆرە مردنـە بـۆ کابرایەکی ئەوهـا نامـەرد؟ وەڵایی جاری وایـە پیـاو کـە شـتی وا دەبینێت، ئـەم ژیانـەی لـە بەرچـاو دەکەوێت. ژیـان هیـچ یەکسـانیی تێدا نییـە، دەبـوو لـە خوێندنگەکانیـش ئەمـە فێری خوێندکاران بکرێت.

بـا بگەڕێینـەوە سـەر حیکایەتەکـەی خۆمـان... کاتێـک هێگبێـرت ئیـدی شـارەزای باپیـرم بـوو و بـۆی دەر کـەوت چ پیاوێکـە، وازی لـە کارەکـەی هێنـا و ڕووی کـردە ئەوقـاف،

دواتریش گەڕایەوە بۆ بیوفۆرت و بوو بە قەشەی ئەو کڵێسایەی ئێمە بۆی دەچووین. لە چەند ساڵی سەرەتای دەستبەکاربوونیدا، هەموو مانگێک وتارەکانی لەسەر پیاوی خراپ و چاوچنۆک دەخوێندەوە، ئەمەش هیچ کاتی بۆ شتێکی دیکە نەهێشتبووەوە. تەمەنی گەیشتە چلوسێ ساڵ، ئەوجا ژیانی هاوسەریی پێک هێنا. لە تەمەنی پەنجاوپێنج ساڵیدا، یەکەمین کچی بوو بە ناوی جەیمی هێگبێرت سولیڤەن. ژنی ئەم کابرایە بەدەنێکی بچووک و نزیکەی بیست ساڵیش لەو منداڵتر بوو، پێش ئەوەی خوا جەیمییان بداتێ، شەش منداڵی تری لەبار چووبوو. ئەوجا لە کاتی لەدایکبوونی ئەم کچەیاندا، ئەویش گیانی سپارد. هێگبێرت بێوەپیاو مایەوە و دەبوو بە دەستی خۆی کچە تاقانەکەی گەورە بکات.

لێرەوە چیرۆکەکەمان لەگەڵ شانۆگەرییەکەی هێگبێرت یەک دەگرێت و تێکەڵ بەیەک دەبن.

پێش ئەوەی بۆ یەکەمین جاریش شانۆگەرییەکە نمایش بکرێت، خەڵکی چیرۆکەکەیان دەزانی. یەکێک بوو لەو چیرۆکانەی هەر زوو لە دەمی خەڵکییەوە دەگوازرێنەوە و بڵاو دەبێتەوە، بەتایبەت ئەو کاتانەی هێگبێرت دەچوو بۆ پیرۆزکردنی منداڵێکی ساوای تازەلەدایکبوو، یاخود کە دەچوو بۆ گۆڕستان بۆ مەراسیمی بەخاکسپاردنی مردوویەک. کەس نەبوو چیرۆکەکەیانی نەبیستبێ، وا بزانم هەر لەبەر ئەوەش بوو کاتێک شانۆگەریی کریسمسیان دەبینی، هەست و خرۆشانێکی زۆر دەزایە نێو دڵ و دەروونیان. خەڵکی دەیانزانی ئەم چیرۆکە هەڵقوڵاوی ژیانێکی ڕاستەقینەیە، بۆیە مانایەکی تایبەتیی پێ دەبەخشی.

جەیمی سولیڤەن، ئەویش بە هەمان شێوەی من، دواقۆناغی بوو لە خوێندنگەی ئامادەیی، هەر زووش هەڵیان بژاردبوو، تا لە شانۆگەرییەکەدا ڕۆڵی فریشتەکە بگێڕێت، جگە لەو، هیچ کەسی تر ئەو دەرفەتەی بۆ نەڕەخسا. ئەمەش وای کرد ئەو ساڵە شانۆگەرییەکە گەلێک تایبەتتر بێت. گەورەترین نمایش دەر دەچوو - گەر واش نەبێت، خاتوو گاربەر بەلایەوە گەلێک پەسەند بوو. ئەم خاتوونە مامۆستای بەشی دراما بوو، هەر یەکەم جار لە پۆلدا بینیم خانمێکی تا بڵێی ڕووخۆش و لەبلەبان بوو، دایمەی خوا، بۆ هەر کارێک، دەستخۆشییەکی لەسەر زار بوو.

جا منیش ئەو ساڵە هیچ نیازێکی پێشوەختم نەبوو بچمە بەشی دراما. لێ یا ئەوە بوو، یا بەشی زانستی کیمیا. دواتر، ڕاستییەکەی، بیرم لێ کردەوە گەر بچمە بەشی دراما، لەچاو بەشی کیمیا سووک و ئاسانتر دێت بە دەستەوە. بەس نییە کتێب و دەفتەر لە خۆم کۆ ناکەمەوە و تاقیکردنەوەی تیا نییە، لە هەمووشی خۆشتر، ناچم خشتەی پرۆتۆن و نیترۆن و هێمای کیمیاییەکانیان لەبەر بکەم، یان هاوکێشەی کیمیایی شیکار بکەم و لە تاقیگەدا ڕەگەزەکان تێکەڵ بکەم... تاقەتی ئەم سەرئێشەیەم نەبوو. ئەی باشە چارم چی بوو؟ بێگومان ڕوون و ئاشکرایە، دراما حەیاتەکەم هەڵبژارد، لە ڕاستیدا کاتێک بیرم لێ کردەوە، من شەوان درەنگ بچمە دەرەوە بۆ چەرەسخواردن لەپشت کەنیسەکەوە، ئیدی ئەمە شتێکی گەلێک باش دەبێت، چونکە لەنێوان زۆربەی وانەکاندا، دەتوانم سەرخەوێکی باش بشکێنم و شەوانیش زوو خەوم لێ ناکەوێ، بۆیە ڕاست ناوی خۆم لەو بەشەدا نووسی.

لە یەکەم ڕۆژی دەستپێکردنی وانەکاندا، من دواکەس بووم گەیشتمە پۆل، تەنیا چەند ساتێکی کەمی مابوو زەنگی دەرەوە لێبدات، چووم لەسەر کورسییەکەی پشتی پشتەوە دانیشتم. مامۆستا گاربەر پشتی لە ئێمە بوو، خەریک بوو ناوی خۆی لەسەر بۆردەکە بە پیتی گەورە دەنووسی، وەک بڵێی نەیناسین. هەموو کەس دەیناسی، کەس نەبوو ناوی نەبیستبێت. ژنێکی کەتە و باڵابەرز، قژی سوور و پێستیشی گەنمڕەنگ، ڕوخسارە کونجکونجاوییەکەشی وای دەر دەخست، تەمەنی لە چلەکاندا بێت. لەگەڵ ئەوەشدا کەتە و قەڵەو، درۆم نەکردبێت، کێشی دوو سەد و پەنجا کیلۆ دەبوو. هەمیشەش چاویلەکەیەکی گەورەی ڕەشی لەچاودەکرد، کە سڵاویشی لەیەکێک دەکرد بەم جۆرە دەیکرد "مەرحەبااااااا." کۆتاییی پیتەکەی بە ئاوازێکی دوورودرێژ دەر دەبڕی. لەگەڵ ئەوەشدا، خوا هەڵناگرێ خانمێکی گەلێک باش و دڵساف بوو، عەیبەکەی بەس ئەوە بوو، هێشتا شووی نەکردبوو. هەرکەسێک چاوی پێ کەوتبا، ئیدی خوای ئەکرد تامەنی باپیریشی هەبووایە، بەزەییی پێدا دەهاتەوە.

لەسەر بۆردەکە کە ناوی خۆی نووسی، لەژێریشەوە ئاماژەی بەو ئامانجانەی کرد، کە مەبەستی بوون لە ماوەی ئەو ساڵەدا بەدەستیان بێنێت. یەکەم ئامانجی "بڕوابەخۆبوون،" دووەمیان، "خۆناسین،" سێیەمیشیان، "لەخۆڕازیبوون." خاتوو گاربەر گەلێک گرنگیی بەو سێ ئامانجەی دەدا، کە ئەمەش بەڕاستی وای لێ کردبوو زیاتر لە کارەکەیدا بەرەوپێش بچێت، ڕەنگە بۆخۆشی لەو کاتەدا هەستی بەوە نەکردبێت. لەو مەیدانەدا داهێنەر بوو.

دەی با لە چیرۆکەکەی خۆمان لا نەدەین.

هەستم بە هیچ نەکردبوو، هەتا ئەو ڕۆژەی وانەکانمان دەستی پێ کرد، ئەوجا درکم بە شتێکی سەیر کرد. هەرچەند خوێندنگەی ئامادەییی بیوفۆرت گەلێک گەورە نەبوو، لێ دڵنیا بووم ژمارەی کچان و کوڕان هاوتای یەک بوون، جا شتە سەیرەکە ئەوە بوو کە تەماشام کرد ئەم بەشەی ئێستا تیای دەخوێنم لانی کەم لە سەدا نەوەدی کچ بوو، واقم وڕ ما. لە پۆلەکەی مندا تەنیا کوڕێکی تری تیا بوو، هەموو ئەوانی تر کچ بوون، منیش لە خوام دەویست هەمووی کچ بێت، کێ خوا دەیداتێ لەناو ئەو هەموو کچەدا بێت؛ ئەملا کچ، ئەولا کچ، تاقیکردنەوەی چی و شتی چی.

ئاخیری خێر بێ، من تەنیا خوێندکارێک نەبووم، هەر زەینم لای داهاتووی بێت.

ئیدی ئەوە بوو، خاتوو گاربەر شانۆگەرییەکەی کریسمسی ئامادە کرد و بە هەمووانی ڕاگەیاند، کە جەیمی سولیڤەن ئەمساڵ ڕۆڵی فریشتەکە دەگێڕێت. خاتوو گاربەر ڕاست دەستی کرد بە چەپڵەلێدان - ئەویش یەکێک بوو لە ئەندامانی کڵێسا - زۆر کەسیش باسیان دەکرد، دەیانگوت ئەم خاتوونە بەدوای دەرفەتێکدا دەگەڕێت، بە شێوازێکی دڵدارییانە خۆی لە هێگبێرت نزیک بکاتەوە و خۆی ساغ بکاتەوە بەسەریا. سەرەتا کە ئەمەم بیست، بەلامەوە شتێکی گونجاو بوو گەر بەیەک بگەن و هەردووکیشیان تەمەنیان هەیە. بیهێنە بەر زەینی خۆت - پێستت وەک پەڕەی سیغار تەنک بێت و دەموچاویشت کونجکونجاوی! دەبێت بە پەن. هەرکەس بیری لەمە بکردایەتەوە، سەری دەسووڕما، بەڵام

کەس، جارێکی لە جاران، هیچیان لەم بارەیەوە نەگوت. قسەوقسەلۆک شتێکە و بوختان شتێکی ترە، تەنانەت ئێمە لە خوێندنگەش ئاوها بە قسەوە خۆمان سەرقاڵ نەدەکرد.

بۆ چەند ساتێک تەنیا خاتوو گاربەر چەپڵەی لێدەدا، تاکوو دواجار ئێمەش دەستمان هەڵهێنا و کەوتینە چەپڵەلێدان، چونکە بۆخۆیشی ئەوەی دەویست. ڕووی کردە جەیمی و وتی، "جەیمی، هەستە، وەرە ئێرە." ئەویش هەستا و چووە لای بۆردەکە و ئەوجا ڕووی کردە هەمووان. خاتوو گاربەر ئەم جارە خێراتر دەستی کردەوە بە چەپڵەلێدان، وەک بڵێی چەپڵە بۆ ئەستێرەیەکی سینەمایی ڕاستەقینەی جیهانی لێبدات.

ئەو دەمە جەیمی سولیڤەن کچێکی تا بڵێی باش بوو. شارۆچکەی بیوفۆرت، بە هۆی بچووکییەکەیەوە، تەنیا یەک قوتابخانەی ناوەندیی تێدا بوو، لەبەر ئەوە، لە هەموو قۆناغەکاندا هەمیشە هەردووکمان هەر لە یەک پۆلدا بووین، گەر بڵێم قەت قسەم لەگەڵدا نەکردبوو، خوا ڕووم ڕەش دەکات. جارێکیان لە پۆلی دووەمی ناوەندی بووین، تا کۆتایی ئەو ساڵە لەسەر کورسییەکەی تەک منەوە دادەنیشت، جارجارەش پێکەوە قسەمان دەکرد، بەڵام زۆر نا، نەدەگەیشتە ئەوەی لە کاتی بەتاڵیما لەگەڵی بچمە دەرەوە، بگرە دواتریش نێوانمان بەو جۆرەی لێ نەهات. ئەو جەیمییەی لە قوتابخانە دەمبینی، کەسێک بوو کە لەدوای قوتابخانەش دەمبینی، کەسێکی گەلێک جیاوازتر بوو، هیچکات ئەم کچەم لە بیروهۆشدا نەبوو.

لەبەر ئەوە نییە بڵێم جەیمی کچێکی نابووت بێت –

خوانەکردە بەهەڵە لێم تێنەگەن. چ عەیب لەو کچەدا نەبوو. شانسی خۆی، چووبووەوە سەر دایکی، بەپێی ئەو وێنانەی بینیبووم، دایکی خراپ نەبوو، ئیتر دەڵێی چی، تووشی ببوو بە تووشی ئەو کابرایەوە. بەڵام لە زەینی مندا، جەیمی ئەو شۆخوشەنگە نەبوو. ڕاستە کچێکی قەدباریکی قژزەرد و چاوشین بوو، کەچی زۆربەی کاتەکان سادە و ساکار دەر دەکەوت. هەمیشەش هەر بەو جۆرە دەتبینی. ئەم کچە زۆر گرنگیی بە ڕوخساری دەرەوەی نەدەدا، چونکە هەردەم بەدوای شتێکدا دەگەڕا، وەک جوانیی ناخ، بۆیە وای بۆ دەچووم، ئەمە یەکێک بووبێت لەو هۆکارانەی ئاوها بەسادەوساکاری دەر دەکەوت و دەستێکی بە خۆیدا نەدەهێنا. لەو کاتەوەی من ئەم کچەم دەناسی - بیرتان نەچێ، زۆر لەمێژ بوو دەمناسی - قژی لەدواوە تۆپەڵ دەکرد و دەیبەست، وەک کەسێک ئومێدی بە ژیانی نەمابێت، یەک تۆز چییە میکیاجی نەدەکرد. دایمەی خوا چاکەتێکی خووری و تەنوورەیەکی نەخش خەتخەت و چوارگۆشەییی لەبەر دەکرد، دەتگوت دەچێت بۆ چاوپێکەوتن، تا کارێک بدۆزێتەوە. ئێمە وامان دەزانی، تەنیا ماوەیەکە و دواتر جۆری جلوبەرگ و شێوەی خۆگۆڕینەکەی دەگۆڕێت، لێ هەر لەسەر ئەو شێوازە مایەوە و نەیگۆڕی. تەنانەت لە سێساڵی قۆناغی ئامادەییشدا، هەر ئەو جۆرە جلوبەرگەی دەپۆشی. تەنیا شت کە گۆڕانکاریی بەسەردا دەهات، قەبارەی جلەکانی بوو، لەگەڵ گەورەبوونیدا، دەیگۆڕین.

با ئەوەش بڵێم، تەنیا جۆری جلوبەرگ و شێوازی خۆگۆڕینەکەی نەبوو، کە جەیمیی لە هەمووان جیا

دەکردەوە، بەڵکوو جۆری هەڵسوکەوتەکانیشی وایان لێ دەکرد، جیاوازتر لە کەسانی تر دەر بکەوێت. جەیمی وەک کچەکانی تر نەدەچوو بۆ ئاهەنگە شەوانەییەکان، یان خوانێکی ئێوارەی بەکۆمەڵ، من ئەو ڕاستییەشم دەزانی، بە تەمەنی هاوڕێی کوڕی نەبوو. جا خۆ گەر هاوڕێی کوڕی هەبووایە، هێگبێرتی باوکی دەمێک بوو جەڵدەی دڵ لێی دابوو. جا وا باوکیشی ڕێگەی دا هاوڕێیەتیی کوڕ بکات، هێشتا سوودی نەبوو، چونکە جەیمی بۆ هەرشوێنێک بچووایە، کتێبێکی ئینجیلی بە دەستەوە دەگرت، جا بۆیە گەر کوڕەکان لە ترسی هێگبێرتیش هاوڕێیەتییان نەکردایە، خۆ کتێبی ئینجیلەکە دووری دەخستنەوە. من بۆخۆم هەر وەک کوڕێکی هەرزەکاری ئەو سەردەمە، ئەو کتێبەم بە پیرۆز دەزانی و خۆشم دەویست، لێ جەیمی بە جۆرێک هۆگری ببوو، سەیرم لێ دەهات. تەنیا بەوەوە نەدەوەستا، هەمووساڵێک مانگی ئاب بچێت بۆ خولی فێربوونی ئینجیل، بەڵکوو لە قوتابخانەش لە کاتی پشووی نانی نیوەڕۆدا، هەمیشە دەیخوێندەوە. با کچی قەشەی کڵێساش بێت، لە زەینی مندا شتێکی ئاسایی نەبوو.

جەیمی هەر بەوەوە نەوەستا. بە هۆی ئەوەی هەردەم کتێبە پیرۆزەکەی دەخوێندەوە، یان ڕەنگە بە هۆی کاریگەریی باوکی لەسەری، بڕوای وا بوو کارێکی خێرە یارمەتیی خەڵکی تر بدرێت، لە ڕاستییشدا هەر ئەمە ئیشی بوو، بەردەوام دەستی یارمەتیی بۆ خەڵک درێژ دەکرد. دەمزانی ئەم کچە لە هەتیوخانەی شاری مۆرهێد وەک خۆبەخش هاوکاریی منداڵانی هەتیوی دەکرد، بەڵام ئەمە

بۆ ئەو بەس نەبوو. هەمیشەش یەکێک بوو لە ئەندامانی ڕێکخراوە خێرخوازییەکان، ئەوانەی پارە بۆ منداڵانی هەتیو و خەڵکی کەمدەرامەت کۆ دەکەنەوە. ساڵێکیان، ئەو دەمە تەمەنی چواردە ساڵان بوو، دراوسێیەکی پیریان هەبوو، نیوەی پشووی هاوینەکەی خۆی تەرخان کرد بۆ بۆیاخکردنی رووکاری دەرەوەی خانووی ئەو دراوسێیە. جەیمی کەسێک بوو، بێ ئەوەی داوای لێ بکرێت، وردەکاغەز و گەڵاوگوڵی لە باخچەی خەڵکدا کۆ دەکردەوە یاخود لە شەقامەکاندا ئۆتومبێلەکانی دەوەستاند و دەستی منداڵانی دەگرت و لە پەڕینەوە یارمەتیی دەدان. ئەو پارەیەی لە ماڵەوە وەری دەگرت، کۆی دەکردەوە و تۆپی باسکەی پێ دەکڕی بۆ منداڵە هەتیوەکان، یان جاری وا هەبوو، ڕۆژانی یەکشەممە دەچوو پارەی دەخستە نێو سندوقی خێرخوازیی کڵێساکەوە. بەکورتی، کچێک بوو، ئێمە لەچاو ئەودا هەر هیچ نەبووین، فریشتەیەک بوو بۆخۆی، هەرکاتێکیش لە ڕێگە یان شوێنێک ڕێکەوتم بکردایە، هەستم بە تاوانباری دەکرد، گەر هیچ شتێکی خراپیشم نەکردبێت.

وەنەبێ دەستی یارمەتیی تەنیا بۆ خەڵک درێژ کردبێت. گەر لە هەرشوێنێک چاوی بە ئاژەڵێکی بریندار بکەوتایە، ڕاست بە هانایەوە دەچوو. گرنگ نەبوو، پشیلە، سەگ، سمۆرە، بۆق... هەرچییەک بووایە. دکتۆر ڕۆلینگس، کە دکتۆری ئاژەڵان بوو، جەیمیی دەناسی، هەرکاتێک لە دەرگاکەوە دەیبینی، بە خۆی و ئاژەڵێکی نەخۆشەوە بەرەو لای دێت، سەری سەرسوورمانی با دەدا. دکتۆر بەدەم دانانی چاویلەکەکەیەوە و سڕینەوەی بە دەستەسڕێک، گوێی

بۆ جەیمی شل دەکرد، کە چۆن ئەم ئاژەڵەی دۆزیەوەتەوە و چیی بەسەر هاتووە. "دکتۆر، کەوتووتە ژێر ئۆتومبێلەوە، ئیتر قەدەری خوا بوو، من دۆزیمەوە و فریای کەوتم. تۆش یارمەتیم دەدەیت، وانییە؟"

بە بڕوای جەیمی، هەموو شتێک قەدەری خواییە. ئەمە شتێکی ترە. هەرکاتێک قسەت لەگەڵدا بکردایە، لەنێو وشەکانیدا قەدەری خوایی تێ دەکرد، ئیتر بابەتەکە هەرچییەک بووایە. گەر یارییەک بە هۆی بارانەوە دوا بخرایە، قەدەری خوایی بوو، تا شتێکی خراپ ڕوو نەدات، یان کە تاقیکردنەوەیەکی کتوپڕ بکراینایە و کەس تیای دەر نەچووایە، هەر قەدەری خوایی بوو، تا زیاتر خۆمان ماندوو بکەین. ئیدی بۆخۆتان تێدەگەن.

لە لایەکی تریشەوە، بارودۆخی هێگبێرت بۆ جەیمی گەلێک گران بوو. کچی قەشەیەکی کڵێسا بیت، بۆ تۆ ئاسان نییە، بەڵام جەیمی وای دەر دەخست وەک بڵێی شتێکی گەلێک سروشتییە و خوای گەورە خۆشی ویستووە، بۆیە ئەم جۆرە ژیانەی پێ بەخشیوە. هەموو جارێک ئەم قسەیەی دەکرد، "خوای گەورە منی خۆش ویستووە، بۆیە باوکێکی ئەوهای پێ بەخشیوم." هەرکاتێک وای دەگوت، ئێمەش تەنیا سەرمان با دەدا و لە دڵی خۆماندا دەمانگوت، باشە ئەم کچە لە چ عەیام و زەمانێکەوە هاتووە.

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، ئەوەی منی شێت دەکرد، ئەوە بوو هەمیشە ئەم کچە بە ڕوویەکی خۆش و دەروونبەجۆش دەر دەکەوت، گوێی بە هیچ نەدەدا. بڕوا ناکەم ئەو کچە لە ژیانیدا قسەیەکی ناخۆشی بە کەس گوتبێ، یان کەسی

لـه خـۆی زویـر کردبێت، تەنانـەت بەرامبـەر ئێمـەش، کـه ئـەو هەمـوو تانەوتەشـەرەمان لـێ دەدا. کـه بـه شەقامەکەشـدا رێـی دەکـرد، لەژێـر لێـوەوە، بـێ ئـەوەی کـەس گوێـی لـێ بێـت، گۆرانیی دەگـوت، رێکەوتـی هەرکەسێکیشـی بکردایـە، سـڵاوێکی لـێ دەکـرد. هەندێـک جـار ژنانـی گـەڕەک کـه دەیانبینـی بـەلای ماڵەکانیانـدا رەت دەبـوو، دەهاتنـه دەرێ و ئـەو رۆژه چیيـان لێنابێـت، هەندێکیـان پێشـکەش دەکـرد لێـی بخـوات، یاخـود گـەر ئـەو رۆژه گەرمـا بووایـە، شـەربەتی لیمۆیـان بـۆ دەهێنـا. دیـار بـوو هەمـووان خۆشـیان دەویسـت. لـه هـەر کـۆڕ و کۆبوونەوەیەکـدا نـاوی جەیمـی بهاتایـە، دەیانگـوت، "بەڕاسـتی کچێکـی دڵسـاف و رۆحسـووکه. گـەر ئـەم دونیایـه دووانـی وەک ئـەوی تێـدا بووایـە، ژیـان گەلێـک باشـتر دەچـوو بەرێـوە."

کەچـی مـن و هاورێکانـم بـه شـێوەی خەڵکـی تـر تەماشـامان نەدەکـرد. لـه زەینـی ئێمـەدا، جەیمـی سـولیڤەن کەسـێکی زیـادە بـوو.

له یەکەم رۆژی دەستپێکردنمان له بەشی دراما، که جەیمی له بەردەممانـدا وەسـتابوو، ئـەم خەیاڵانـه بـه زەینمـدا گوزەریـان دەکـرد. راسـتییەکەی، هـەر نەشـمدەویست چـارەی ببینـم. بـەڵام کاتێـک جەیمـی رووی کـردە هەمـووان، گەلێـک سـەیر بـوو، تووشـی شـۆک بـووم، وەک بڵێـی لـه سـەربان بـەر ببمـەوە یـان لەسـەر وایەرێکـی باریکـی شـل لەقەلـەق بکـەم. تەنوورەیەکـی خەتخەتـی لـەوەی باسـم کـرد لەبـەردا بـوو، لەگـەڵ بلووزێکـی سـپی لەژێـر چاکەتـه خووریـە قاوەییيەکـەی، کـه ملیۆنێـک جـار بینیبـووم لەبەریـدا. بـه تەمەنـی میکیاجـی نەکردبـوو، ئـەو رۆژەش نەیکردبـوو، بـەڵام رەنگـی پێسـتی قاوەیـی داگەڕابـوو،

ڕەنگە بە هۆی هاتوچۆی خولی فێربوونی ئینجلەکەوە، هەتاو پێستی سووتاندبێت. بۆ یەکەمین جار وەک کچێکی جوان هاتە بەر زەینم. بێگومان منیش ڕاست لە بیروهۆشی خۆم دەر کرد، لێ کە چاوێکی بە پۆلەکەدا گێڕا، ڕاست چاوی خستە سەر من و بزەیەکی هاتێ، دیار بوو پێی خۆش بوو منیش لە پۆلەکەیدا بووم. هەتاکوو چەند مانگێکی تر، ئەوجا زانیم بۆچی ئەو زەردەخەنەیەی بە ڕوومدا کرد.

## ٢

دوای تەواوکردنی قۆناغی ئامادەیی، بڕیارم دا بچم بۆ زانکۆی کارۆلاینای باکوور لە چاپڵ هیڵ. باوکم دەیویست، وەک منداڵی هەندێک لە ئەندامانی ئەنجوومەنی نوێنەران، منیش بچم بۆ زانکۆی هارڤارد یان پرینستن، بەڵام نمرەکانی من هێند نزم بوون، بۆ ئەو شوێنانە قبوڵ نەدەکرا، لەبەر ئەوە نەبوو خوا نەکردە خوێندکارێکی تەمبەڵ بم. تەنیا ئەوە بوو زۆر بیروهۆشم نەدەدا بە سەعییەکانم، بۆیە ئەو زانکۆ ئەکادیمییانە وەریان نەدەگرتم. لە دواقۆناغی ئامادەییمدا دەر دەکەوت، کە داخۆ لە زانکۆی کارۆلایناش وەر دەگیرێم یاخود نا، باوکیشم هەر لەو زانکۆیە خوێندنی تەواو کردبوو، بۆیە هیوام هەبوو بتوانێ شتێکم بۆ بکات. باوکم ڕۆژێکیان لە پشووی هەفتەیەکدا لەماڵەوە بوو، بە هۆی ڕۆژی جیهانیی کرێکارانەوە، سێ ڕۆژ پشوویان وەر گرتبوو. ئەو ڕۆژە بە مێشکیدا هات شتێک بکەم، تا نمرەکانم بەرزتر بکەمەوە. جا زۆر نەبوو یەکەم هەفتەی قوتابخانەمان بەڕێ کردبوو، ئێوارەکەی دانیشتبووین، شێومان دەخوارد. وتی، "بە بۆچوونی من، بەشداری لە کۆرسی سەرۆکایەتیی

دەستەی خوێندکاراندا* بکەیت، مانگی حوزەیران تەواو دەبێت، بۆ نمرەکانت گەلێک باشە، دایکیشت هەمان بۆچوونی منی هەیە."

دایکم بەدەم خواردنی پارووەیەکەوە سەرێکی ئەرێنیی لەقاند و چاوێکی لێ داگرتم. هەرکاتێک باوکم قسەی بکردایە، دایکم بێدەنگ دەبوو، هیچی نەدەگوت. جاروبار هەستم دەکرد دایکم پێی خۆش بوو شەرم بکەم یان تەریق ببمەوە، گەرچی داکێکی باش بوو بۆم.

منیش وتم، "بڕوا ناکەم سەرکەوتوو بم لەو کۆرسەدا." هەرچەند ڕەنگە من لەنێو خوێندکارەکانی تردا لە هەموویان گوزەرانم باشتر بووبێت، کەچی لەنێویاندا زۆر دیار نەبووم. ئەو شەرەفە درابوو بە ئێریک هەنتەر، کە نزیکترین هاوڕێم بوو. دەیتوانی تۆپی یاریی بەیسبۆڵ بە خێراییەکی گەلێک زۆر بهاوێ، تیمی وەرزشیی خوێندنگەکەی گەیاندبووە لووتکە، کردبوومان بە کاپتنی تیمەکە، کوڕە هەر باس ناکرێ، بلیمەتێک بوو بۆخۆی. ناوەکەیشی لەسەر زار خۆش بوو.

ئەوجا ڕاست باوکم وتی، "گومانی تیا نییە سەرکەوتوو دەبیت، بنەماڵەی کارتەر هەمیشە هەر سەرکەوتوو بووە."

ئاخر ئەمە بوو وای لێ دەکردم حەز نەکەم لەگەڵ باوکمدا دابنیشم. ئەو جاروبارە کەمەش کە دەهاتەوە بۆ

---

* سەرۆکایەتیی دەستەی خوێندکاران کۆرسێکە لە قۆناغەکانی خوێندن لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دەخوێندرێت، تا خوێندکاران ئامادە بکات بۆ نوێنەرایەتیی خوێندکارانی تر. دەرچووانی ئەم کۆرسە، داواکاری و بۆچوونی خوێندکارانی تر وەر دەگرن بە مەبەستی باشتر بەرەوپێشبردنی پرۆسەی خوێندن.

ماڵـەوە، وا بزانـم بـۆ ئـەوە دەهاتـەوە منیـش بخاتـە پێسـتی خۆیـەوە. خـۆی چۆنـە، منیـش وا بـم. بـە هـۆی ئـەوەی زۆر لـە مـاڵ نەدەکەوتـەوە و منیـش بـێ ئـەو گـەورە ببـووم، بۆیـە پێـم خـۆش نەبـوو لـە ماڵـەوە بێـت. چەندیـن هەفتـە بـوو ئـەوە یەکـەم جارمـان بـوو پێکـەوە دابنیشـین و قسـە بکەیـن. تەلەفونێـک چییـە، بـۆی نەدەکـردم.

"ئەی گەر حەز نەکەم بەشداری لەو کۆرسەدا بکەم؟"

کـە وام گـوت، چەتاڵەکـەی کـە هێشـتا پارچەیـەک گۆشـتی پێـوە مابـوو، دای نایـە سـەر قاپەکـەی بەردەمـی. نیگایەکـی پـڕ لـە خێسـەی ئاگرینـی تـێ گرتـم. هەرچەنـد پلـەی گەرمـای نـاو ژوورەکـە زیاتـر لـە بیستوشـەش پلـەی سیلیزی دەبـوو، کەچـی قاتـی لەبـەر کردبـوو، ئەوەنـدەی تـر سـامت دەکـرد. باوکـم دایمـەی خـوا قاتـی لەبـەر دەکـرد.

بـە دەنگێکـی هێـواش و نـەرم وتـی، "شـتێکی خـراپ نییـە گـەر بچیـت."

لێـی شـارەزا بـووم، دەمزانـی هەرکاتێـک بـەو جـۆرە قسـەی بکردایـە، مانـای ئـەوە بـوو شـتەکە یەکلایـی کراوەتـەوە. ئەمـە عادەتـی ماڵـی ئێمـە بـوو. قسـە هـەر قسـەی باوکـم بـوو، هەرچیـی بگوتبـا، دەبـوو جێبەجـێ بکرابـا. لـێ ڕاسـتییەکەی، تەنانـەت دوای ئـەوەی ڕازییـش بـووم بچـم بـۆ کۆرسـەکە، هێشـتا دڵـم پێـوەی نەبـوو. تاقەتـم نەبـوو بەیانییـان لـە خوێندنگـە بـم و دوای نیوەڕوانیـش دیسـان چرۆچـاوی مامۆسـتا ببینمـەوە و بەدرێژاییـی سـاڵێک، هەمـوو پـاش نیوەڕوانێـک، خـۆم بـە دانانـی مۆسـیقای سـەماوە سـەغڵەت بکـەم یـان بچـم ڕەنگـی هۆڵـەکان هەڵبژێـرم، تاقەتـی ئەمانـەم نەبـوو. ئیتـر ئەمـە ئیشـی دەسـتەی

خوێندکاران بوو، دەبوو ئەمانەم بکردایە. خۆ ئیشێکی باشیان لەدەست نەدەهات، ئەم شتە بێمانایانە نەبێت.

لێ دواتر بۆم دەر کەوت، باوکم مەبەستێکی هەبوو لەمەدا. ئەویش ئەوە بوو، گەر بمویستایە بچم بۆ زانکۆی کارۆلاینای باکوور، ئەوا دەبوو شتێک بزانم. ئێ منیش یاریی دووگۆڵیم نەدەزانی، باسکەم نەدەزانی، هیچیشم لە مۆسیقا نەدەزانی، لە خولی شەترەنج یان یاریی بۆڵینگیشدا نەبووم، لە وانەکانیشدا نمرەکانم زۆر بەرز نەبوون، لە هیچ شتێکدا باش نەبووم. ئەوجا نائومێدانە هاتمە سەر ئەو شتانەی دەمتوانی بیانکەم، پیاو ڕاست بڕوا، ئەویش زۆر نەبوون، دەمتوانی سێ جۆر بۆینباخ ببەستم، بە پێی پەتی بەسەر قیری گەرمدا بڕۆم، تا سێ چرکە قەڵەم لەسەر پەنجەم بەستوونی ڕابگرم... لەو بڕوایەشدا نەبووم هیچکام لەم شتە قۆڕانەی من، لە فۆڕمی وەرگرتنی زانکۆ گرنگییان پێ بدرێت. ئیدی بەدرێژاییی شەو، هەر بیرم دەکردەوە، بۆم دەر کەوت من تەنیا زلی بێهونەرم و هیچی تر. سوپاس باوکە.

بۆ ڕۆژی دواتر، بەگوێی باوکم کرد و دەمەوبەیانییەکەی چووم بۆ نووسینگەی بەڕێوەبەر، لە لیستی ناوەکاندا، منیش ناوی خۆم نووسی بۆ خولی دەستەی خوێندکاران. لەوێ تەماشام کرد، دوو کەسی تریشی لێ بوو – جۆن فۆرمان و ماگی براون. ڕاست زانیم جۆن وەر نەگیرا. ئەم کوڕە عادەتێکی هەبوو، کە قسەی بۆ دەکردی، بەدەم قسەوە دەستی دەبرد بۆ جلەکانی بەرت. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا خوێندکارێکی زیرەک بوو. ئەو کاتە لە قوتابخانە لە ڕیزی پێشەوە دادەنیشت، هەرکاتێکیش مامۆستا پرسیارێکی بکردایە، ئەو

دەستی بەرز کردبووەوە، کە هەڵیشدەستا، ڕاست وەڵامێکی وردی دەدایەوە. ئەوجا بە نیگایەکی شانازییەوە سەری بەملا و ئەولادا وەر دەچەرخاند، وەک ئەوەی بڵێ، ها... من لە ئێوە زیرەکترم. من و ئێریکی هاوڕێشم، هەموو جارێک، کە مامۆستا پشتی لێمان دەبوو، تفمان تێ دەگرت.

کەچی ماگی براون شتێکی تر بوو. خوا هەڵناگرێ ئەویش خوێندکارێکی بەتوانا بوو. ماوەی سێ ساڵ ئەندامی دەستەی ئەنجوومەنی خوێندکاران بوو، ساڵی پاریش، واتە قۆناغی پێش کۆتایی، بووە نوێنەری پۆلەکەمان. تەنیا عەیب لەو کچەدا، ئەوە بوو زۆر جوان نەبوو، ئەو هاوینەش کێشی دوو ئەوەندە زیادی کردبوو. دڵنیا بووم هیچکەس دەنگی بۆ نادات ببێتەوە بە نوێنەر.

دوای ئەوەی لیستی ناوەکانم بینی، ئەوانەی خۆیان ناونووس کردبوو بۆ دەستەی خوێندکاران، درکم پێ کرد ڕەنگە دەرفەتی سەرکەوتنم هەبێت. هەموو داهاتووم لەسەر ئەمە بەند بوو، لەبەر ئەوە، هەموو توانا و هەوڵی خۆم خستە گەڕ. ئێریک یەکەمین کەس بوو هانی دام. وتی، "خەمت نەبێ، دەنگی هەموو ئەوانی تریشت بۆ کۆ دەکەمەوە، گەر تۆ بەڕاستی مەبەستت سەرکەوتن بێت."

منیش لێم پرسی، "ئەی هاوڕێ کچەکانیان؟"

ئەوە هەموو هەڵمەتی بانگەشەی من بوو. بەشداریم لە چاوپێکەوتنەکانیشدا کرد، کە هەر دەبوو بکرێت. دواتر دەستم کرد بە بڵاوکردنەوەی ئەو ڕیکلامە قۆڕانەی بانگەشەی هەڵبژاردن، کە شتی بێمانای وەک گەر دەنگم پێ بدەن، وا دەکەم و وا دەکەمیان لەسەر نووسرابوو. بەڵام

دواجار، ڕەنگە بە هەوڵی ئێریک بووبێت گەیشتمە ئەو خاڵەی مەبەستم بوو. خوێندنگەی بیوفۆرت تەنیا نزیکەی چوار سەد خوێندکاری هەبوو، بۆیە بەدەستهێنانی دەنگی تەواو، گەلێک ئەستەم بوو، چونکە ئەو دەبەنگانەی خوێندنگە گوێیان نەدەدا بە دەنگدان و شتی وا. ئەنجام، خوا بە دڵی خۆمی بۆ کردم.

بە زۆرینەی دەنگ، بە نوێنەری خوێندکاران هەڵبژێردرام لە دەستەی ئەنجوومەنی خوێندکاراندا. ئیتر نازانم لێرە بەدواوە تووشی چ کێشە و بەڵایەک دەبم.

ئەو دەمەی لە قۆناغی دووەمی ئامادەیی بووم، پەیوەندیم لەگەڵ کچێکدا بەست بە ناوی ئەنجێلا کلارک. یەکەمین هاوڕێی کچم بوو، هەرچەند پەیوەندییەکەمان تەنیا چەند مانگێکی کەمی خایاند. ئەو ساڵە، پێش ئەوەی پشووی هاوین دەست پێ بکات، وازی لە من هێنا و دەستی لەگەڵ کوڕێکی تردا تێکەڵ کرد، ناوی لیۆ بوو، تەمەنی بیست ساڵان دەبوو، وەک میکانیک لە گەراجەکەی باوکی کاری دەکرد. تەنیا شتی باشی ئەم کوڕە ئەوە بوو، ئوتومبێلێکی کەشخەی لەژێردا بوو، دایمەی خواش تیشێرتێکی سپی، کە وێنەی کۆمەڵێک وشتری لەسەر قۆڵەکان بوو، لەبەر دەکرد. پاڵی دەدا بە بۆنیدی ئوتومبێلەکەیەوە و بەمسەر و ئەوسەردا چاوی دەگێڕا، کە کچێکیش بەلایدا تێپەڕ بووایە، دەیگوت، "چۆنی کچی باش؟" ئیتر ئەم شتە قۆڕانە. بۆخۆشتان دەزانن، کچ حەزیان لەو جۆرە کوڕانەیە.

بە هەرحاڵ، ئەو ساڵە کە خوێندن تەواو بوو و پشووی هاوین دەستی پێ کرد، ئاهەنگی دەستپێکی پشووی هاوینمان گێڕا. جا بە هۆی مەوزوعی ئەنجێلاوە، پەیوەندیم لەگەڵ هیچ

کچێکدا نەبەستبوو. هەموو ئەوانەی ئەندام بوون لە دەستەی ئەنجوومەنی خوێندکارانیشدا، پێویست بوو بەشداری بکەن لەو ئاهەنگەدا - بەزۆر بوو، هەر دەبووایە بچووینایە. دەبوو بچم هۆڵەکە بڕازێنمەوە لەگەڵیاندا و بۆ ڕۆژی دواتریش پاکی بکەینەوە - جگە لەوەش ئەو جۆرە ئاهەنگانە بۆخۆی شتێکی خۆش بوو. تەلەفۆنم بۆ دوو کچی هاوڕێم کرد، بەڵام پێش من بەڵێنیان بە کوڕی تر دابوو، بۆیە تەلەفۆنم بۆ چەند کچێکی تر کرد. ئەوانیش گیرابوون. دواجار تەماشام کرد کەس نەمابوو، جگە لەو کچانەی چاویان کزە و چاویلکەی ئەستووریان لەچاودایە یان ئەوانەی زمانیان دەیگرێ و فسن. شانسی ئێمە، هەرگیز بیوفۆرت بەعەمراتی خۆی کچێکی جوانی تیا نەبووە. هەرچۆنێک بووایە، هەر دەبوو کچێک بدۆزمەوە. بەبێ کچێک، نەمدەویست بچمە ئەو ئاهەنگەوە - بیهێنە بەر زەینی خۆتان، هەموویان، هەریەکی قۆڵ بکات بە قۆڵی کچێکدا و منیش بەتەنیا چی دەر دەچم؟ مەگەر بچوومایە تەوالێتەکانم پاک بکردایەتەوە. ئەو کاتە لە مێژووی ئاهەنگی دەستپێکی پشووی هاویندا، من تەنیا کەس دەبووم بەبێ کچەهاوڕێیەک بچم.

خەم و پەژارە زایە نێو دڵم، بە نائومێدییەوە چووم کتێبی چالاکییەکانی ساڵی پارم دەر هێنا و یەکەبەیەکە بەنێو پەڕەکانیدا گەڕام، بەو هیوایەی یەکێک لە کچەکان بدۆزمەوە هاوڕێی کوڕی نەبێت. سەرەتا بەنێو بەشی چالاکیی خوێندکارەکانی قۆناغی کۆتاییدا گەڕام، هەرچەند ئێستا زۆربەیان لە کۆلێژ دەیانخوێند، لێ هەندێکی کەمیان هەر لە شارۆچکەکەدا مابوون. سەرەڕای ئەوەی بڕواشم نەدەکرد

بگونجێت، بەلام هەرچۆنێک بێت، هەر تەلەفۆنم بۆ کردن، خۆم باش دەمزانی کەس نابێت لەگەلی بچمە دەرەوە. گەڕام گەڕام، کەسم دەست نەکەوت ژوانی لەگەل ببەستم. ئەوەندەم ڕەفز وەر گرت، خۆشە ببووم، دلنیام ئێوە بن لە جێی من، ئەوها باسی ئەم شتانە بۆ نەوەکانتان ناکەن. دایکم ئاگاداری هەموو شتێکم بوو، دەیزانی لە چ حالێکدام، ئەو شەوە هاتە ژوورەکەم و لەتەکمەوە لەسەر قەراغی تەختە خەوەکەم دانیشت. وتی، "گەر هاوڕێیەکی کچت دەست ناکەوێ لەگەلت بێت بۆ ئاهەنگەکە، ئەوا من خۆشحال دەبم لەگەلت بێم."

سەرێکی ناڕەزاییم با دا و وتم، "نا، قەینا. سوپاس دایکەگیان."

کە ژوورەکەی بەجێهێشت، هێندەی تر خەم دای گرتم. دەی ئەوەتا دایکشم دەزانێ هیچ کچێکم دەست نەدەکەوت ژوانی لەگەل ببەستم بۆ ئاهەنگەکە. گەر لەگەل ئەودا بچوومایە؟ هەر ئابڕووم دەچوو، دەیانگوت هیچ کچێک حسابی بۆ نەکردووە. گەر سەد سالیش بژیابایە، لەبیرم نەدەچووەوە.

کەسێکی تریش هەبوو، وەکوو من دەردەدار بوو و حالی لە حالی من باشتر نەبوو، ئەویش کێری دێنیسن بوو، بە ئەمینداری خەزێنەی قوتابخانە دەستنیشان کرابوو. کەس نەیدەویست لەگەلی بچێتە دەرەوە یان ژوانی لەگەل ببەستێت، تاکە هۆکاریش کە هەلبژێردرابوو لە دەستەی نوێنەران، لەبەر ئەوە بوو کەسی تر نەبوو ڕکابەریی بکات. بگرە لەو بڕوایەدام، ژمارەی دەنگەکانیشی وەک پێویست نەبووبێت. لە تیمی مۆزیکی مارشالیش، ئامێری سەکسیفۆنی دەژەند.

قەبارەی ئەندامەکانی بەدەنی لەگەڵ یەکدا وێک نەدەچوون، ورگێکی زل و قەبە، قاچ و دەستەکانیشی درێژ و باریک، بۆخۆتان حوکم بدەن، دەبێت چ دیمەنێکی هەبووبێت. لەگەڵ ئەوەشدا کە قسەی دەکرد، دەنگی هێند بەرز بوو، کەڕی دەکردی – ئاخر بۆیە سەکسیفۆنژەنێکی باشی لێ دەر چووبوو – ئەوەندەی پرسیاریش دەکرد، بە تۆ با دەمی بدوورییەوە. "لەکوێ بوویت؟ بۆ کوێ چوویت؟ خۆش بوو؟ کچی جوانت بینی؟" چاوەڕوانی وەڵامی پرسیاری یەکەمی نەدەکرد، پرسیارێکی تری تێ دەگرتی، لەگەڵ وەرچەرخانی تۆدا، ئەویش دەهاتەوە پێش دەمت، تا ڕووت لەو بێت کە پرسیاری دەکرد. سوێند دەخۆم بە تەمەنم کەسی وەک ئەو بێزارکەرم نەناسیوە. جا وەرە گەر بزانێت هاوڕێیەکی کچم دەست نەکەوتووە لەگەڵی بچمە ئاهەنگەکە، خۆ ئەو شەوە وەک درێل مێشکم بە پرسیار کون دەکات.

هەر بەنێو پەڕەی چالاکییەکانی قۆناغی ساڵی پاردا دەگەڕام، تا دواجار چاوم چووە سەر وێنەی جەیمی سولیڤەن. ساتەوەختێک لەسەر وێنەکە مامەوە، سوێندم خوارد، هەر بیریشی لێ نەکەمەوە، ئەوجا پەڕەکەم هەڵدایەوە بۆ ئەوەی دواتر. کاتژمێرێکی تر گەڕام کەسێک بدۆزمەوە، هیچ نەبێت ڕەنگوڕوویەکی وەهای هەبێت، پیاو لە ڕووی بێت لەگەڵیدا بچێت بۆ ئاهەنگ و شتی وا. لێ وردەوردە هاتمە سەر ئەو بڕوایەی کەس نەماوە. زۆری نەبرد، گەڕامەوە سەر وێنەکەی جەیمی و جارێکی دی لێی ورد بوومەوە. گوتم خراپ نییە، جوان و خوێنشیرینە. ڕەنگە ڕازی ببێت...

کتێبی چالاکییەکانم داخست. جەیمی سولیڤەن؟ کچی

هێگبێرت؟ مەحاڵە، شتی وا نابێت. جا خۆ هاوڕێکانم هەر حەیام دەبەن.

بەڵام خۆ لەوە باشترە لەگەڵ دایکما بچمە ئاهەنگەکە، یان بچم تەوالێتەکان بسڕەمەوە، یان خوا نەکردە تووشی پرسیارە کونکەرەکانی کێری دێنیسن ببمەوە.

ئەو ئێوارەیە، هەر بیرم لە لایەنە باش و خراپەکانی دەکردەوە. بڕوام پێ بکەن، بەو ژوورەدا هەر دەهاتم و دەچووم، دواجار یەکلا بوومەوە. بڕیارم دا بچم داوا لە جەیمی بکەم ژوانم لەگەڵ ببەستێ بۆ ئاهەنگەکە. بەو ژوورەدا دەخولامەوە، دەی چی بڵێم و چۆن داوای لێ بکەم، بیرم لە باشترین ڕێگە دەکردەوە پێی بڵێم.

ئەوجا شتێکی سەیر بە زەینمدا هات، شتێکی بەڕاستی دڵپروێن. کێری دێنیسن، لەناکاو خەیاڵم بۆ ئەوە چوو، ڕەنگە ئەویش ئێستا وەک من بکات. ڕەنگە ئەویش ئێستا بەنێو پەڕەی کتێبی چالاکییەکاندا بگەڕێت! کێری ڕاستە کەسێکی ناتەواو بوو، بەڵام ئەویش لەو کەسانە نەبوو بچێت تەوالێت پاک بکاتەوە، یان لەگەڵ دایکیدا بچێت، گەر دایکیتان بدیتبا، ئەو کاتە بۆتان دەر دەکەوت هێشتا من باشتر بووم. باشە گەر ئەو پێش من داوا لە جەیمی بکات، چی دەبێت؟ بێگومان ئەویش ڕەتی ناکاتەوە، چونکە ڕاستییەکەی، کێری جگە لەو، کەسی تری شک نەدەبرد. ئەو نەبێت، کەسی تریش پێی ڕازی نابێت. جەیمی یارمەتیی هەموو کەسی دەدا - یەکێک بوو لەو کەسانەی دەستی نەدەنا بە ڕووی هیچ کەسەوە. ڕەنگە گوێ لە کێری بگرێت بەو دەنگە گڕەوە و هەستی بەزەییی بۆی بجووڵێت و ڕازی ببێت بە داواکەی. کێ ناڵێت؟

لە ژوورەکەی خۆمدا بەداماوی دانیشتبووم، کسپەیەکی جەرگبڕ هەناومی دەهەژاند، دەترسام جەیمی لەگەڵ من نەیەت بۆ ئاهەنگەکە. ئەو شەوە خەو نەدەچووە چاوم، سەرم قورس ببوو، بە تەمەنم ئەوها خەم و پەژارە زەفەری پێ نەبردووم. بڕوا ناکەم پێشتر هیچ ئادەمییەکی تر بە خەمی ئەوەوە بووبێت، داوا لە جەیمی بکات لەگەڵی بچێتە دەرەوە. وام دانا، بەیانی، هەتا بڕوام بە خۆم مابوو، پێش هەموو شتێک بچم داوای لێ بکەم، کەچی جەیمی ئەو ڕۆژە لە قوتابخانە نەبوو. گوتم لەوە دەچێ چووبێت بۆ شاری مۆرهێد، تا یارمەتیی منداڵە هەتیوەکان بدات، چونکە هەموو مانگێک دەچوو بۆ ئەوێ. جاری وا هەبوو، ئێمەش بە بیانووی ئەوەی دەچین بۆ ئەوێ، هەوڵمان دەدا لە قوتابخانە بچینە دەرەوە، بەڵام تەنیا جەیمی بۆی دەچووە سەر و لێدەگەڕان بچێتە دەرەوە. بەڕێوەبەرەکەمان دەیزانی جەیمی دەچێت چیرۆک بۆ منداڵە هەتیوەکان دەخوێنێتەوە یان ئیشی دەستییان لەگەڵ دەکات، یاخود ئاگای لێیان دەبێت و یارییان لەگەڵ دەکات. وەک ئێمە نەبوو بچێت بۆ کەنار دەریاکە یان بۆ کافتریا و شتی وا.

ئێریکی هاوڕێم، لە کاتی پشووی نێوان وانەکان لێی پرسیم، "کچێکت هەر نەدۆزییەوە لەگەڵی بچیت بۆ ئاهەنگەکە؟" بۆخۆیشی باش دەیزانی کەسم دەست نەکەوتبوو، لێ هەرچەند نزیکترین برادەریشم بوو، کەچی هەندێک جار حەزی دەکرد دەرزی بکات بە گیانمدا.

منیش وتم، "هێشتا نەوەڵڵا، بەس ئیتر وا خەریکم دەگەڕێم."

لەوسەری ڕاڕەوەکە، کێریم چاو کرد تاکی لۆکەرەکەی خۆی دەکردەوە. دڵنیام کە زانیویەتی من ئاگام لەو نەبووە، سەرەتاتکێی کردووم.

ئەو ڕۆژە ئەوها تێپەڕی.

لە وانەی کۆتاییدا، ئەو ڕۆژە کات زۆر بەخاوی تێدەپەری، هەموو چرکەیەکم بە ساڵێک لێ دەڕۆیشت. بەم جۆرە هێنامە بەر زەینی خۆم – گەر من و کێری پێکەوە لە یەک کاتدا بچینە دەرەوە و بەرەو ماڵی جەیمی بەڕێ بکەوین، ئەوا من پێشتر دەگەم، ئەو، بەو قاچە گۆجانەوە، بە چی دەگاتە ئەوێ؟ لە زەینی خۆمدا هەموو شتێکم ڕێک خست و ئامادە و تەیار بووم، کاتێکیش زەنگی وانەی کۆتایی لێی دا، ڕاست لە خوێندنگە وەدەر کەوتم و بە گورگەلۆقە بەرەو ماڵی جەیمی بەڕێ کەوتم. هەنگاوێکم کردبوو بە سەد، ماندوێتی زەفەری پێ هێنام، پاشان ئازارێکی جەرگبڕ هێزی ئەژنۆمی شکاند. هێندی پێ نەچوو، ئەوەندەی تر شەکەت و ماندوو بووم، ئەو ئازارە بەڕاستی لە پەلوپۆی خستم، ناچار لەتاو ئازار دەچەمامەوە و هەردوو دەستیشم بە کەلەکەمەوە دەگرت و بەکاوەخۆ ڕێم دەکرد. کە بە شەقامەکانی بیوفۆرتدا دەڕۆیشتم، لە کابرایەکی پشتکۆمی دەرۆزەکەر دەچووم.

لەپشتمەوە هەستم کرد تریقە و پێکەنینە گڕ و ناخۆشەکەی کێری دەهاتە بەرگوێم، ئازارێکی جەرگبڕیش لە کەلەکەمدا زەفەری پێ بردبووم، ئاوڕم دایەوە، کەس دیار نەبوو. دیارە هەر لەگەڵ ئاوڕدانەوەی مندا، خۆی تووڕ داوەتە پشت دیوارێک! ئەو هەتیوە بۆ یەک خولەکیش جێی متمانە نەبوو، سەگێک بوو بۆخۆی.

ئەوجا خێراتر هەنگاوم هەڵهێنا، هێندی پێ نەچوو، گەیشتمە کۆڵانەکەی ماڵی جەیمی. ئازای گیانم نیشتبووە سەر ئارەقە - کراسەکەم شەلاڵ بوو لە ئارەقەدا - هەناسەبڕکێم پێ کەوتبوو، خەریک بوو دەبووورامەوە. ئیدی گەیشتمە بەردەرگاکەی ماڵیان، کەمێک حەوامەوە، تا هەناسەسوارییەکەم هێور ببێتەوە، پاشان لە دەرگام دا. لەگەڵ ئەوەشدا کە بەو هەموو ڕاکردن و پەلەپەل و دوودڵییەوە گەیشتمە بەردەمی ماڵیان، کەچی هێشتا گومانم هەبوو، دەمگوت ڕەنگە ئێستا لەجیاتی ئەوەی جەیمی دەرگام لێ بکاتەوە، کێری دێت دەیکاتەوە. دەمهێنایە بەر زەینی خۆم، بە پێکەنینێکی شانازییەوە دێت دەرگا دەکاتەوە و دەڵێت، "ببوورە هاوڕێم، دوا کەوتیت."

سوپاس بۆ خوا، کە دەرگام لێ کرایەوە، جەیمی خۆی بوو، بۆ یەکەمین جاریش بوو لە ژیانمدا وەک کەسێکی ئاسایی بێتە بەرچاوم. پانتۆڵێکی کاوبۆی لەبەردا بوو لەگەڵ بلووزێکی سوور، گەرچی هێشتا قژی لەدواوە تەماتە کردبوو، لێ گەلێک سادەوساکار دەهاتە پێشچاو. گەر دەستێک بە خۆیدا بێنێت، بەڕاستی کەشخە و جوانە.

کە دەرگای لێ کردمەوە، وتی، "لاندن، ئەمە تۆیت؟ ڕێکەوتێکی جوانە!" جەیمی هەمیشە هەرکەسێکی بدیتبا، دڵی پێی دەکرایەوە، بۆ منیش هەر وا بوو. بەڵام کە چاوی بەو سەروسەکوتەم کەوت ئەوها شێواوم، واقی وڕ ما. وتی، "ئەوە چییە، دەڵێی لە یاری بوویت؟"

منیش وتم، "نەوەڵڵا، یاریی چی!" ئارەقەی نێوچەوانم بە پشتی دەستم سڕی، باش بوو ئازاری قاچەکان و ناوسکم

کەمێک هێور ببووەوە.

"کراسەکەت هەمووی شەڵاڵی ئارەقەیە."

تەماشایەکی خۆم کرد، ئەوجا وتم، "ئەمە دەڵێی؟ نا، هیچ نییە، جاری وا هەیە ئارەقە زۆر دەکەمەوە."

"مادام، باشتر وایە بچیت بۆ لای دکتۆر و نزای چارەسەرێک وەر بگریت."

"هیچ نییە، باش دەبم."

بزەیەکی شیرینی کرد و وتی، "دەی منیش نزای خێرت بۆ دەکەم." جەیمی هەمیشە نزای خێری بۆ هەموو کەس دەکرد. خوا بە نزای ئەوم بۆ بکات.

منیش وتم، "سوپاس."

سەری کەمێک شۆڕ کرد و بە شەرمەوە قاچەکانی ئەمدیو و ئەودیو کرد، پاشان وتی، "ئەزانی چۆنە، ڕێگەم دەدایت بێیتە ژوورەوە، بەڵام باوکم لە ماڵ نییە، جا بۆیە پێی خۆش نییە کە خۆی لێرە نەبێت و کوڕ بێت بۆ ماڵمان."

منیش بە نائومێدی و پەژارەیەکەوە وتم، "دەی قەینا، کێشە نییە. لێرە، لە دەرەوە قسە دەکەین."

"کەمێک شەربەتی لیمۆ بێنم دابنیشین و بیخۆینەوە؟ ئەوەندە نابێت خۆم هەندێکم دروست کردووە."

"گەر بتوانیت، پێم خۆشە."

"بەسەر چاو، هەر ئێستا دێمەوە."

جەیمی چووە ژوورەوە تا شەربەتەکە بێنێت، بەڵام دەرگاکەی لەپاش خۆی پێوە نەدا، منیش ناو ماڵەکەیانم لێوە دیار بوو، چاوێکی خێرام پێدا گێڕا. بینیم ماڵەکەیان بچووک، بەڵام کەشخە و کۆکراوە بوو. پیانۆیەک لەتەک

دیوارێکەوە و تاکێک قەنەفەش لەتەنیشت دیوارەکەی ترەوە دانرابوو. پانکەیەکی ئەرزییش لە سووچەکەدا هەواکەی بە هەردوو لادا بڵاو دەکردەوە. لەسەر مێزی قاوەکەش چەند پەرتووکێکی لەسەر دانرابوو، بە ناوی *گوێگرتن لە مەسیحی نەمر و بڕواداری وەڵامی ڕاستەقینەیە.* کتێبێکی ئینجیلیشی بەکراوەیی لەسەر بوو.

کەمێکی پێ چوو بە خۆی و شەربەتەکەوە هاتەوە. لەژێر داڵانەکەی دەرەوە، دوو کورسیی لێ بوو، دانیشتین. دەمزانی لەگەڵ باوکیدا ئێواران لەسەر ئەم دوو کورسییە دادەنیشتن، چونکە جاروبار، کە بەلایماڵیاندا تێدەپەڕیم، دەمبینین. هەر کە دانیشتین، چاوم بە خاتوو هاستینگسی دراوسێیان کەوت، لەوبەری شەقامەکەوە دەستێکی بەرز کردەوە، سڵاوی کرد. لەو کاتەدا کە جەیمییش وەڵامی سڵاوەکەی دایەوە، کورسییەکەم کەمێک جووڵاند تا نەمناسێتەوە. لەبەر ئەوەی هەرچەند هاتبووم داوا لە جەیمی بکەم لەگەڵم بێت بۆ ئاهەنگەکە، لێ نەمدەویست کەس بمبینێت، چونکە دەترسام پێشتر بەڵێنی بە کێری دابێت و خەڵک قسەم بۆ دروست بکەن.

جەیمی لێی پرسیم، "ئەوە چی دەکەیت؟ بۆچی کورسییەکەت دەبەیتە بەر هەتاوەکە؟ زۆر گەرمە."

منیش وتم، "حەزم لەبەر خۆرەکەیە." ڕاستی دەکرد، هێندەی پێ نەچوو، هەستم کرد تیشکی خۆرەکە خەریکە دەمسووتێنێ و شەلاڵی ئارەقە دەبمەوە.

بە بزەیەکەوە وتی، "بە دڵی خۆت. دەی پێم بڵێ، ویستت باسی چیم لەگەڵدا بکەیت؟"

کەمێک خۆی لەسەر کورسییەکە وەر چەرخاند و لێم

هاتە پێشێ. ئەمنیش هەناسەیەکی قوولم هەڵمژی و تەقەللام دا زەینم کۆ بکەمەوە، کەچی هێشتا نەمدەتوانی ئەوەی لە دڵمدا بوو بیڵێم. بۆیە وتم، "ئەمڕۆ لە هەتیوخانەکە بوویت؟"

پێی سەیر بوو کە وام گوت، بە نیگایەکی پرسیاراوییەوە لێم ورد بووەوە سەرنجێکی قووڵی لێ گیر کردم، ئەوجا وتی، "نا، لەوێ نەبووم، لەگەڵ باوکم چووبووین بۆ لای دکتۆر."

"باوکت خۆ شکور تەندروستیی باشە؟"

زەردەیەکی هاتێ و وتی، "ئیتر هەر وا دەبێت، خوا چاکی بۆ بکات."

سەرێکم لەقاند و نیگام گواستەوە سەر شەقامەکە. ئەو خاتوونەی دراوسێیان لەوێ نەمابوو، چووبووە ژوورەوە، کەسی تریشم چاو نەکرد لەو ناوە. کاتێ ئەوە هاتبوو نیازی خۆمی پێ بڵێم، کەچی هێشتا غیرەتم نەبوو بیدرکێنم.

هەوڵم دا زیاتر بابەتەکە لە زەینی خۆمدا ورد بکەمەوە، بۆیە ویستم جارێ کاتی تر وەر بگرم. "بەڕاستی ڕۆژێکی خۆشە."

"ڕاست دەکەیت، خۆشە."

"هەواکەشی گەرمە."

"ئاخر، چونکە لەبەر خۆرەکە دانیشتوویت، بۆیە گەرمە."

چاوێکم بە دەوروبەردا گێڕا، هەستم کرد فشارەکەی نێو ناخم زیاتر شاڵاوی بۆ دەهێنام. وتم، "خۆ هیچ پەڵەهەورێکیش بە ئاسمانەوە نییە."

جەیمی هیچی نەگوت، بۆ ساتێک ئەوها بەبێدەنگی ماینەوە.

دواتر سەری قسەی کردەوە، وتی، "لاندن، تۆ نەهاتوویت بۆ ئێرە تا باسی کەشوهەوا بکەیت، وا نییە؟"

"ڕاستییەکەی، نەوەڵڵا."

"ئەی بۆچی هاتوویت؟"

ئەو ساتەوەختەی چاوەڕوانم دەکرد، گەیشت. قوڕگم بۆ پاک کردەوە. پاشان وتم، "ویستم بزانم نیازت هەیە بچیت بۆ ئاهەنگی دەستپێکردنی پشووی هاوین."

لە قەلەقیدا، خۆم بەسەر کورسییەکەوە نەدەگرت، چاوەڕوانی وەڵامیم دەکرد. دواجار وتی، "ئۆو، وەڵلا نیازم نەبوو بچم." بە دەنگیدا وا دەر دەکەوت، وەک بڵێی هەر ئاگای لە شتی وا نییە.

"ئەی گەر کەسێک داوات لێ بکات، دەچیت لەگەڵی؟"

کەمێکی پێ چوو تا وەڵامی دامەوە.

بیرێکی لێ کردەوە و وتی، "دڵنیا نیم، گەر دەرفەتم هەبێت، رەنگە بچم. هەرگیز نەچووم بۆ ئەو ئاهەنگە."

دەستبەجێ وتم، "شتێکی خۆشە، ناڵێم زۆر، بەس ئیتر خراپ نییە."

کە وام گوت، بزەیەکی بۆ کردم و وتی، "دەبێت قسەش لەگەڵ باوکمدا بکەم، گەر ئەو رازی بێت، ئەوا منیش دەتوانم بچم."

باڵندەیەک لەسەر درەختەکەی تەکمانەوە جریوەجریوێکی نایەوە، کاسی دەکردی، وەک بڵێی بیەوێت دەرم بکات لەو شوێنە. هەوڵ مدا دەنگی باڵندەکە لەبیر خۆم بەرمەوە و بگەڕێمەوە سەر بابەتەکەی خۆمان. دوو رۆژ پێش ئەو کاتە، بڕوام نەدەکرد بتوانم تەنانەت بیریشی لێ بکەمەوە، کەچی ئەوەتا، لێرە لە بەردەمیدا فەلسەفییانە قسەی بۆ دەکەم.

"ئەی حەز دەکەیت لەگەڵ مندا بێیت بۆ ئاهەنگەکە؟"

تەلیسمێکی سەرسامی دای گرت. وا بزانم بڕوای نەدەکرد من ئەو پرسیارەی لێ بکەم. ڕاست وەڵامی نەدامەوە،

بەڵکوو نیگای لەسەرم گواستەوە و تا ماوەیەکی دریژیش هەر ڕووی تێ نەکردمەوە. جارێکی تر هەستم بە ئازارە جەرگبڕەکەی هەناوم کردەوە، چونکە گوتم بە خودا ئێستا داواکەم ڕەت دەکاتەوە. باشە چ بکەم گەر ڕازی نەبێت؟ دیمەنی ئەگەرەکانی تر هاتنەوە پێشچاوم، دایکم لەگەڵم بێت، دەبێت برادەرەکانم چم پێ بڵێن، پاککردنەوەی تەوالێتی هۆڵی ئاهەنگەکە، پرسیارە کونکەرەکانی کێری... ئەوجا دەستبەجێ پەشیمان بوومەوە لەوەی ئەو هەموو ساڵەی ڕابردوو بەو جۆرە ناشرینە ڕەفتارم لەگەڵ جەیمی کردبوو. هەموو ئەو کاتانەم هاتەوە یاد، کە گاڵتەم پێ دەکرد یان هاوارمان لە باوکی دەکرد و پێمان دەگوت زیناکار، یان ئا لەو کاتەدا کە ئەم هەموو پەشیمانییە بە بیروهۆشمدا دەهاتن و دەچوون و بیرم لەوە دەکردەوە چۆن خۆم لە پرسیارەکانی کێری بدزمەوە، لەو کاتەدا نیگای تێ گرتمەوە و بە زەردەخەنەیەکی گەشکەدارەوە وتی، "پێم خۆش دەبێت، بەڵام بە مەرجێک..."

خۆم ڕاست کردەوە، نزام کرد، خوایە گیان مەرجێکی دڵشکێن نەبێت. وتم، "مەرجەکەت چییە؟"

"دەبێت بەڵێنم بەیتێ نەکەویتە داوی خۆشەویستیی منەوە."

بە پێکەنینەکەیدا زانیم شۆخیی دەکرد، هەناسەیەکی قووڵم هەڵکێشا و گەشکەیەکی تەلیسماوی دای لە هەناوم. ئاهێکم پێدا هاتەوە. با ئەوەش بڵێم، جاروبار جەیمی گاڵتەوگەپیشی دەکرد. بزەیەکم بۆ کرد و بەڵێنەکەم پێ دا.

# ٣

وەک یاسایەکی گشتی، قەشەکانی کڵێسای باشوور سەما ناکەن. بەڵام لە بیوفۆرت، وەک یاسایەکی توند بەسەر خەڵکیدا نەدەسەپێنرا. ئەو قەشەیەی پێش هێگبێرت – بەس لێم مەپرسن ناوی چی بوو – زۆر چاوی نەدەخستە سەر ئاهەنگ و سەمای قوتابخانەکان، بەڵام بە مەرجێک، سەرپەرشتی بکرایە و ئاکاری خراپی لێ نەکەوتایەتەوە. ئیدی بەو هۆیەوە ئەم جۆرە ئاهەنگانە بوونە نەریت. کاتێکیش هێگبێرت هات و دەستبەکار بوو لەو کڵێسایە، ئیتر کات درەنگ بوو، فریای هیچ گۆڕانکارییەک نەکەوت. جەیمی تاکە خوێندکار بوو، کە بەشداریی نەکردبێت لە ئاهەنگی قوتابخانە، جا دڵنیاش نەبووم، دەمگوت تۆ بڵێی سەما بزانێت.

دەمەوێت ئەوەشتان پێ بڵێم، لە دڵی خۆمدا خەمم بوو، دەمگوت دەبێت چی لەبەر بکات، ئێ نەشدەکرا لە خۆی بپرسم. ئەو کاتانەی دەچوو بۆ کۆڕوکۆبوونەوەکانی کڵێسا، هەمیشە بلووزێکی کۆن و تەنوورەیەکی نەخشچوارگۆشەیی

لەبەر دەکرد، هەموو ڕۆژێکیش لە قوتابخانە هەر بەو جلانەوە دەمانبینی، بەڵام ئەم ئاهەنگە شتێکی تایبەت بوو. زۆربەی کچەکانی تر، عەزی و جلوبەرگی نوێیان کڕی و کوڕەکانیش بە قاتەوە دەهاتن، جا بۆ ئەمساڵیش، وێنەگرێکی تایبەتمان بانگ کردبوو. دەمزانی جەیمی بەنیاز نەبوو عەزی و شتی نوێ بکڕێ، چونکە دەرامەتیان باش نەبوو. کاری قەشەیی لە کڵێساکاندا، پیشەیەک نەبوو خەڵکی بتوانێت لە ڕێیەوە پارەی باشی لێ چنگ بکەوێت، لەگەڵ ئەوەشدا، قەشەکان بۆ دەسکەوتی ماددی ئەو کارەیان نەدەکرد، بەڵکوو لە دڵسۆزی و بۆ خزمەتی کڵێسا دەیانکرد. لێ منیش حەزم نەدەکرد هەمان ئەو جلە کۆنانەی لەبەر بکاتەوە، کە بۆ قوتابخانە دەیپۆشی، لەبەر خۆم نا – ئێجگار ئەوەندەش خۆپەرست نیم – بەڵکوو لە ترسی ئەوەی برادەرەکانم شتێک نەڵێن. پێم قبوڵ نەبوو خەڵکی گاڵتەی پێ بکەن.

خۆشییەکەی لەوەدا بوو، ئێریکی برادەرم هێند سەرقاڵی کچەهاوڕێکەی خۆی بوو، نەپەرژایە سەر ئەوەی گاڵتەم پێ بکات بۆ مەسەلەی جەیمی. ئەو ژوانی لەگەڵ مارگرێت هایس دەکرد، کە سەرۆکی دەستەی هاندەرانی قوتابخانە بوو. کچێکی زۆر جوان نەبوو، بەڵام هەندێک شتی هەبوو سەرنجڕاکێش بوون. کە دەڵێم هەندێک شتی، مەبەستم لە ڕان و قاچوقولی بوو. ئێریک داوای لێ کردم چوارقۆڵی ژوان ببەستین، بەڵام داواکەیم ڕەت کردەوە، چونکە نەمدەویست دەرفەتێک بڕەخسێت سەر بکەنە سەر جەیمی و گاڵتەی پێ بکەن. ئێریک کوڕێکی باش بوو، لێ جاروبار دەماری

کەرێتی دەیگرت، بەتایبەت ئەو کاتانەی دەیخواردەوە.

ڕۆژی ئاهەنگەکە، بەڕاستی ڕۆژێکی گەلێک پڕ لە سەرقاڵی بوو بۆ من، سەرم ئاش و قونم ماش بوو، بەدرێژاییی ئەو پاشنیوەڕۆیە، هەر خەریکی ڕازاندنەوەی هۆڵەکە بووم، جگە لەوەش، دەبوو نیوکاتژمێر زووتر بچم بۆ ماڵی جەیمی، چونکە باوکی دەیویست قسەم لەگەڵدا بکات، نەشمدەزانی بۆ. ئێ جەیمییش ڕۆژێک پێش ئەوە پێی گوتبووم، جا لەبەر ئەوە ناتوانم بڵێم چاوەڕوانی شتێکی دڵخۆشکەرم دەکرد. لە بیری خۆمدا لێکم دایەوە، گوتم ڕەنگە باسی فریودان و ئاکامە خراپەکانیم بۆ بکات. خۆ گەر بچم و باسی تاوانی زیناکردنم بۆ بکات، ئەوا دەمودەست لەوێدا دەمرم. ئەو ڕۆژە تا ئێوارە نزام کردووە ئەو باسانەم لەگەڵدا نەکاتەوە، جا نازانم ئاخۆ بە هۆی ڕەفتارەکانی پێشووترمەوە نزاکانم گیرا دەبن یان نا. بەم جۆرە بیرکردنەوانەوە، بیروهۆشم مەشغوڵ ببوو.

ئاوێکم بە خۆمدا کرد و قاتێکی جوانم لەبەر کرد، خۆم تاسولووس کرد. لەسەر ڕێگەش لام دایە دوکانێکی گوڵفرۆش، تا چەپکێک گوڵ بۆ جەیمی بەرم، ئەوجا بەرەو ماڵیان بەڕێ کەوتم. ئوتومبێلەکەی دایکم وەر گرتبوو، کە گەیشتم، لە شەقامەکەی بەردەمی ماڵیان ڕام گرت. ئەو دەمە هێشتا کاتژمێر نەگۆڕابوو، لەبەر ئەوە کە گەیشتمەجێ، جارێ ڕۆژ کەمێکی تری بەدەمەوە مابوو، بەرەو دەرگاکەیان هەنگاوم هەڵهێنا. لە دەرگام دا و هەنگێ چاوەڕوانم کرد، ئەوجا جارێکی دیکە لێم دایەوە. لەودیو

دەرگاکەوە گوێم لە هێگبێرتی باوکی بوو وتی، "وا هاتم."
بەڵام دیار بوو بەپەلە نەدەهات دەرگاکە بکاتەوە. ڕەنگە دوو خولەک یان زیاتر بووبێت لەو بەردەرگایە چاوەڕوان بووم تا بیکاتەوە، چاومان بەو ناوەدا دەگێڕا، تەماشای دەرگاکەم کرد، دواتر چاوم چووە سەر دیکۆری سەر دەرگاکە، پاشان درزە بچووکەکانی تاقی دەرەوەی پەنجەرەکەیان. کەمێکیش لەولاترەوە، ئەو دوو کورسییەی چەند ڕۆژێک پێشتر من و جەیمی لەسەری دانیشتبووین، هەر لەوێدا مابوو. ئەو دانەیەی من لەسەری دانیشتبووم و خستبوومە بەر هەتاوەکە، لە شوێنی خۆی نەجووڵابوو. دیار بوو لەو ڕۆژەوە خۆی و باوکی پێکەوە لەوێدا دانەنیشتبوون.

دواجار دەرگاکە جیڕەیەکی لێوە هات و کرایەوە. ڕوخساری هێگبێرت بە هۆی ڕووناکیی گڵۆپەکەی ژوورەوە، کە لەپشتیەوە لێی دەدا، کەمێک تاریک دەر دەکەوت. وەک پێشتریش گوتم، تەمەنی هەڵکشابوو، بە بۆچوونی من حەفتاودوو ساڵ دەبوو. یەکەمین جارم بوو ئەوها لە نزیکەوە ڕووم لە ڕووی دابێت، هەموو چرچولۆچییەکانی ڕوخساریم بەڕوونی دەبینی. پێستی بەڕاستی تەنک ببووەوە، زیاتر لەوەی پێشتر باسم دەکرد.

"سڵاو بەڕێز هێگبێرت،" لە ترس و شەرمدا تفێکم قووت دا. "هاتووم تا جەیمی ببەم بۆ ئاهەنگی دەستپێکی پشووی هاوین."

وتی، "بەڵێ، دەزانم. بەڵام سەرەتا دەمەوێت قسەت لەگەڵدا بکەم."

"بەڵێ، جەنابی هێگبێرت، منیش هەر لەبەر ئەوە هاتووم."
"وەرە ژوورەوە."

لە کڵێسا هێگبێرت گەلێک ڕێکپۆش و بەرگی جوانی لەبەر دەکرد، کەچی ئێستا، لەماڵەوە، دەتگوت کرێکارە، بەدلەیەکی لەبەردا بوو، لەگەڵ تیشێرتێکیش لەژێرەوە. کورسییەکی لە موبەقەکە هێنا و فەرمووی لێ کردم دابنیشم. وتی، "ببوورە درەنگ دەرگام لێ کردیتەوە، سەرقاڵی ئامادەکردنی وتاری سبەینێ بووم."

لەسەر کورسییەکە دانیشتم.

"گوێی مەیەرێ، جەنابی هێگبێرت،" نازانم لەبەرچی بوو، بەڵام ئیتر دەبوو بەو جۆرە ناوی بێنیت. شانوشەوکەتی وا دەهاتە پێشچاو.

وتی، "دەی باشە، باسی خۆتم بۆ بکە."

پرسیارێکی بەڕاستی گەمژانە بوو، بەتایبەت دوای ئەو هەموو تێکەڵاوییەی لەگەڵ باپیر و باوکمدا هەیبوو، دوای ئەو هەموو ساڵە، کەچی ئەم پرسیارە قۆڕەی لێ کردم. ئەو کاتەی منداڵیش بووم، هەر ئەم بوو ئاوی پیرۆزی پێدا کردم، جگە لەوەش، لە منداڵییەوە هەموو ڕۆژانێکی یەکشەممە لە کڵێسا دەیبینیم.

نەمدەزانی چ بڵێم. "بەڵێ، جەنابی هێگبێرت، من نوێنەری خوێندکارانم لە ئەنجوومەنی دەستەی خوێندکاراندا. نازانم جەیمی بۆی باس کردوویت یان نا."

سەرێکی لەقاند و وتی، "بەڵێ، بۆی باس کردووم، فەرموو، بەردەوام بە."

"ئیتر... پاییزی داهاتوو، بەنیازم بچم بۆ زانکۆی کارۆلاینای باکوور. فۆرمەکەیانم وەر گرتووە."

"ئێ، چیی تر؟"

هیچی ترم پێ نەمابوو بیڵێم. نەمدەزانی چی بکەم، سەر مێزەکە قەڵەمێکی لێ بوو، خەریک بوو هەڵی بگرم و لەسەر نووکی پەنجەم بۆی ڕابگرم و بڵێم، دەتوانم تا سی چرکە ئەوها قەڵەمیش لەسەر نووکی پەنجەم ڕابگرم، بەڵام هێگبێرت لەو جۆرە کەسانە نەبوو ئەم شتانە بچێت بە مێشکیدا. پاشان وتم، "هیچی ترم نییە، جەنابی هێگبێرت."

"پێت ناخۆش نییە گەر من پرسیارێکت لێ بکەم؟"

"نەخێر، جەنابی هێگبێرت."

هەنگێ سەرنجێکی قووڵی تێ گرتم، وەک ئەوەی بیر لە پرسیارەکەی بکاتەوە. دواجار وتی، "بۆچی داوات لە کچەکەم کردووە لەگەڵت بێت بۆ ئاهەنگەکە؟"

کە وای گوت، واقم وڕ ما، بروسکەیەکی تەلیسماوی بە ئازای گیانمدا هات.

"نازانم مەبەستت لە چییە، جەنابی هێگبێرت!"

"خۆ بەنیاز نیت هیچ کارێکی وا بکەیت، حەیا و حورمەتی کچەکەم بەریت... وا نییە؟"

بەم قسەیەی، جەرگم بچڕا. وتم، "نەخێر، جەنابی هێگبێرت. هەرگیز شتی وا ڕوو نادات. تەنیا ئەوەیە، پێویستم بە کەسێک بوو بێت لەگەڵم، ئیدی منیش داوام لەو کرد. هەر ئەوەندە."

"خۆ هیچ نیازێکی خراپت لە مێشکدا نییە؟"

"نەوەڵڵا جەنابی هێگبێرت، خوا نەکردە شتی وا لە من ناوەشێتەوە بەرامبەر جەیمی..."

ئیدی بەم جۆرە پرسیار و قسەوباسانە چەند خولەکێکمان تێپەڕاند - بەپرسیار کونی کردبووم - بەڵام لەو کاتەدا خوا کردی جەیمی لە ژوورەکەیەوە وەدەر کەوت، من و باوکیشی قسەکانمان بچڕی و سەرنجمان گواستەوە سەر ئەو. شکور بۆ خوا، هێگبێرت پەتی پرسیارەکانی بچڕا و منیش ئاهێکی ڕزگاربوونم هەڵکێشا. جەیمی تەنوورەیەکی شینی کەشخە و بلووزێکی سپیی لەبەر کردبوو، کە پێشتر ئەو جلانەم لەبەریدا نەبینیبوو. شکور ئەم جارە چاکەتە خووری و بلووزەکەی تری دانابوو. لەگەڵ ئەوەی دەشمزانی لەچاو کچەکانی تری ئاهەنگەکە، جلەکانی زۆر جوان نابێت، لێ خراپیش نەبوو. هەر وەکوو هەموو جارەکانی تر، قژی لەدواوە تەماتە کردبوو. من بۆخۆم وام پێ جوانتر بوو قژی بەر بداتەوە، بەڵام زۆر گوێم نەدەدایێ. جەیمی لەگەڵ ڕۆژانی تردا، شتێکی ئەوتۆ فەرقی نەکردبوو، تەنیا ئەوە نەبێ، کتێبی ئینجیلەکەی نەدەهێنا بۆ ئاهەنگەکە. جا خۆ بیهێنایە، خەڵک چیی پێ دەگوتین.

بە ڕوویەکی خۆش و زمانێکی شیرینەوە بە باوکی گوت، "باوکە، خۆ لاندنت بێزار نەکردووە، وا نییە؟"

پێش ئەوەی باوکی هیچ بڵێت، من وتم، "نا، تەنیا باسی هەندێک شتمان دەکرد." لە بیری خۆمدا وام ورد کردەوە، پێناچێت هێگبێرت باسوخواسی منی لای کچەکەی کردبێت، کە من چ جۆرە کەسێکم، لەم کاتەشدا لە قازانجی من نەبوو

باسی بکات.

پاش کەمێک جەیمی وتی، "دەی، ئێستا دەبێت بڕۆین."
وا بزانم ئەویش هەستی بەو گرژی و فشارە کردبوو، کە تووشی ببوم لەو ژوورەدا، بۆیە پەلەی بوو زوو ڕزگارم بکات لە دەستی. چووە لای باوکیەوە و ماچێکی کرد و پێی وت، "تا درەنگوەختانێک دامەنیشە و خۆت ماندوو بکەیت بە وتارەکەی سبەینێوە، باشە باوکە گیان؟"

باوکیشی بە دەنگێکی نەرمەوە پێی وت، "خەمت نەبێت، ئەوەندە دانانیشم." دیار بوو زۆری خۆش دەویست، هەرچەند منیش لە ژوورەکەدا بووم، کەچی گوێی نەدایە من و هەستی باوکایەتیی خۆی بۆ دەر بڕی.

خواحافیزیمان کرد، پێش ئەوەی بگەینە ئوتومبێلەکە، چەپکەگوڵەکەم پیشکەش بە جەیمی کرد و پێم گوت، کە لەناو ئوتومبێلەکە فێری دەکەم چۆن بیکات بە خۆیەوە. دەرگای ئوتومبێلەکەم بۆ کردەوە و ئەوجا خۆشم چووم سەر کەوتم. لەو ماوە کورتەدا، تا من سووڕامەوە بۆ لای دەرگای شۆفێر و سەر کەوتم، تەماشام کرد جەیمی چەپکەگوڵەکەی کردبوو بە خۆیەوە.

"ئەوەندەش نەفام نیم، قابیلە نەزانم چۆن گوڵ لە یەخەم بدەم؟"

ئوتومبێلەکەم ئیش پێ کرد و بەرەو خوێندنگە بەڕێ کەوتین، وشەکانی هێگبێرتیش لە بیروهۆشمدا هەر دەخولانەوە.

جەیمی، وەک بڵێی لە مێشکمدا بێت و بزانێت بیر لە چی

دەکەمەوە، وتی، "باوکم زۆر تۆی خۆش ناوێت."

بێ ئەوەی هیچ بڵێم، سەرێکی ئەرێنیم لەقاند.

"باوکم وا دەزانێت تۆ کەسێکی، هەست بە لێپرسراوێتی ناکەیت."

جارێکی دی تەنیا سەرم لەقاندەوە.

"حەزی بە چارەی باوکیشت نییە."

ئەم جاریش تەنیا سەرێکم لەقاند و هیچی تر.

"حەزی بە تێکەڵاویی خێزانەکەشتان نییە."

تەنیا سەرلەقاندن و هیچ...

دواتر وتی، "بەڵام دەزانی من چۆن بیر دەکەمەوە؟"

پەژارە دای گرتبووم، وتم، "نا، نازانم."

"بە بڕوای من، هەموو ئەم شتانە قەدەری خوای گەورەن، بە بڕوای تۆ، دەبێت چ قەدەرێک بێت؟"

ڕاستتان دەوێ، بڕوا ناکەم لەو ئێوارەیە ناخۆشتر دووبارە ببێتەوە. زۆربەی برادەرانم خۆیان دوورەپەرێز دەگرت، ئێ جەیمییش هاوڕێی نەبوو تا دوو دەمەتەقێی لەگەڵدا بکات، بۆیە زۆربەی کاتمان بەتەنیا گوزەراند. لەوەش خراپتر، ئامادەبوونی من لەوێ، چیی تر گرنگییەکی ئەوتۆی نەمابوو. بە هۆی ئەوەی کێری کچەهاوڕێییەکی دەست نەکەوتبوو ژوانی لەگەڵ ببەستێت، هەموو یاساکانیان گۆڕیبوو، منیش کە ئەمەم زانی، خەفەت دای گرتم. نەشمدەتوانی بەو کاتە زووە جەیمی ببەمەوە بۆ ماڵەوە لەبەر قسەکانی باوکی، جا دەمتوانی شتی وا بکەم؟ لە لایەکی تریشەوە، دەمبینی جەیمی لەوێ گەلێک دڵی خۆش بوو، نەدەکرا لێی تێک بدەم.

دیکۆر و شێوەی ڕازاندنەوەی هۆڵی ئاهەنگەکەی گەلێک لا جوان بوو، مۆسیقاکەشی زۆر لا خۆش بوو، هەموو شتی ئاهەنگەکەی بە دڵ بوو. بەردەوام پێی دەگوتم، کە شتەکان چەند دڵفرێن و جوانن، داواشی لێ کردم، کە ڕۆژێک، گەر توانیم، یارمەتیی بدەم کڵێساکەش ئەوها برازێنمەوە بۆ یەکێک لە ڕێورەسمە کۆمەڵایەتییەکان. منیش بە دەنگێکی نزم و لەژێر لێوەوە پێم گوت، هەرکاتێک ویستی، دەتوانێت تەلەفونم بۆ بکات، گەرچی بە ساردوسڕییەکەوە وام گوت، کەچی ئەو زۆر بەگەرمی سوپاسی دڵسۆزییەکەی کردم. ڕاستییەکەی، ئەو ئێوارەیە هەتا کاتژمێری یەکەمیش، هەر ماتومەلوول بووم، بەڵام جەیمی لەوە نەدەچوو هەستی پێم کردبێت.

ئەو ئێوارەیە جەیمی دەبوو کاتژمێر یازدەی شەو لەماڵەوە بێت، واتە کاتژمێرێک پێش ئەوەی ئاهەنگەکە کۆتایی بێت، بۆ منیش کەمێک ئاسانتر بوو. هەر کە دەنگی مۆسیقا بەرز بۆوە و دەست کرا بە سەما، دەر کەوت جەیمی سەماکەرێکی گەلێک لێهاتوو بوو لەچاو ئەوەی یەکەم جاری بوو سەما بکات. لەگەڵ هەر جووڵە و ئاوازی گۆرانییەکاندا، ئەویش بە هەمان ڕیتم لەگەڵمدا دەر دەچوو. دواتر چووین لەسەر مێزەکان دانیشتین و گفتوگۆیەکی کراوەمان دەست پێ کرد. ئیدی باسەکانی ئەو بریتی بوون لە بابەتی بڕواداری و دوورکەوتنەوە لە کردەوەی خراپ و باسی یارمەتیدانی منداڵانی هەتیوی هێنایە پێشێ، لەگەڵ ڕزگارکردنی ئەو گیاندارانەی لەسەر شەقامەکان دەکەونە

بەر مەترسیی ئۆتومبێلەوە، لەگەڵ ئەوەشدا، تا بڵێی دڵی خۆش بوو.

بۆیە، شتەکان ئەوەندە خراپ نەبوون، کە پێشتر پێشبینیم دەکرد، تا ئەو کاتەی لیۆ و ئەنجێلا هاتنە لامان، ئیدی هەموو شتێکمان لێ تاڵ بوو.

کە ئێمە گەیشتین، ئەوانیش پاش ماوەیەک وەدیار کەوتن. لیۆ دیسان ئەو تیشێرتە ناشرینەی لەبەر کردبووەوە، کە وێنەی کۆمەڵێک وشتری لەسەر قۆڵەکان نەخشێنرابوو، هۆقەیەک جێلیشی دابوو لە قژی. ئەنجێلاش هەر لەسەرەتای ئاهەنگەکەوە خۆی بە قۆڵیدا هەڵواسیبوو، لێی نەدەبووەوە، کەریش دەیزانی پێش ئەوەی بێت بۆ ئەوێ، تۆزێکی خواردبووەوە. دەستێک جلوبەرگی گرانبەهای لەبەر کردبوو - دایکی لە سالۆنی ژنان کاری دەکرد، کام مۆدێلەی شاز بوو، دەستی دەکەوت - بینیم تۆپەڵێک بنێشتی لەدەم نابوو، بە مەکرێکی ژنانەوە دەیجوو. بەڕاستی باش دەیجوو، دەتگوت مانگایە کاوێژ دەکات.

کاکە لیۆ دەستپێشخەریی کرد و دەستی دایە بتڵی خواردنەوەکە، هێندی پێ نەچوو، زۆرێکی تریش سەرمەست بوون. تا مامۆستاکان فریا کەوتن، بتڵەکان چۆڕبڕ کرابوون، هەریەکە بە لایەکدا لەتری دەدا. کە بینیم ئەنجێلا دەستی دایە بتڵێکی تریش، گوتم بە خودا تەواو، کار لە کار ترازا. گەرچی ئەم کچە وازی لە من هێنابوو بۆ کوڕێکی تری وەک لیۆ، بەڵام حەزم نەدەکرد بەڵایەکی بەسەر بێت. ئەو یەکەمین کچ بوو لە ژیانمدا ماچم کردبێت، هێشتا هەستم

بۆی دەجوولا.

لەگەڵ جەیمی دانیشتبووم، لەبارەی خولی فێربوونی ئینجیل قسەی بۆ دەکردم، ئەمنیش بەئەستەم خەیاڵم لای بوو، بە تیلەی چاوێک هەر تەماشای ئەنجێلام دەکرد، لەناکاو لیۆ هەستی پێ کردم. ئەویش ڕاست ناوقەدی ئەنجێلای گرت و هاتە لای مێزەکەمانەوە، بە مۆڕەوە خێسەیەکی لێ کردم و بە زمانێکی شەڕەنگێزییەوە وتی، "دەبینم تەماشای کچەهاوڕێکەم دەکەیت؟"

"نا، تەماشام نەکردووە."

ئەنجێلا هەڵی دایێ و بە وشەی بچڕبچڕەوە وتی، "بەڵێ، سەیری دەکردم، ڕاست تەماشای منی دەکرد. ئەمە کوڕەهاوڕێکەی پێشووترمە، کە بۆم باس کردی، لیۆ."

کەمێکی تر لێم هاتە پێشێ و وەک چۆن هێگبێرت لێم ورد بووەوە، ئەمیش ئەوها تەماشایەکی بەمەغزای کردم. بە گاڵتەجاڕییەکەوە وتی، "کەواتە ئەمە تۆیت."

ئەوەشتان پێ بڵێم، من کوڕێکی شەڕانی نەبووم. تەنیا شەڕ تووشی هاتبم، لە پۆلی سێ بووم، جا پێش ئەوەی لێدانیش بخۆم، دەستم کرد بە گریان. ڕاستییەکەی، بە هۆی ئەو سروشتە هێمنەی هەمبوو، هەمیشە خۆم بەدوور دەگرت لە کێشە و ئاژاوە و کەمتریش تووشی شتی وا دەبووم، جگە لەوەش، هەرکاتێک ئێریکم لەگەڵدا بووایە، کەس زاتی نەدەکرد لێم نزیک ببێتەوە. بەڵام لەم کاتەدا ئێریک دیار نەبوو، نازانم لەگەڵ مارگرێت چییان لێ هاتبوو. وا بزانم چووبوونە کورسییەکانی پشتەوە دانیشتبوون.

وتم، "من سەیرم نەدەکرد، ناشزانم چیی پێ گوتوویت، بەڵام هەرچییەک بێت، ڕاست نییە."

سەرنجی لێ ورد کردمەوە و وتی، "کەواتە دەتەوێت بڵێیت ئەنجێلا درۆ دەکات؟"

خوایە تووشی چ بەڵایەک بووم.

چاوەڕوانم بووم ڕاست پێمدا بکێشێت، بەڵام خوا کردی جەیمی هاتە نێومانەوە. تەماشایەکی ئەوی کرد و بە ڕوویەکی خۆشەوە پێی وت، "وا بزانم تۆ دەناسم." جەیمی جاری وا هەبوو هەرچییەک ڕووی بدایە، گوێی پێ نەدەدا. "ئا، ئێستا بیرم کەوتەوە، تۆ ئەو کوڕەیت کە لە گەراجەکە کار دەکەیت. باوکیشت ناوی جۆیە. ماڵی ئەنکیشت لە شەقامی فۆستەرە، لە دووڕییانی هێڵی شەمەندەفەرەکە."

لیۆ تەمێکی سەرسامی ڕوخساری داگرت، دونیای لێ هاتبووەوە یەک، دەیویست بیروهۆشی یەک بخاتەوە. ئەوجا وتی، "چۆن هەموو ئەم شتانە دەزانی؟ ئەمە پێی گوتوویت؟"

جەیمی وتی، "نەخێر، بێعەقڵ مەبە،" بە قسەکەی خۆی پێکەنی. تەنیا جەیمی لەم جۆرە حاڵەتانەدا دەیتوانی پێبکەنێ و هەڵنەچێت. "لە ماڵی ئەنکت وێنەیەکی تۆم بەرچاو کەوت. جارێکیان لەوێوە دەڕۆیشتم، ئەنکیشت لە بازاڕ هاتبووەوە، شتی کڕیبوو، بانگی کردم یارمەتیی بدەم شتەکانی لەگەڵ ببەمە ژوورەوە، ئیتر وێنەکەی تۆم بینی لەسەر تاقی ئاگردانەکە دانرابوو."

لیۆ بەدیار جەیمییەوە، وشک ببوو، لە سەرسامیدا بە جۆرێک تەماشای دەکرد، وەک بڵێی کلک و گوێ لەو کچە

ڕوابێ.

جەیمی لەو کاتەشدا، بە دەستی باوەشێنی خۆی دەکرد. ئەوجا وتی، "هاتین لێرە دانیشتین تا دوور لەو جەنجاڵی و بەزم و سەمایە کەمێک پشوو بدەین. بۆنی هەناسە ئەوێی گەرم کردووە. حەز دەکەیت بێیت لەگەڵمان دابنیشیت؟ دوو کورسیی تریشی لێیە. حەز دەکەم هەواڵی نەنکیشت بزانم."

جەیمی گەلێکی پێ خۆش بوو، کە زانیی لێو سەری لێ هاتبووەوە یەک و نەیدەزانی چ بکات. بە پێچەوانەی ئێمەوە کە بەم جۆرە شتانە ڕاهاتبووین، لێ ئەو بە تەمەنی تووشی کەسێکی وەک جەیمی نەببوو. چاوەکانی بڵیسەی ئارەزووی پەلاماردان و هەڵمەتبردنیان لێ دەر دەپەڕی، تیا مابوو بێت شالاوم بۆ بێنێت و بکەوێتە سەروگوێلاکم، یان دابنیشێت و هیچ نەڵێت.

ئەنجام، پەلی ئەنجێلای گرت و بە قونی خۆیدا کێشا و ڕۆیشت. ئەنجێلا، ماڵی وێران بێت، ئەوەندەی خواردبووەوە، هەر بیریشی چووبووەوە حاڵ و مەسەلە چی بوو و چۆن دەستی پێ کرد. تەماشامان کردن تا دوور کەوتنەوە، ئەوجا ئاهێکم هەڵکێشا. منیش هێند وشک ببووم، بە جۆرێک، ئاگام لە خۆشم نەمابوو کە هەناسەی خۆم گرتبوو.

بە دەنگێکی لەرزۆک و شەرمەزارییەوە وتم، "سوپاس بۆ هەموو شتێک." وا ئەم جارە جەیمی لە شەڕێکی دەستەویەخە ڕزگاری کردم. ئەو نەبووایە، شەقی چاکم دەخوارد.

بە سەرسامییەوە ڕووی تێ کردم و وتی، "سوپاس بۆ

چی؟" کە زانیی هیچم پێ نەبوو بیڵێم، گەڕایەوە سەر باسی سەنتەری فێروونی ئینجیل، وەک بڵێی نە بای دیبێ و نە باران. بەڵام ئەم جارە بە پێچەوانەی پێشتر، هەستم کرد بیروهۆشم بەلای قسەکانیدا دەچێت، ئەویش تەنیا یەک گوێم لای بوو، هەر ئەوەندەم پێ دەکرا.

ئەو ئێوارەیە، ئەنجێلا و لیۆ خۆیان کردبوو بە فیلمی ئەو عالەمە، هەر ئەوەندە نەبوو کە خەریک بوو شەڕ بە ئێمە بفرۆشن. ئەنجێلا هێندی خواردبووەوە، دیار بوو زۆری بۆ هێنابوو، هەر ئەوەندەت زانی لە تەوالێتی کچەکان، هەرچیی دەرد کردبوو، بە ڕشانەوە هێنایەوە. لیۆش کە خۆی بە شت دەزانی، هەر کە گوێی لە کچەهاوڕێکەی بوو هێڵنج دەدا و دەرشێتەوە، کەس نەیزانی چیی لێ هات. لەکوێوە هاتبوو، تا توانیی تێی تەقاند. ئیتر هەر ئەو جارە بوو، دواتر نەمدییەوە. قەدەری خوا وا بوو، جەیمی چووە تەوالێتەکە و ئەنجێلای بینی، دیار بوو حاڵی زۆر باش نەبوو. تەنیا شت پێمان دەکرا، ئەوە بوو پێش ئەوەی مامۆستاکان پێی بزانن، پاکی بکەینەوە و بیبەینەوە بۆ ماڵەوە. ئەو دەمانە گەر مەست و سەرخۆش بوویتایە و پێیان بزانییایە، دانی خێریان پیا نەدەنایت، هەندێک جاریش ئەخیری خێر نەبوو، لە قوتابخانە دەریان دەکردیت.

لێ جەیمی، ماشاڵڵا لەو دڵە سافەی، نەیدەویست کار بگاتە ئەوە. گەر پێشتر لە منتان بپرسیبایە، دەمگوت جەیمی لاقەی ناکات، چونکە ئەنجێلا جارێ تەمەنی نەببووە هەژدە ساڵ و بەمەش پێشێلی یاساکانی هێگبێرتی کردبوو.

یاسایەکی تریشی شکاندبوو، بەوەی ڕەفتاری نابەجێی نواندبوو. هێگبێرت گەر کەسێکی بدیتبا بخواتەوە یان پێشێلی یاسایەکی کۆمەڵایەتی بکات، ئیتر دەهری دەبوو، دەماری ملی هەڵدەستا، هەرچەند وەک مەسەلەی زیناکردن شێت نەدەبوو پێی، لێ هەموو چاک دەمانزانی چەند پەست و کەللەیی دەبوو پێی. بۆیە بڕوامان وا بوو، جەیمییش بە هەمان شێوەی باوکی تێڕوانینی بۆ ئەو کارە نابەجێیانە بەو جۆرە بێت. ڕەنگە واش بێت، بەڵام دیارە غەریزەی یارمەتیدانی زاڵە بەسەر ئەو تێڕوانینەیدا. وەک چۆن هەموو کات بە هانای هەرشتێکەوە دەچوو، ئاوهاش بەهانای ئەنجێلاوە چوو و یارمەتیی دا. ئەمنیش چووم ئێریکم لەسەر کورسییەکانی پشتەوە دییەوە، بانگم کرد و هێنام لە بەردەرگای تەوالێتەکە دام نا، تا من و جەیمی چووین ڕشانەوەکەی ئەو کچەمان پاک کردەوە. ماڵی نەشێوێ، خۆ ئەو ئەرزەی هەموو تێوە نابوو. دیوار و ئەرز و بگرە سەقفەکەیشی نەهێشتبوو. ئیدی بیهێننە بەر زەین، دەبێت چ دیمەنێکم هەبووبێت، ئەوەی لێی دەترسام، تووشم هات، لە ئاهەنگی کۆتاییی ساڵدا، بە قاتێکەوە کەوتبوومە سەر ئەرزەکە و جێڕشانەوەی خەڵکم پاک دەکردەوە. ئاخیری هەر بوو بە نسیبم. جەیمییش لەگەڵمدا بە هەمان شێوە.

لە شوێنێکەوە، لە دوور، پێکەنینە گڕ و بچڕبچڕەکەی کێری دەهاتە بەر گوێم.

تا مامۆستاکان پێیەزانن لە دەرگای پشتەوەی هۆڵەکەوە ئەنجێلامان بردە دەرەوە، هەردوو چووبووینە بنباڵی و

هەرچۆنێک بێت، گەیاندمانە دەرێ، بەردەوام لەبەر خۆیەوە دەیگوت لیۆ لەکوێیە؟ بەڵام جەیمی دڵنەواییی دایەوە و پێی گوت خەمی نەبێت. گەلێک بە نەرمی و زمانێکی شیرین و ئارامبەخشەوە لەگەڵی دەدوا، کەچی ئەو کچە ئەوەندەی خواردبووەوە، هەر نەشیدەزانی کێیە قسەی بۆ دەکات. هەڵمان دایە کورسییەکانی پشتەوەی ئوتومبێلەکەم و زۆری پێ نەچوو، جارێکی دی ڕشایەوە. دواتر بەیەکجاری سەرخۆش بوو و ئاگای لە خۆ نەما، دەتگوت بووراوەتەوە. بۆنی ڕشانەوەی هێند ناخۆش بوو، ناوسکی بەر دەدایتەوە، ناچار جامی ئوتومبێلەکەمان هەموو کردەوە، تا گەیشتینە ماڵی ئەنجێلا، ئەو ڕێگەیەمان بە ساڵێک لێ ڕۆیشت. دایکی دەرگای لێ کردینەوە، تەماشایەکی کچەکەی کرد، ئەوجا بێ ئەوەی سوپاسێکی لە زار بێتە دەر، پەلی گرت و وەژوور کەوتن. دیار بوو دایکیشی هەستی بە شەرمەزاری دەکرد، بۆیە هیچی نەگوت، ئێمەش هیچمان نەگوت، حاڵەتەکە خۆی بۆخۆی شایەتی حاڵ بوو.

ئەو دەمەی بردمانەوە و ڕادەستی دایکیمان کرد، کاتژمێر دە و چلوپێنج خولەک بوو، ئیدی ڕاست گەڕاینەوە بۆ ماڵی جەیمی. کە گەیشتینە جێ، هەر خەمم بوو، چونکە هەردووکمان بۆنی ڕشانەوەمان لێ دەهات، لە دڵی خۆمدا نزام کرد، خوایە گیان هێگبێرت بێدار نەبێت و بەم حاڵەوە بمانبینێت. تاقەتی ئەوەم نەبوو حاڵ و مەسەلەی تێبگەیەنم. ڕەنگە گەر جەیمی بۆی باس بکردایە، گوێی لەو بگرتایە، لێ بە خودا هەستم دەکرد گەر من بۆی باس بکەم، دەتەقێتەوە

بەسەرمدا.

بەرەو دەرگاکەیان بەڕێم کرد، لەوێ، لەبەر ڕووناکیی گڵۆپەکەی دەرەوە، هەنگێ ماینەوە. جەیمی قۆڵی لێک ئاڵاند و بزەیەکی کرد، وەک بڵێی لە پیاسەی ئێوارەیەکی ڕۆمانسییانە هاتبێتەوە و تەماشای جوانییەکانی سروشتی کردبێت.

وتم، "تکا ئەکەم بۆ باوکتی باس مەکە."

ئەویش وتی، "نا خەمت نەبێت، باسی ناکەم." بزەی پێکەنینەکەی هەر لەسەر لێو بوو. "ئەمشەو کاتێکی خۆشم بەسەر برد. سوپاس کە منت برد بۆ ئاهەنگەکە."

فەرموو، ئەوەتا جەیمی هەموو گیانی ڕشانەوەی ئەو کچەیە و کەچی هێشتا سوپاسم دەکات. جاروبار ئەم جەیمییە بەڕاستی پیاوی شێت دەکرد.

## ٤

لە ماوەی ئەو دوو هەفتەیەی دوای ئاهەنگەکە، ژیانم گەڕایەوە باری ئاسایی خۆی. باوکم ڕۆشتبووەوە بۆ واشنتۆن دی سی، ئیدی ڕۆژ ڕۆژی من بوو لەماڵەوە، چونکە بە ئارەزوی خۆم شەوان درەنگ لە پەنجەرەکانەوە خۆم فڕێ دەدایە ئەودیوەوە و ڕام دەکرد بۆ گۆڕستانی پشت کڵێساکە و لەوێ دەستم دەکردەوە بە خووەکەی جارانم. نازانم ئەم گۆڕستانە چیی تیا بوو، ئێمە ئاوها دڵمان پێی دەکرایەوە. ڕەنگە بە هۆی کێڵی گۆڕەکانەوە بووبێت، کە دەچووین لەسەریان دادەنیشتین.

گەلێک جار دەچووینە سەر گۆڕی بنەماڵەی پرێستن، نزیکەی سەد ساڵ دەبوو، لەوێدا نێژرابوون. هەشت کێلی قەبری لێ بوو، هەموویان بە شێوەیەکی بازنەیی دانرابوون، بۆیە کە چەرەسمان دەخوارد، ڕوومان لە یەکدی بوو و بەئاسانییش دەمانتوانی بیدەین بە یەکتر. جارێکیان لەگەڵ برادەرکانمدا بڕیارمان دا بزانین ئەم بنەماڵەی پرێستنە کێن و چین، لەبەر ئەوە چووین بۆ کتێبخانەکە، بەڵکوو شتێکیان

لەسەر نووسرابێت. ئێ بۆخۆشتان دەزانن، گەر تۆ لەسەر کێلی قەبری کەسێک دانیشیت، خۆ هیچ نەبێت دەبێ شتێکی لەبارەوە بزانیت، وا نییە؟

ڕاستیەکەی، لە تۆمارە مێژووییەکاندا، شتێکی ئەوتۆمان نەدۆزییەوە لەبارەی ئەم بنەماڵەیەوە، جگە لە زانیارییەکی گرنگ نەبێت. هێنری پرێستن، کە سەرگەورەی بنەماڵەکە بوو، کابرایەکی داربڕی یەکقۆڵ بوو، داری دەبڕییەوە، جا بڕوا دەکەن یان نا، ئەوە بە دڵی خۆتان. بەپێی ئەو نووسراوە، لە داربڕیندا توانای هێندەی کەسێکی ساغ و سەلامەتی هەبووە. کە مێژووی ئەو پیاوە یەکقۆڵەمان لا ڕوون بووەوە، ئیدی گەلێکمان باس کرد. دەمانگوت تۆ بڵێی بەو یەک قۆڵەوە چیی تری توانیبێت بیکات؟ بە کاتژمێر دادەنیشتین باسمان دەکرد، تۆ بڵێی چەند بەخێرایی مەلەی کردبێت، یاخود چەند بەتوندی تۆپی بەیسبۆڵی هەڵدابێت. بۆخۆشم دانی پێدا دەنێم، قسەوباسەکانمان پووچ و بێمانا بوون، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا چێژمان لێ دەبینی.

جارێکیان شەوی شەممە بوو، من و ئێریک لەگەڵ چەند برادەرێکی تردا لەوێ دانیشتبووین، چەرەسمان دەخوارد و باسی بنەماڵەی هێنری پرێستنمان دەکرد. ئێریک پرسیاری ڕۆژی ئاهەنگەکەی لێ کردم، گوتی لەگەڵ جەیمی چۆنت بەسەر برد؟ لە ڕۆژی ئاهەنگەکە بەدواوە، بە هۆی خولی یاریی کۆتاییی قوتابخانەکانەوە، من و ئێریک زۆر چاومان بە یەکدی نەکەوتبوو، چونکە ئێریک ڕۆژانی پشووی هەفتە لەگەڵ تیمی یارییەکەدا دەچوونە دەرەوەی بیوفۆرت، بۆیە

زۆر ڕێکەوتی یەکمان نەکردبوو.

منیش بە شانهەڵتەکاندنێکەوە وتم، "خراپ نەبوو." هەوڵم دەدا تا بتوانم کارێک بکەم، هەست بە هیچ نەکات.

ئێریک ئانیشکێکی بەمەغزای گرتە کەلەکەم، خەریک بوو پەراسووم بشکێنێ، ئەو زۆر لە من زل و کەتەتر بوو. وتی، "ئەی ماچی شەوشادت لێ کرد؟"

"نا."

قومێکی درێژی لە قووتووی بیرەکەی دا. نازانم چۆن ئەمەی پەیدا کرد، ڕاستییەکەی، ئێریک کێشەی نەبوو لە کڕینی بیرە، چونکە هەموو خەڵکی شارۆچکەکە دەیانزانی تەمەنی لە هەژدە هەڵکشابوو، بۆیە کەس لێی نەدەپرسییەوە. بە پشتی دەستی، دەمی سڕی و بەتیلەی چاوێک نیگایەکی کردم.

وتی، "بە بڕوای من، دوای ئەوەی یارمەتیی داویت لە پاککردنەوەی تەوالێتی خەڵک، هیچ نەبێت تۆش دەبوو ماچێکی شەوشادت بکردایە."

"وەڵا ئیتر نەمکرد."

"هەوڵیشت بۆ نەدا؟"

"نەوەڵڵا."

"بۆچی؟"

منیش وتم، "جەیمی لەو جۆرە کچانە نییە." هەرچەند ئەمە ڕاستییەک بوو هەموو دەمانزانی، کەچی هێشتا وا دەر دەکەوت من پاکانەی بۆ بکەم.

ئێریک لە قسەکانم تێگەیشت.

وتی، "هەست دەکەم دڵت بۆی لێدەدا."

منیش وتم، "قسەی قۆڕ مەکە."

بە شۆخییەوە چەپۆکێکی بە پشتمدا کێشا، خەریکبوو هەناسەم ببڕێ. هەرکاتێک لەگەڵ ئێریک بچوومایەتە دەر، بەگاڵتەوە هێندەی پێدا دەکێشام، بۆ ڕۆژی دوایی شوێنی چەپۆک و مستەکۆڵەکانی شین و مۆر دەبوونەوە.

چاوێکی بەمەغزای لێ داگرتم و وتی، "بەڵێ، ڕاست دەکەیت، قسەی قۆڕ دەکەم. بەڵام دونیا قسەم بۆ بکات، دڵت بۆی لێدەدا."

زانیم خەریک بوو دەچووینە سەر بابەتێکی ترسناک.

وتم، "تەنیا ویستم مارگرێت دڵی شەق بەرێت، لەم دواییانەدا زۆری نامەی دڵداری بۆ ناردبووم، هەر لەبەر ئەوەش بوو جەیمیم لەگەڵ خۆم برد، وا بزانم سەریشی گرت."

ئێریک بەدەم قاقایەکی بەرزەوە، چەپۆکێکی جەرگبڕی تری پێدا کێشام. هەر بە جارێک ناوسکی بەردامەوە. وتی، "تۆ و مارگرێت - شتێکی پێکەنیناوییە..."

باش بوو خۆم لە گوللەیەکی وێڵ ڕزگار کرد. ئەوجا کە باسەکەش بە لایەکی تردا چوو، ئاهێکی ڕزگاربوونم لەو بابەتە پێدا هاتەوە. ناوبەناو خۆم هەڵدەدایە نێو باسەکەوە، لێ لە ڕاستییشدا نەمدەزانی باسی چ دەکەن. بەڵکوو قسەکانی ئێریک بە گوێمدا دەزرینگانەوە و بیروهۆشمی مەشغوڵ کردبوو.

ڕاستە ئەو شەوە جەیمی باشترین کەس بوو ژوانی

لەگەڵ ببەستم و پێکەوە بچین بۆ ئاهەنگەکە، بەتایبەت کە تووشی ئەو بەڵایەش بووین. ئەوەی جەیمی ئەو ئێوارەیە کردی، هیچ کەسێکی تر هەر بیرێشی نەدەهات بیکات. بەڵام خۆ ئەمە ئەوە ناگەیەنێت من دڵم بۆی لێبدات و بکەومە داوی خۆشەویستییەوە. بگرە لە ڕۆژی ئاهەنگەکە بەدواوە، هەر قسەشم لەگەڵدا نەکردەوە، جگە لەوەی ڕۆژێکی تر لە وانەی دراما چاوم پێی کەوت، ئەو ڕۆژەش تەنیا چاکوچۆنییەکی سادە و هیچی تر نەبوو. ئیدی تا ئەو کاتە، ڕووی دەمم لێ نەکردەوە. باشە گەر دڵم بۆی لێبدایە و خۆشم بویستایە، دەچووم قسەم لەگەڵدا دەکرد و پێم دەگوت. گەر خۆشم بویستایە، هەموو ڕۆژێک تاماڵەوەم دەگەیاند. گەر خۆشم بویستایە، هەموو ئێوارەیەک دەمبرد بۆ کافتریایەک و کێک و قاوەمان پێکەوە دەخوارد. بەڵام من هیچ نیازێکم لە دڵدا نەبوو. بەڵێنم بە هێگبێرتی باوکی دابوو، کە هیچ نیازێکی خراپ نەخەمە مێشکمەوە.

بۆ ڕۆژی دواتر، واتە یەکشەممە، لە ژوورەکەی خۆمدا سەرقاڵی پڕکردنەوەی فۆڕمی زانکۆی کارۆلاینای باکوور بووم. جگە لە نمرەکانی قۆناغی ئامادەیی و زانیارییەکانی خۆشم، داوای پێنج دارشتنیان لێ دەکردی لەسەر فۆڕمەکە. وەک، گەر لە مێژوودا بتوانی چاوت بە کەسێک بکەوێت، چ کەسێکت هەڵدەبژارد؟ گرنگترین ڕووداوەکانی ژیانت باس بکە و پێمان بڵێ بۆچی بەو جۆرە هەستی پێ دەکەیت؟ پرسیارەکان چاوەڕوانکراو بوون - مامۆستای وانەی ئینگلیزیمان پێشتر بۆی باس کردبووین.

لە قوتابخانە، لەنێو هەموو وانەکانی تردا، زیاتر حەزم بە ئینگلیزی دەکرد. هەر لە پۆلی یەکەمەوە تا ئەو کاتە، نمرەکانی ئینگلیزیم لە نەوەد کەمتر نەبوون، جا کە زانیم پرکردنەوەی فۆرمەکە گرنگییەکی زۆر دەدات بە نووسین، گەلێک دڵم خۆش بوو. گەر بیرکاری بووایە، لێتان ناشارمەوە، حاڵم شڕ دەبوو. لەبەر ئەوە نا بڵێم لە بیرکاریدا تەمبەڵ بووم، خۆ لە هەموو تاقیکردنەوەیەکیشدا لە شەست کەمترم نەدەهێنا، بەس ئیتر حەزم لێی نەبوو.

بە هەرحاڵ، لەو ساتەدا کە سەرقاڵی نووسینەوەی یەکێک لە دارشتەکان بووم، زەنگی تەلەفۆنەکە لێی دا. هەر ئەو تەلەفونەشمان هەبوو، لە موبەقەکە دامان نابوو، بۆیە دەبوو بەڕاکردن بچمە خوارەوە و فریای وەڵامدانەوەی بکەوم. کە دەسکی تەلەفۆنەکەم هەڵگرت، هەناسەم هێند سوار ببوو، بە جۆرێک، دەنگەکەم باش نەدەناسییەوە، لە دەنگی ئەنجێلا دەچوو. ڕاست پێکەنینم بە خۆم هات. گوتم دیارە دەیەوێت سوپاسم بکات بۆ ئەو ڕۆژەی ڕشایەوە و گەیاندمە ماڵەوە یان ڕەنگە بیەوێت پێکەوە بچینە دەرەوە شتێک بخۆین، بۆیە تەلەفۆن دەکات.

"لاندن؟"

خۆم تێک نەدا و وتم، "بەڵێ، سڵاو. چۆنی؟"

دەنگەکەی تر بۆ ئێستێکی کورتی کرد و هیچی نەگوت، دواتر وتی، "چۆنیت؟"

ئەوجا بۆم دەر کەوت، ئەمە ئەنجێلا نییە. بەڵکوو جەیمی بوو، خەریک بوو تەلەفۆنەکەم لە دەست بکەوێتە خوارەوە.

درۆتان بۆ ناکەم، ناڵێم کە گوێم لە دەنگی بوو شاگەشکە بووم، کەمێکیش بیرم کردەوە، باشە تۆ بڵێی ژمارەی تەلەفۆنەکەی ئێمەی چۆن دەست کەوتبێت؟ تا دواتر گوتم، لەوە دەچێت لە تۆماری زانیاریی کڵێساکە دەری هێنابێت.

"لاندن؟"

هێشتا تەلیسمی سەرسامییەکە بەری نەدابووم، بەپەلە وتم، "من باشم."

"ئێستا دەستت گیراوە؟"

"تەقریبەن."

"بەڕاست... دەی باشە..." قسەکانی بڕی.

منیش وتم، "فەرموو، بۆچی تەلەفۆنت کرد؟"

ئێستێکی کورتی کرد، پاشان وەڵامی دامەوە. "گوتم بزانم گەر بۆت بکرێت، ئەم دوای نیوەڕۆیە سەرێکم لێ بدەیت."

"سەرێکت لێ بدەم؟"

"بەڵێ، بۆ ماڵەوە."

"بۆ ماڵەوەتان؟" هیچ تەقەللایەکیشم نەدا سەرسامییەکەم لە دەنگمدا بشارمەوە. جەیمی گوێی نەدایە و بەردەوام بوو. "شتێک هەیە دەمەوێت لەگەڵتدا باسی بکەم. گەر زۆر گرنگ نەبووایە، پێم نەدەگوتیت."

"ئەی ناتوانیت ئێستا بە تەلەفۆن پێم بڵێیت؟"

"بە تەلەفۆن باس ناکرێت."

تەقەلـلام دا خۆمی لێ بدزمەوە، وتم، "وەڵڵایی جا ئەم دوای نیوەڕۆیە بەنیازم ئیش لەسەر فۆڕمی زانکۆی

کارۆلاینا بکەم."

"ئاخر، وەک پێم گوتیت، شتێکی گرنگە، بەس مادام ئەمڕۆ بۆت ناکرێ، دووشەممە لە قوتابخانە خۆم دەتبینم..."

کە وای گوت، ئیتر زانیم وا بەئاسانی لە کۆڵم نەدەبووەوە و هەرچۆنێک بێت، یەخەم دەگرێت. بیروهۆشم بە هەموو لایەکدا پەرت بوو، نەمدەزانی بڕیاری کامیان بدەم، بچم بۆ ماڵیان و لەوێ قسە بکەین، یان ئەوەتا لە قوتابخانە، لە بەرچاوی برادەرەکانم یەکتر ببینین. هەرچەند هیچکام لەم دووانە بۆ من باش نەبوون، لێ شتێکی دیکەم بە زەیندا هات، وەبیرم هاتەوە، کە جەیمی پێشتر لە تەنگانەدا فریام کەوتبوو، بۆیە هەرچییەک بێت، دەبێت منیش ئەم جارە بە دڵی ئەو بکەم.

جا بۆیە هیچ پێویستی نەدەکرد هاوڕێکانی قوتابخانەم بزانن باسی چی دەکەین و پێکەوە بمانبینن، لەبەر ئەوە دەمودەست وتم، "زۆر باشە، ئەمڕۆ دەتبینم..."

تەگبیرمان کرد کاتژمێر پێنجی ئەو پاشنیوەڕۆیە چاومان بەیەک بکەوێت، ئیتر ئەو دوانیوەڕۆیە کاتم لێ نەدەڕۆیشت. کات دەتگوت دڵۆپ دڵۆپ لە فانۆسێکی چینییەوە دەتکێ. بیست خولەک پێش وادەی خۆی لە ماڵ دەر چووم، تا لە کاتی خۆیدا بگەمە جێ. ماڵی ئێمە نزیک کەناری دەریاکە بوو، کە بەشێکی مێژوویی بوو لە شارۆچکەکە، تەنیا چەند خانوویەک لەخوار ئەو شوێنەی دەیانگوت چەتەیەکی دەریایی، بە ناوی کابرای ڕیشڕەش، تێیدا ژیاوە. بەسەر ئاوی ڕووباری ئینتراکۆستڵدا دەیڕوانی. ماڵی ئەوانیش لەو

بەشەی تری شارۆچکەکە بوو، لەوبەر چوارڕێیانی هێڵی شەمەندەفەرەکانەوە، بۆیە پێم دەچوو تا دەگەیشتمە ماڵیان.

ئەو دەمە کەوتبووینە مانگی تشرینی دووەم، دونیاش بەرەو فێنکی دەچوو. سیفەتێکی شارۆچکەی بیوفۆرت، کە زۆرم بە دڵ بوو، ئەوەیە ساڵ دوازدەی مانگ وەرزی بەهار و پاییز بوو، ڕاستە لە هاویناندا جاروبار پلەی گەرما کەمێک بەرز دەبووەوە، یاخود جاری وا هەبوو شەش ساڵ جارێک لە مانگی کانوونی دووەمدا سەرمایەک هەڵی دەکرد و بەفری تێ دەکرد، ئەویش تەنیا هەفتەیەک یان زیاتری دەخایاند. بەڵام زۆربەی کاتەکانی تر، تەنیا بە توێی یەک چاکەتی تەنکەوە بچوویتایەتە دەر. ئەمڕۆش یەکێک بوو لەو ڕۆژە خۆشانە – پلەی گەرما تەنیا بیستوسێ پلەی سەدی بوو، ئاسمانیش ساماڵ، پەڵەهەورێک چییە نەتدەبینی.

ڕاست لە کاتی خۆیدا گەیشتمە ماڵی جەیمی و تەقەم لە دەرگا دا. جەیمی خۆی کردیەوە، هەر لە دەرگاکەوە سەرێکت بکێشایە ژووریێ، بۆت دەر دەکەوت کە هێگبێرت لە ماڵ نەبوو. ئاووهەواش هێند گەرم نەبوو، تا پێویست بە چاییەک یان قاوەیەکی گەرم بکات، لە دەرەوە، لەسەر هەمان کورسییەکانی جارەکەی پێشوو دانیشتینەوە، بەس ئەم جارە بێ شەربەتی لیمۆ. خۆریش لە کەلی ئاسۆوە وردەوردە خۆی دەشاردەوە، شەقامەکەی بەردەمی ماڵیشیان کەست پێوە نەدەدی. بۆیە ئەم جارەیان پێویستی نەدەکرد کورسییەکەم بجووڵێنم تا کەس چاوم نەکات. لەو کاتەوە کورسییەکان هیچ نەجووڵابوون.

جەیمی وتی، "لاندن، سوپاس بۆ هاتنت، دەزانم سەرت قاڵە، بەڵام زۆر پێدەزانم کە کاتی خۆت بۆ من تەرخان کرد ئەمڕۆ."

منیش دەمویست، تا زووە، بزانم چ کارێکی پێم بوو، وتم، "ئەو شتە گرنگە چی بوو ویستت لەگەڵم باسی بکەیت؟"

جەیمی، بۆ یەکەمین جار لەو کاتەوەی ناسیبووم، پەشۆکان و شڵەژاوی بە ڕوخسارییەوە دەر کەوت. لە شپرزەییی خۆیدا پەنجەکانی لێک دەئاڵاند و دەستی لێک دەخشاند.

ئەوجا بە دەنگێکی جیدییەوە وتی، "دەمەوێت چاکەیەکم لەگەڵدا بکەیت."

"چاکە؟"

سەرێکی ئەرێنیی لەقاند.

سەرەتا لە زەینی خۆمدا وای بۆ چووم، داوام لێ بکات لە ڕازاندنەوەی دیکۆری کڵێساکە یارمەتیی بدەم، هەر وەک لە ئاهەنگەکە باسی کرد، یان ڕەنگە پێویستی بە ئوتومبێلەکەی دایکم بێت، هەندێک کەلوپەلی پێ بگوازێتەوە بۆ هەتیوخانەکە. جەیمی مۆڵەتی شۆفێریی نەبوو، ئێ باوکیشی بە هۆی پرسە و مەراسیمە ئایینیەکانەوە، بەردەوام پێویستی بە ئوتومبێلەکەی خۆیان دەبوو. چەندێکی پێ چوو، ئەوجا توانیی ئەسڵی مەسەلەکەم پێ بڵێت.

دەست و پەنجەکانی هێشتا لە پەشۆکاویدا لێک دەئاڵاند، ئاهێکی هەڵکێشا و وتی، "حەزم کرد داوات لێ بکەم گەر بتوانیت ڕۆڵی تۆم سۆرنتن بگێڕیت لە شانۆگەرییەکەی

قوتابخانـەدا."

تـۆم سـۆرنتن، وەک پێشـتریش باسـم کـرد بۆتـان، ئـەو پیاوە بوو کە لـە چیرۆکەکـەی هێگبێرتدا عەوداڵی پەیداکردنی سندوقێکی مۆسـیقا بـوو بـۆ کچـە تاقانەکـەی، کـە دواتریـش ڕێکەوتـی فریشـتەیەک دەکات. بۆیـە جگـە لـە ڕۆڵـی فریشـتەکە لـەو شـانۆگەرییەدا، ڕۆڵـی تـۆم سـۆرنتن گرنگترینیـان بـوو.

بـە سـەرسـوورمانەوە وتـم، "وەڵاییـ... نازانـم، مـن وای بـۆ دەچـووم ئیـدی جـۆن ئـەو ڕۆڵـە وەر بگرێـت، خاتـوو گاربـەر وای گـوت."

ئیدی جۆن، ئەویش بـە هەمـان دەسـتووری کێـری دینیسـن، کەسێکی بەڕاسـتی بێزارکـەر و بێتـام بـوو. بەدەنێکـی زەعیـف و ڕەق و وشـک، ڕوخساریشـی هەمـوو زیبکـە و پەڵـەی وشـک بـوو، کـە قسـەشـی لەگەڵـدا دەکـردی، خـووی گرتبـوو بـەوەی چاوەکانـی دەنووقانـد، تەنیـا ئەوەنـدەی بەردەمـی ببینـێ. هەمـوو بەدەنـی خـوو بـوو، دایمـەی خـوا پەشـۆکا و قەلـەق دەهاتـە پێشـچاو. کـە قسـەیەکیشـی دەکـرد، وەک ئـەوەی نەخۆشـیی دەروونیـی هەبێـت، سـەد جـاری دیکـەی دووبـارە دەکـردەوە. لـەوەش خراپتـر، زمانـی دەیگـرت، تـا شـتێکی دەگـوت، قیـر سـپی دەبـوو. خاتـوو گاربـەر ئـەو ڕۆڵـەی پێ دابـوو، ئەویـش لەبـەر ئـەوەی کەسـی تـر نەبـوو ئامـادە بێـت ڕۆڵەکـە وەر بگرێـت، بۆیـە ئـەم داوای کردبـوو بیدەنـێ، ڕاسـتییەکەی، خاتـوو گاربـەر خۆیشـی دیـار، بـوو حـەزی نەدەکـرد ئـەو ڕۆڵـە بـدات بـەو دەمـلاڵـە. خـۆ مامۆسـتا کـەر نییـە، چـاک دەزانـێ، بـەلام ئیتـر چـاری نەبـوو، چ بـکات، کەسـی تـر ئامـادە نەبـوو

دەوری تۆم سۆرنتن بگێڕێت.

جەیمی وتی، "خاتوو گاربەر خۆ نەیگوت هەر دەبێت ئەو بێت، بەڵکوو گوتی گەر کەسی تر نەبێت، ئەوجا ناچار ڕۆڵی ئەو کارەکتەرە دەدەینە ئێدی."

"ئەی کەسی تر ناتوانێت بیکات؟"

بۆخۆشم دەمزانی کەسی تر نەبوو. ئەو ساڵە بە هۆی مەرج و داواکارییەکانی هێگبێرتەوە، کە تەنیا خوێندکارانی قۆناغی کۆتایی دەیانتوانی بەشداریی شانۆگەرییەکە بکەن، بۆیە کارەکانی نمایشەکە باش بە دەستەوە نەدەهاتن. ئەو ساڵە، لە قۆناغی کۆتاییدا، نزیکەی پەنجا کوڕ دەبووین، بیستودوویان ئەندامی تیمی یاریی دووگۆڵی بوون، ئێ تیمەکەش لە خۆئامادەکردندا بوون بۆ خولی پاڵەوانێتیی ویلایەتەکان، لەبەر ئەوە، کەسیان ئامادە نەبوون لە کاتی خۆیان بگرن و بێن بۆ ڕاهێنانی شانۆگەرییەکە. ئەو بیستوهەشت کوڕەی مابوونەوە، ئەوانیش نیوەیان لە باندی مۆسیقادا ئەندام بوون و دوانیوەڕوان ڕاهێنانی خۆیان دەکرد. ئەوەی دەمایەوە، دە-دوازدە کەسێکی تر بوون، کە لەوانە بوو بتوانن بەشداری بکەن.

ئەوی ڕاستی بێ، من لەو کاتەدا دڵم پێوە نەبوو بەشداری لە نمایشەکەدا بکەم، نەک تەنیا لەبەر ئەوەی هاتبوومە سەر ئەو بڕوایەی دراما ناخۆشترین و بێتامترین وانە بوو لای من. بەڵکوو هۆکارێکی تر بوو، بۆخۆتان دەزان پێشتر جەیمیم برد بۆ ئاهەنگەکە، جا ئێستاش ئەو دەوری فریشتەکە ببینێت و تا مانگێک، هەموو ڕۆژێک، دوانیوەڕوان

لەگەڵی بچم بۆ ڕاهێنانی شانۆگەرییەکە، هاوڕێکانم چیم پێ دەڵێن؟ تەنیا بۆ یەک جار لەگەڵی بووم ئاوهایان پێ کردم، جا وەرە دوانیوارڕوانی هەموو ڕۆژێک لەگەڵی بم، چیم پێ دەڵێن؟

لێ دەمزانی ئەمە بۆ جەیمی گەلێک گرنگ بوو. چونکە مادامەکی خۆی داوای لێ کردم ئەو ڕۆڵە ببینم، کەواتە دیار بوو زۆر مەبەستی بوو. جەیمی بە تەمەنی، بۆ شتێکی کەمیش بێت، داوای لە کەسمان نەکردبوو. لەوە دەچێت بۆخۆیشی زانیبێتی کەسی تریان بەدەم داواکەییەوە نەدەچوون. بەم بیر و خەیاڵە کەمێک قەلەقی دای گرتم.

منیش وتم، "ئەی بۆ بە جێف بانگێرت ناڵێی؟ ڕەنگە ئەو بتوانێت."

سەرێکی با دا و وتی، "ئەو ناتوانێت. باوکی نەخۆشە، لەبەر ئەوە، دەبێت پاشنیوەڕوان ئاگای لە دوکانەکەیان بێت تا باوکی دەکەوێتەوە سەر پێ."

"ئەی دارین ودس؟"

"ئەویش هەفتەی ڕابردوو لەسەر بەلەم خلیسکا و قوڵی شکا، گەچیان بۆ تێگرتووە."

تەقەڵلام دەدا بە هەرجۆرێک بێت، خۆم بدزمەوە لە مەسەلەکە، خۆیشی هەستی پێ کردبووم. وتم، "بەڕاست؟ وەڵڵا نەمزانیبوو."

"لاندن، گەلێک نزام کردووە،" ئاهێکی هەڵکێشا و ئەوجا بەردەوام بوو. "ئەمساڵ دەمەوێ شانۆگەرییەکە زۆر تایبەت بێت، لەبەر خۆم نا، بەڵکوو لەبەر باوکم. حەز دەکەم

باشترین نمایییش دەر بچێت. دەزانم باوکم چەند مەبەستێتی من ببینێت ڕۆڵی فریشتەکە بگێڕم، چونکە ئەم شانۆگەرییە دایکمی بیر دەخاتەوە..." کەمێک ڕاما، بیروهۆشی کۆ کردەوە و وتی، "گەر نماییشەکەمان شکست بێنێت، گەلێک ناخۆش دەبێت، بەتایبەت کە منیش تێیدا بەشدارم."

قسەکانی بڕی و جارێکی دی ئێستێکی کورتی کرد، ئەوجا کە بەردەوام بوو لە قسەکانی، لە دەنگیدا زیاتر سۆزێکی نەرمت هەست پێ دەکرد. وتی، "دەزانم گەر داوا لە ئێدی بکەم، بێگومان بە دڵسۆزییەوە ئەیکات، دەزانم. بگرە هیچ هەست بە شەرمیش ناکەم لەگەڵ ئەودا نماییش بکەم، کوڕێکی باشە، بەڵام خۆی پێی گوتم، کە حەزی لێ نییە بەشداری بکات. جاری وا هەیە لە قوتابخانەش خەڵکی خوانەناس هەیە هەر خەریکی قسەوقسەڵۆکن، بۆیە نامەوێت تووشی قسە ببێت، بەڵام..." هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا، "ڕاستییەکەی، بۆیە داوات لێ دەکەم یارمەتیم بدەیت، زیاتر لەبەر باوکم. لاندن، بڕوا بکە پیاوێکی زۆر باشە. گەر بێت و لە کاتی نماییشەکەدا، کە من ڕۆڵی فریشتەکە بگێڕم و خەڵکیش گاڵتە بەو بەشە بکەن... ئەوا لە ناخەوە دەسووتێم. بۆخۆشت دەزانی، گەر من و ئێدی پێکەوە نماییش بکەین، خەڵکی چی دەڵێن."

سەرێکم لەقاند، لە تەریقبوونەوەدا لێوەکانم دەکرۆشت، دەمزانی گەر ئێستا داوای لە کەسێکی تر بکردایە و من نەبوومایە، ئەوا منیش یەکێک دەبووم لەو خەڵکە خوانەناسانەی باسی دەکردن، لە ڕاستییشدا هەر وا بوو،

هەمووی لەژێر سەری مندا بوو. جەیمی و ئێدی، کاتی خۆی کە خاتوو گاربەر ئەو دووانەی هەڵبژارد بۆ نمایشەکە، پێمان دەگوتن مەنجەڵ و سەرقاپەکە. کە ئەو هەڵسوکەوتە قێزەونانەی خۆم دەهاتەوە یاد، کسپەیەکی جەرگبڕ هەناوی دەسووتاندم. سەری مارەکە من بووم.

لە کورسییەکەی کەمێک خۆی ڕاست کردەوە و بە خەمێکەوە لێی دەڕوانیم، وەک بڵێی هەستی کردبێت داواکەی ڕەت دەکەمەوە. لێ لە دڵی مندا نەبوو، نەیدەزانی چ هەستێکم لا دروست ببوو.

بەردەوام بوو لە قسەکانی، "دەزانم ماندووبوون و ڕووبەڕووبوونەوەی شتەکان هەمیشە قەدەری خوداییـن، بەڵام ئەمەش مانای ئەوە نییە خودای گەورە بیەوێت ڕێگری بکات لە بەردەم شتەکان. باوکم ژیانی لەپێناو خودای گەورە تەرخان کردووە بۆ کڵێسا و کۆمەڵگە. هەر زوو خێزانەکەشی کۆچی دوایی کرد و بەتەنیا دەبوو کچە تاقانەکەی بەخێو بکات، منیش لەبەرامبەر ئەو دڵسۆزییەیدا، گەلێکم خۆش دەوێت..."

جەیمی ڕووی لێ وەر گێڕام، بەڵام فرمێسکەکانیم بەدی کرد لە چاوانیدا قەتیس مابوون. تا ئەو کاتە یەکەمین جارم بوو ببینم بگری. ئەمنیش قورگم پڕ ببوو.

دواتر بە دەنگێکی مردەلۆکەوە وتی، "نامەوێت لەبەر خاتری من ئەو ڕۆڵە وەر بگریت، نا، هیچ لەبەر من نییە. گەر داواکەشم ڕەت بکەیتەوە، ئەوا هەر نزای خێرت بۆ دەکەم. بەڵام گەر دەتەوێت کارێکی دڵسۆزانە بۆ پیاوێکی

لەخواترس بکەیت، کە لای مـن زۆر خۆشەویستە، بیرێکی لـێ دەکەیتـەوە؟"

منیش وتـم، "پێویست نـاکات بیری لـێ بکەمـەوە. تـەواو، مـن ئـەو ڕۆڵـە وەر دەگـرم."

هیچ چارێکی ترم نەبوو، چم بکردایە؟

## ٥

بۆ ڕۆژی دواتر، چووم قسەم لەگەڵ خاتوو گاربەر کرد و ئەویش تاقیی کردمەوە تا بزانێت دەتوانم ڕۆڵی تۆم سۆرینت بگێڕم یان نا، پاشان وەری گرتم. خوا هەڵناگریێ ئێدی پێی ناخۆش نەبوو، بگرە گەلێکیشی پێ خۆش بوو. کە خاتوو گاربەر لێی پرسی پێی خۆش دەبێت گەر من لە جێی ئەو ڕۆڵی ئەو کارەکتەرە بگێڕم، لە خۆشیدا حاڵی نەبوو، گەشکەیەکی تەلیسمای دای لە ڕووی و بە دەمی تەتەڵەوە وتی، "ببەبەبەڵێ، بببیگوووومان. تتتتتیدەگەم." تا قسەکانی تەواو دەکرد، شەقت دەبرد، نیوخولەکی پێ چوو تا ئەو وشەیەی لە زار دەر چوو.

بەرامبەر بەم چاکەیەی، خاتوو گاربەر ڕۆڵی دەرۆزەکەرەکەی پێشکەش بە ئێدی کرد، ئێ هەمووش دەمانزانی بۆ ئەو ڕۆڵە گەلێک چاپووک و لێهاتوو دەبێت. لە چیرۆکەکەشدا دەرۆزەکەرەکە هیچ ناڵێت، بەڵام فریشتەکە لە دڵی دەخوێنێتەوە و دەزانێت چ لە بیروهۆشیدایە. لە یەکێک لە حیوارەکاندا، فریشتەکە ڕوو دەکاتە دەرۆزەکەرە بێدەنگەکە و پێی دەڵێت، خودای گەورە هەمیشە ئاگای لێتە،

چونکە بەتایبەت گرنگی بە هەژاران و لێقەوماوان دەدات و ڕەحمەتی خۆی بەسەریاندا دەبارێنێ. ئەوەش یەکێک بوو لەو پەیامانەی خوای گەورە، کە فریشتەکە لە ئاسمانەوە لەگەڵ خۆیدا هێنابووی بۆ ئامادەبووان. وەک پێشتریش باسم کرد، هێگبێرت دەیویست زۆر ڕوون و ئاشکرا بێت، کە هەر خوای تاک و تەنیا پارێزەری زەوی و ئاسمانە، نەک شەیتان و خێو و شتی وا.

هەفتەی داهاتوو ڕاهێنانی شانۆگەرییەکە دەستی پێ کرد، ناچار لەناو پۆلەکانی خۆماندا ڕاهێنانمان دەکرد، چونکە هۆڵی شانۆگەرییەکە هەتا ئەو کاتەی پێویستمان بە ستاند و لەوحەکان بووایە، لە کاتی ڕاهێنانەکە دەرگایان بۆ نەدەکردینەوە، دەیانگوت لە کاتی ڕاهێنانەکاندا ئاگاتان لێی نابێت و قاچتان هەڵدەکەوێت و دەیانشکێنن. دەبوو لە قوتابخانە شتی خۆمان بەکار بهێنایە تا تەواو دەبووین. پازدە ساڵ لەوەوبەر، ئەو ساڵەی شانۆگەرییەکانی کریسمس دەستی بەکارەکانی کرد، ستاند و لەوحە و کەلوپەلەکانی تری هۆڵەکە بە دەستی کابرایەکی دەسترەنگینی گەڕۆک دروست کرابوون بە ناوی تۆبی بوش. کاتی خۆی ئەم کابرایە هەندێک ئیشی تریشی کردبوو بۆ هۆڵەکە. ئەم کابرایە لە کاتی ئیشکردنیشیدا بەردەوام بتڵەبیرەکەی هەر بە دەمەوە بوو، هەر کە کاتژمێر دووی لێ بهاتایە، دەستی لە ئیش هەڵدەگرت و دیار نەدەما. دیارە ئەم کابرایە چاوی باش نەیدەبینی، چونکە وەک باسیان دەکرد، ڕۆژ نەبوو چەکوشێک نەدا بە پەنجەی خۆیدا. هەموو جارێکیش کە وای بەسەر دەهات، چەکوشەکەی فڕێ دەدا و لەتاو ئازاری پەنجەی دەکەوتە هەڵبەزودابەز، جنێوی بەو

عالەمـە دەدا. ئەوجـا کـە ئازارەکەیشـی کەمێـک دادەمرکایـەوە، پێش ئـەوەی دەسـت بکاتـەوە بـە ئیـش، بیرەیەکـی تـری هەڵدەقوڕانـد، تـا ئـازاری پەنجـەی بیـر بچێتـەوە. ئەوەنـدەی چەکوش کێشـابوو بـە سـەری پەنجەکانیـدا، بەقـەدەر گوێزێـک ئاوسابوون. بۆیـە کـەس ئیشـی نەدەدایێ، تەنیا هۆکاریـش کـە کاتی خۆی هێگبێرت هێنابووی ئیشی بۆ بکات، ئەوە بوو لەو هەرزانجانتـری چنـگ نەکەوتبـوو لـە شـارۆچکەکەدا.

بـەڵام هێگبێـرت هیـچ جنێـودان و خواردنـەوە و شـتی قبـوڵ نەدەکـرد، ئـێ کابـرای دەسـتڕەنگینیش نەیدەتوانـی بەبـێ خواردنـەوە و جنێـودان ئیشـەکەی بەباشـی بـۆ بکرێـت. بۆیـە ئەنجـام، هەرچیـی دەکـرد، بەکەموکـووڕی جێـی دەهێشـت، هەرچەند ئەوکاتـە درکیشـیان پێ نەکردبوو. دوای چەند ساڵێک ستاند و لەوحـەو کەلوپـەکان شـل بوونـەوە و لێک هەڵوەشـان، پاشـان هێگبێـرت هـات چاککردنـەوەی شـتەکانی گرتـە ئەسـتۆی خـۆی. ڕاسـتە هێگبێـرت دەسـتی وەسـتاییی هەبـوو لـە وتـاری ئایینیدا، بـەڵام فـڕی بـە بزمارداکوتانـەوە نەبـوو، ڕاسـتە دەڵێن نـان بـۆ نانـەوا و گۆشـت بـۆ قەسـاب. لەبـەر ئـەوە هەرچییەکـی چـاک کردبووەوە، بەسـەقەتی چاکـی کردبوو، بزمـاری ژەنگاوی وەک درک دەچـوو بـە گیانتـدا، دەبـوو بەوریایی بەسـەر تەختـەی شـانۆکەدا بڕۆیـن، نەبـا بزمارێـک بچێـت بـە قاچمانـدا یـان لەوحەیـەک بکەوێـت. پـاش دوو سـاڵی تـر، هۆڵـی شـانۆگەرییەکە دەبوو نوێ بکرایەتـەوە، ئەمـەش مانای ئەوە بـوو، ئێمە هەتاکوو لـە ڕاهێنانەکانـدا پێویسـتمان بـە سـتاند و لەوحـەکان بووایـە، نەماندەتوانـی ڕاهێنانـی تێدا بکەیـن. لەبـەر خاتـری هێگبێرت، لە کاتـی نوێکردنـەوەی هۆڵەکـە، دەرگایـان دانەخسـت بـۆ نماییشـی

شانۆگەرییەکە، تەنیا ئەوە نەبێت، بۆ ڕاهێنان نەدەکرا بچین تا ئەو ڕۆژەی لە ڕاهێنان تەواو دەبووین و نمایش دەستی پێ دەکرد.

شکور بۆ خوا، هێگبێرت بە هۆی ئیشوکاری کڵێساوە نەپەرژا سەرپەرشتی شانۆگەرییەکە بکات. ئیدی خاتوو گاربەر ئیشەکانی لە ئەستۆ گرت. یەکەم شت کە پێی گوتین، ئەوە بوو هەرکەسە دەقەکانی خۆمان بە زووترین کات لەبەر بکەین. جا بە هۆی ئەوەی لە مانگی تشرینی دووەمدا بووین و کۆتاڕۆژی ئەو مانگەش، ڕۆژی پشووی شوکرانەبژێری* دەهاتە پێشێ، بۆیە کاتی زۆرمان بە دەستەوە نەبوو بۆ مەشق و ڕاهێنان، ئێ هێگبێرتیش نەیدەویست ڕۆژی نمایشەکە نزیک بێت لە جەژنی کریسمس، بۆ ئەوەی مانای ڕاستەقینەی شانۆگەرییەکە تێکەڵ بە کریسمس نەبێت، چونکە ئەویش نزیک دەبووەوە. ئیدی تەنیا سێ هەفتەمان لە بەردەمدا بوو، تا هەموو شتێک تەیار و ئامادە بێت بۆ ڕۆژی نمایش، کە ئەمەش هەفتەیەکی کەمتر بوو لە کاتی ئاسایی خۆی.

ڕاهێنانەکان، یەکەم ڕۆژ کاتژمێر سێی پاشنیوەڕۆ دەستی پێ کرد، هەر ئەو ڕۆژە جەیمی هەموو دەقەکانی خۆی لەبەر بوو، شتێکی سەیریش نەبوو بەلامەوە. بەڵام ئەوەی بەلامەوە سەیر بوو، هەموو دەقەکانی ئێمەشی وەک ئاو و دۆ لەبەر بوو. ڕۆژی یەکەم ڕاهێنانمان لەسەر یەکێک لە دیمەنەکانی شانۆگەرییەکە کرد، جەیمی، بێ ئەوەی سەیری حیوارەکانی خۆی بکات، هەمووی دەگوت، کەچی منیش بۆ یەک دێڕ دەبوو سەیری دەفتەرەکەی دەستم بکەم و بزانم حیواری

---

* Thanks giving

دوای ئەوە چی بڵێم. کارەکتەری دەرۆزەکەرەکە هیچ دەقێکی نەبوو، بۆیە ئێدی ئیشی ماشی بوو، هەر لە یەکەم ڕۆژەوە، بەغیلیم پێ دەبرد لەو ڕووەوە. کارەکە ماندووبوونێکی زۆری دەویست، ئەو ڕۆژەی خۆم ناونووس کرد تا بەشداری بکەم، پێشبینیم نەدەکرد ئاوها گران بێت.

دووەم ڕۆژی ڕاهێنانەکە، ئەو شەپۆلی پەرۆشییەی سەرەتا رووی تێ کردبووم بۆ نمایشکردنی شانۆگەرییەکە، وردەوردە دادەمرکایەوەو کپ دەبوو. هەرچەند خۆم بە دڵ و بە گیان ئیشەکەم دەست دابوویێ، لێ هاوڕێکانم لەمە تێنەدەگەیشتن، بگرە لەو ڕۆژەوەی ئەمەیان زانیبوو، بەردەوام تانەوتەشەریان لێ دەدام، خەریک بوو سواری کۆڵم دەبوون. کە ئێریک ئەو ڕۆژە زانیی لەگەڵ جەیمی نمایشەکە ئەنجام دەدەم، وتی، "چی؟ لەگەڵ جەیمی سولیڤەن شانۆگەری نمایش دەکەیت؟ ئەرێ تۆ کەری یان خۆت کەر دەکەیت؟ "ئیتر هەرچەند قسەم بۆ کرد، خۆ نەدەچوو بە گوێیدا، هەر حەیاشی بردم، بە هەرکەسێک دەگەیشت، پێی دەگوتن وەڵڵا لاندن حەزی لە جەیمی کردووە. ئەمنیش وەنەبێ دەنگم نەکردبێ، گەلێک ئینکاریم کرد و گوتم کاکە بیکەن بە خاتری خوا، حەزی چی و شتی چی، تەنیا ئەوەیە نمایشی لەگەڵ دەکەم، کەچی بڕوایان پێ نەدەکردم، پێم پێدەکەنین و هەرکەسێکیان بدیتبا، ئەویشیان تێدەگەیاند. چیرۆکی من و جەیمی بووە بنێشتەخۆشەی سەر زاری خەڵک - کاتی نانخواردنی نیوەڕۆ، سالی هاتووە پێم دەڵێت، وەڵڵا تۆ نیازت هەیە جەیمی مارە بکەیت. ڕاستییەکەی، وا بزانم سالی دڵی لێم پیس بوو. ئەم کچە چەند سالێک بوو دڵی بە منەوە بوو، گەر چاوی ئاوها

نەبووایە، ڕەنگ بوو منیش دڵم بۆی لێبدایە، ئێ بە خوا منیش حەزم لە شتی وا نەبوو. کە دەمبینی چاوی لە چاوی ئەو سەرە ئاسکەکێویانە دەچوو، کە لە ماڵاندا وشک کراوەتەوە و بە دیوارەکانەوە هەڵی دەواسن بۆ جوانی، ڕاستتان پێ بڵێم، لێی دەترسام.

ئیتر لەو ڕۆژەوە جارێکی تر تێڕوانینم بەرامبەر جەیمی گۆڕا و ڕقم لێی دەبووەوە. بۆخۆم چاک دەزانم هیچ خەتای ئەوی تێدا نەبوو، بەڵکوو هەمووی تانەوتەشەری هاوڕێکانم وایان لێ کردم. لەگەڵ ئەوەشدا، گلەییم لە هێگبێرتی باوکی هەبوو، کە ئەو شەوەی چووم بەدوای جەیمیدا بۆ ئاهەنگەکە، هەر نەهاتە دەرێ بەخێرهاتنێکم بکات. لەبەر ئەوە، لەو ڕۆژە بەدواوە، لە پۆلدا، لە کاتی ڕاهێنانەکاندا، هەڵەی زۆرم لە حیوارەکاندا دەکرد، سارد ببوومەوە، بگرە تەقەللاشم نەدەدا فێریان ببم، جاروباریش قسەیەکی قۆڕم تێ فڕێ دەدا و هەمووانم دەخستە پێکەنین، جگە لە جەیمی و خاتوو گاربەر. کە تەواویش دەبووین لە ڕاهێنانەکە، ڕاست دەچوومەوە ماڵەوە و دەفتەری دەقەکانم فڕێ دەدایە قوژبنێکەوە و هەر حەوسەڵەم نەبوو چاوی پێدا بخشێنمەوە، لەگەڵ هاوڕێکانمدا دەکەوتینە شۆخیکردن بە ئەتوارەکانی جەیمی و غەیبەتکردنی خاتوو گاربەر، کە چۆن هاتووە لێم پاڕاوەتەوە بەشداری لە نمایشەکەدا بکەم.

بەڵام جەیمی بەو ئاسانییە لە کۆڵم نەدەبووەوە. خوا چیی پێ ناخۆش بێت، پێی دەکردم، کوێم بێەشایە، بەوێی دەکێشام.

شەوی شەممە، کە بۆ بەیانی سێیەم خولی پاڵەوانێتیی تۆپی پێی بیوفۆرت دەستی پێ دەکرد، من و ئێریک و

مارگرێت پێکەوە ئەو شەوە لە دەرەوە بووین، ئەو کاتە هەفتەیەک بوو ڕاهێنانەکانمان دەستی پێ کردبوو. پێکەوە چووین بۆ کافتریای سیسڵ لە نزیک ڕووبارەکە، لە دەرەوەی کافتریاکە دانیشتبووین، کێک و قاوەمان دەخوارد و تەماشای خەڵکمان دەکرد بە بەردەممانندا تێدەپەڕین، لەو کاتەدا جەیمیمان چاو کرد بە شەقامەکەدا ڕەت دەبوو، هێشتا سەد مەترێک لێمانەوە دوور بوو، چاوی بەملا و ئەولادا دەگێڕا، دیسانەوە ئەو بلووزە قاوەییەی لەبەر کردبووەوە و کتێبی ئینجیلەکەیشی بە دەستێکەوە بوو. کاتژمێر لە نۆ لایدابوو، پێمان سەیر بوو بەم درەنگوەختە جەیمی لە دەرەوە بێت، بەتایبەت لەم شوێنە. پشتم تێ کرد و یەخەی چاکەتەکەم بەرز کردەوە تا نەمبینێ، بەڵام مارگرێت ئەوەندە زۆرزان بوو، دەیزانی بۆ کێ دەگەڕێت.

وتی، "لاندن، ئەوە کچەهاوڕێکەتە."

"نەخێر، هاوڕێی من نییە، من کچەهاوڕێم نییە."

"ئێ دەی، کەواتە دەزگیرانەکەتە."

بە خوا دیارە سالی لای ئەمیش بوختانی بۆ کردووم.

منیش وتم، "من دەزگیرانم نییە، ئیتر بەسە، بیبڕەوە."

ئاوڕێکم لە پشتەوە دایەوە، تا بزانم منی بەدی کردووە یان نا، وا بزانم هەر واش بوو، منی چاو کردبوو. بەرەو لای ئێمە دەهات. خۆم وا نیشان دا، کە ئاگام لەو نەبێت.

مارگرێتیش بە پێکەنینێکی بەمەغزاوە وتی، "ئەوە هات."

"دەزانم."

کەمێکی تری پێ چوو، دووبارە وتیەوە، "وا هات."

منیش بە دانجیڕکردنەوەوە وتم، "ئەرێ دە باشە، دەزانم."

گەر لەبەر خاتری ڕان و قاچوقولە ساف و لووسەکەی نەبووایە، لە جەیمی بێزارکەرتر ئەو بوو.

جارێکی دی لەژێر یەخەی چاکەتەکەمەوە ئاوڕێکم بۆ پشتەوە دایەوە، لێ ئەم جاریان جەیمی زانیی ئەوم بینیوە، بۆیە پێکەنی و دەستێکی بۆ ڕاوەشاندم. ڕووم لێ وەر چەرخاند و هێندی پێ نەچوو، هاتە تەکمەوە وەستا.

گوێی نەدا بە هیچ."لاندن، چۆنی؟ ئەی ئێوە چۆنن ئێریک و مارگرێت..." ئیتر بە هەمووواندا ڕۆیشت. ئێمەش بە ساردوسڕییەوە سڵاومان بۆ سەندەوە و هەوڵمان دەدا تەماشای کتێبەکەی دەستی نەکەین.

ئێریک بیرەیەکی بە دەستەوە بوو، خستیە پشتیەوە تا جەیمی نەیبینێ. جەیمی گەر زۆر لە ئێریک نزیک بکەوتایەتەوە و بۆنی دەمی بکردایە، شەرمەزاری دەکرد. کاتی خۆی دراوسێ بوون. پێشتر بەردەوام دەنووکی لەسەر ئەم کوڕە بووە و ئامۆژگاریی کردووە. کەچی وەک تر، غەیبەتیشی دەکرد. ئێستاش کە لە بەردەمیدا وەستابوو، نەیدەویست بەو جۆرە بیبینێ و نزای شەڕی لێ بکات. چونکە ئێریک دەیگوت، نزای ئەم کچە قبوڵ دەبێت.

جەیمی ڕووی کردە ئێریک و وتی، "ئێریک، چۆنی؟" بە جۆرێک قسەی لەگەڵدا دەکرد، وەک بڵێی بە دەقە و سەعات لەگەڵیدا بێت. "دەمێکە نەمبینیویت."

قاچی لەسەر قاچ دانابوو، ئاڵوگۆڕی پێ کردن و لە تەریقیدا سەری داخستبوو، تەماشای پێڵاوەکانی خۆی دەکرد. وتی، "ماوەیەکە نەهاتووم بۆ کڵێسا، بۆیە دیار نیم."

جەیمی بە بزە شیرینەکەی، کە هەمیشە لەسەر لێوی بوو،

وتی، "دەی گەر هەر ئەم ماوەیە بێت و نەیکەیت بە پیشە، قەیناکات."

"نا، نایکەم بە پیشە."

ئەوەتا، دەبینم ئێریک دان بە تاوانەکانیدا دەنێت – بە دەستووری خەڵک کە دەچن بۆ کڵێسا و لە بەردەم قەشەکاندا دان بە تاوانەکانیاندا دەنێن و داوای نزای خێر دەکەن بۆ لێخۆشبوونیان – ئێریکیش ئاوها بوو، کە جەیمیی دەبینی، ئەژنۆی دەشکا. لە بیری خۆمدا گوتم، هەر ئەوەندەی ماوە بە خانم بانگی بکات.

وا بزانم مارگرێت ویستی خۆی هەزەلی بکات، بە شۆخییەوە وتی، "بیرە دەخۆی؟" بەڵام کەسمان بە شۆخییەکەی پێکەنینمان نەهات.

جەیمییش بەنەرمی دەستی بە قژیدا هێنا و وتی، "نا، ناخۆم، زۆر سوپاس."

ئەوجا بە روویەکی گەش و شیرینەوە نیگای گواستەوە سەر من، راست گوتم، بە خوا شتێک هەیە، تووش بووم. وام بە خەیاڵدا هات، ئێستا خراپ دەقەومێ، بانگم دەکات و دەمباتە لایەکەوە، تا قسەم لەگەڵدا بکات، بەڵام باش بوو، نیازی شتی وای نەبوو.

وتی، "ئەم هەفتەیە لە راهێنانەکاندا گەلێک باش بوویت، دەزانم دەقەکانت زۆرن، بەڵام دڵنیام زوو هەمووی لەبەر دەکەیت. جا دەمەوێ سوپاست بکەم، کە بەخۆبەخش هاتیت بەشداری بکەیت، بەڕاستی تۆ کەسێکی باشیت."

"زۆر سوپاس." تەلیسمێکی جەرگبڕ بە هەناومدا هات، دەتگوت کەسێک لە ناوەوە ڕیخۆڵەکانم گرێ دەدات. تەقەللام

دا خۆم تێک نەدەم، لێ هەمووان لەو کاتەدا نیگایان لەسەرم بوو، بیرم کردەوە، گوتم باشە بە ملی شکاوم بۆچی ئەو درۆیەم کرد، کە خاتوو گاربەر خۆی زۆری لێ کردبووم ئەو ڕۆڵە وەر بگرم لە شانۆگەرییەکەدا. نزام کرد لەبیریان چووبێتەوە.

جەیمی خەیاڵاتی شکاندم، وتی، "هاوڕێکانت دەبێت شانازیت پێوە بکەن."

ئێریک کەمێک خۆی هێنایە پێشێ و وتی، "بەڵێ، ئەی چۆن، ئێمە شانازیی پێوە دەکەین. ئەم لاندنە کوڕی چاکە، ئەوەتا بەخۆبەخش کار دەکات."

ئای خوایە گیان، تووشی چی بووم.

جەیمی بزەیەکی بە ڕوودا کرد، ئەوجا جارێکی تر سەرنجی گواستەوە سەر من. هەر بە دەستووری ڕووی شیرینی خۆی وتی، "ویستم ئەوەشت پێ بڵێم، گەر پێویستت بە هەر یارمەتییەک بوو، دەتوانی بێیت سەرێکم لێ بدەیت لەماڵەوە. لەسەر کورسییەکان، وەک جاری پێشوو، دادەنیشین و لە حیوارەکاندا ڕاهێنان دەکەین، گەر پێویست بکات..."

چاوم لێ بوو ئێریک ڕووی کردە مارگرێت و بەمەغزاوە بەئەسپایی وتی، "وەک جاری پێشوو." لە تەریقیدا نەمدەزانی چ بکەم، تەلیسمە جەرگبڕەکەی هەناوم ئەوەندەی تر بەگیری هێنام.

بە دەنگێکی کز و لەژێر لێوەوە وتم، "نا، قەینا، خۆم لە ماڵەوە لەبەریان دەکەم." نەمدەزانی چۆن خۆم لەم بەڵایە ڕزگار بکەم.

پاشان ئێریک وتی، "دەی لاندن، هەندێک جار گەر کەسێکت

لەگەڵدا بێت و بۆت بخوێنێتەوە، باشتر لەبەریان دەکەیت."

بیرتانە پێشتریش پێم گوتن کە ئێریک هەرچەند هاوڕێی نزیکیشم بوو، بەڵام جاروبار لێم کەر دەبوو.

منیش پێم وت، "نا، پێویست ناکات. خۆم دەقەکان لەبەر دەکەم."

ئێریک بەمەغزاوە پێکەنی و وتی، "وا بزانم هەردووکتان بچن لە بەردەمی منداڵە هەتیوەکان ڕاهێنانەکانتان بکەن باشترە، جلوبەرگێکی ڕاهێنانیش لەبەر بکەن، ئەوجا منداڵەکانیش بە بینینتان شادمان دەبن."

لەوێ بوونایە، دەتانبینی کە جەیمی گوێی لە وشەی منداڵە هەتیوەکان بوو، چۆن ڕوخساری سوور هەڵگەڕا. وتی، "تۆ پێت وایە پێیان خۆش بێت؟"

ئێریک سەرێکی لەقاند و وتی، "بەڵێ، زۆر دڵنیاشم. لاندن خۆی یەکەم جار ئەم پێشنیارەی کرد، بەڵام دەزانم گەر من منداڵێکی هەتیو بوومایە، بە شتێکی ئەوها دڵخۆش دەبووم، بگرە گەر شتێکی ڕاستەقینەش نەبووایە."

مارگرێتیش خۆی فڕێ دایە نێو قسەکانەوە، وتی، "منیش."

ئەم جووتە کە قسەیان دەکرد، تەنیا شت کە بیرم لێ دەکردەوە، ئەوە بوو چۆن دەمیان بکوتمەوە و بێدەنگیان بکەم.

جەیمی برۆکانی وێک هێنا و وتی، "یەعنی لاندن خۆی ئەمەی پێشنیار کردووە؟" بەمۆنی تەماشای دەکردم. هەر بیری لێ دەکردەوە.

خۆ ئێریک بەوەشەوە نەوەستا، هێندەی تر شەرمەزاری کردم لە بەرچاوی ئەو کچە. وتی، "خۆت حەزت دەکرد وا

بکەیت، وا نییە لاندن؟ قەسدم یارمەتیی منداڵە هەتیوەکانە."

ئێ خۆ ئەمەش شتێک نەبوو بتوانیت بڵێیت نا، دارێکم بە دەستەوە بوو، هەردوو سەرەکەی پیس بوو. نەدەمتوانی بڵێم نەخێر و نە دەمتوانی بڵێم بەڵێ.

تەماشایەکی ئێریکم کرد، ئەو هاوڕێ خۆشەویستەم، پاشان بە دەنگێکی ساردوسڕەوە وتم، "وا بزانم." ئەم کوڕە هەرچەند لەو پۆلانەدا دانرابوو کە درەنگ فێری خوێندەواری دەبوون، کەچی لە قسەیا کەس دەرەقەتی نەدەهات، زمانێکی پێوە بوو، دوژمنەکەشم تووشی شتی وا نەبێت.

ئێریک وتی، "کەواتە تەواو، هەموو شتێک بڕایەوە، بێگومان گەر تۆش بە دڵت بێت، جەیمی." بە بزەیەکی هێند شیرینەوە لەگەڵ جەیمی دەدوا، گەر بتکردایەتە نێو تەشتێک زەهرەوە، شیرینی دەکرد.

ئەویش وتی، "وەڵڵایی... بەڵێ. وا باشترە قسەیەکیش لەگەڵ خاتوو گاربەر و بەڕێوەبەری خانەی هەتیواندا بکەم. گەر ئەوان قاییل بن، ئەوا ئیشێکی باش دەر دەچێت."

ئیتر بڕواتان هەبێت، جەیمی بەم بیرۆکەیە لە خۆشیدا هەر حاڵی نەبوو.

ڕۆژی دواتر، چواردە کاتژمێر هەر خەریکی لەبەرکردنی دەقەکانی خۆم بووم، خوا خێری برادەرەکانم نەنووسێ، تووشی چییان کردم. بڕوام نەدەکرد ئەمساڵ ئاوها نەگبەتیم بۆ بێنێ، بەڵام تازە چی دەڵێیت، مادام هەر دەبێت دیمەنێکی شانۆییەکە بۆ منداڵە هەتیوەکان نماییش بکەین، کەواتە پێویستە خۆم باش تەیار و ئامادە بکەم، نامەوێت لە بەرچاوی ئەوان تەریق ببمەوە.

## ٦

پێش هەموو شتێک، چووین قسەمان لەگەڵ خاتوو گاربەر کرد و تەگبیرەکەمان تێگەیاند، ئەویش بەلایەوە کارێکی نایاب بوو. دایمەی خوا وشەی نایابی لەسەر زار بوو. کە سڵاویشی لێ دەکردی، دەیگوت "مەرحەباااااا." ڕۆژی دووشەممە، کە زانیی هەموو دەقەکانی خۆم لەبەرە، وتی، "نایابە،" جا هەتا ئەو دوو کاتژمێرەی دواتریش کە دیمەنێکم تەواو دەکرد، هەر دەیگوتەوە. وای لێ هات، تا ڕاهێنانەکەمان تەواو کرد، ملیۆنێک جار ئەو وشەیەی دووبارە کردەوە.

خاتوو گاربەر بیرۆکەکەی ئێمەی باشتر کرد، هات تەگبیرەکەمانی بۆ هەموو پۆلەکە خستە ڕوو، داوایشی لێ کردن، گەر کەسی تریان ئارەزوو بکات دەقەکانی خۆیان نماییش بکەن بۆ منداڵە هەتیوەکان، تا زیاتر لەسەری ڕابێن و منداڵەکانیش پێیان خۆش دەبێت، هەم زیارەت و هەم تیجارەت. بەنێو پۆلەکەدا دەسووڕایەوە، تا بزانێت کێ دەستی بەرز دەکاتەوە و ئەمیش ناوی بنووسێت. جگە لە ئێدی، کەسی تریان هەر قونیشیان نەجووڵاند. لەو کاتەدا کە ئێدی دەستی بەرز کردەوە، مێشێکی گەورە خۆی خزانە

نێو کونە لووتیەوە، ئەویش، تا تینی تێدا بوو، پژماندی. مێشەکەرانەکە لە کونەلووتیەوە دەر پەڕییە دەرەوە، ڕاست بۆ تەنیشت قاچی نۆرما جینز. ئەو داماوەش زارەتەرەک بوو، لە کورسییەکەی هەڵبەزییەوە و زریکاندی، بە هۆی ئەمەوە، ئەو دووەی تەکیشی لە ترسانا قیژاندیان، ئیدی هەموو گوێقولاخ بوون و ملیان هێنایە پێشێ، بزانن چ قەوماوە، هەر ئەوەندەت زانی، ناو پۆلەکە بوو بە هەرا و قاوقیژێک، مەپرسە. ئێ ئەمەش بۆ خاتوو گاربەر وەڵامێکی باش بوو. بە وشەی، "نایابە" بابەتەکەی داخست.

جەیمی لە خۆشیدا حاڵی نەبوو، کە نیازمان هەبوو نماییش بکەین بۆ منداڵە هەتیوەکان. لە کاتی یەکێک لە پشووی نێوان ڕاهێنانەکانماندا، دەستی گرتم و بردمیە ئەولاوە و سوپاسی کردم، کە ئەو منداڵە هەتیوانەم لەبیر بووە. وتی، "بەڕاستی بیرۆکەیەکی باشت خستە ڕوو. بڕوا بکە، دەمێکە بیر دەکەمەوە، نەمدەزانی ئەمساڵ چییان بۆ بکەم بۆ خانەی هەتیوان. چەند مانگە بەردەوام نزا دەکەم، چونکە دەمویست ئەم جەژنی کریسمسە باشترین کریسمس بێت تا ئێستا."

منیش لێم پرسی، "باشە بۆچی کریسمسی ئەمساڵ هێند گرنگە؟" ئەویش بزەیەکی ئارامی کرد، وەک بڵێی پرسیارێکی هیچم کردبێت.

وتی، "ئیتر وایە."

هەنگاوی دووەم، ئەوە بوو بچین قسەیەکیش لەگەڵ جەنکینزدا بکەین، بەڕێوەبەری خانەی هەتیوان. گوتمان با دەمی ئەویش تاقی بکەینەوە. پێشتر بە تەمەنم ئەم کابرایەم نەدیتبوو، چونکە خانەی هەتیوان لە شاری مۆرهێد بوو،

پردێک دەیبەستێتەوە بە شارۆچکەکەمانەوە، ئێ منیش بە هیچ کلۆجێک هیچ کارێکم نەبوو تا ڕێم بکەوێتە ئەوێ. بۆ ڕۆژی دواتر، کە جەیمی هات بۆ لام و پێی گوتم ئێوارەکەی دەچین چاومان بە جەنکین دەکەوێت، منیش بەم هەواڵە کتوپڕە کەمێک داچڵەکیم، چونکە خەمی ئەوەم بوو، جلوبەرگەکانم هیی ئەوە نەبوون پیاو لە ڕووی بێت بۆ ئەو جۆرە شوێنانە پێوەی بچێت. ڕاستە شوێنەکە خانەی هەتیوان بوو، بەڵام خۆشترە بە جلوبەرگێکی ڕێکوپێکترەوە بچیت. هەرچەند من بە دەستووری جەیمی شاگەشکە نەبووم، بۆ ئەم بابەتە، کەس وەک ئەو نەبوو، لێ نەشمدەویست کەموکووڕیمان هەبێت و عەیبە بێتە سەرمان.

پێش ئەوەی بەڕێ بکەوین بۆ خانەی هەتیوان، دەبوو بچمەوە بۆ ماڵەوە، تا ئوتومبێلەکەی دایکم بێنم. لە ڕێگەی ماڵەوە، شتێکی باشتر بە زەینمدا هات. تا گەیشتینە ماڵەوە، دە خولەک یان شتێک زیاترمان پێ چوو، جەیمییش لە ڕێگە هیچی لە زار نەهاتە دەر، تا گەیشتینە لای ماڵی دراوسێکەمان. ماڵەکانی دەروردراوسێمان هەمووی خانووی گەورە و قاییم بوون، ئەوجا دەستی کرد بە پرسیارکردن، ئەم ماڵە کێی تێدایە؟ ئەی ئەوە ماڵی کێیە؟ ئەم خانووە چەند کۆنە؟ ئیتر ئەم جۆرە پرسیارانە. منیش بێ ئەوەی زۆر بیری لێ بکەمەوە، وەڵامی پرسیارەکانیم دەدایەوە، بەڵام کە دەرگای دەرەوەی ماڵی خۆمانم کردەوە، ئەوجا درکم بەوە کرد لەگەڵ ماڵەکەی ئەواندا چەند جیاوازیی هەیە. جەیمی کە پێی نایە ژووری میوانەکەمانەوە، لە جوانی و کەشخەیی ماڵەکەمان واقی وڕ ما، هەر چاوی پێدا دەگێڕا.

گومانی تێدا نەبوو، بە تەمەنی ماڵی وا خۆش و جوانی نەدیتبوو. هەنگێ دواتر، بینیم چاوی چووە سەر وێنە و نیگارەکانی دیوارەکە. وێنەی باووباپیرانم بوون. هەر وەک زۆربەی بنەماڵەکانی دەڤەری باشوور، وێنەکانی باووباپیرانم بەڕیز بە دیوارەکاندا هەڵواسرابوون. سەرنجی چووە سەریان، دواتر تەماشای کەلوپەلەکانی ناو ماڵەکەی کرد، کە دوای بیست ساڵیش هێشتا نوێ بوون. کەلوپەلەکانمان هەموو دەستکرد بوون، لە داری گێلاس و بەڕوو دروست کرابوون، بۆ هەر ژوورێکیش، نەخش و شێوازێکی تایبەتیی پێ درابوو. بە دەمی خۆم نەبێت، گەلێک جوان و دڵگیر بوون، بەڵام لای من، شتێکی ئاسایی بوون و ئەوەندە گرنگ نەبوون. تەنیا ماڵێکە و هیچی تر. خۆشترین بەشی خانووەکەمان بۆ من، پەنجەرەی ژوورەکەی خۆم بوو لە نهۆمی سەرەوە، کە دەچووە سەر باڵکۆنەکە و لەوێوە شەوان درەنگ خۆم دەدزییەوە بۆ پشت کڵێساکە بۆ چەرەسخواردن.

ئیدی بەنێو هەموو ژوورەکاندا گێڕام، بردمە ژووری میوانەکە، ژووری کتێبخانەکەمان، هۆڵی دانیشتنەکە، لەگەڵ هەر ژوورێکدا، جەیمی لە واقوڕماویدا چاوەکانی زیاتر ئەبڵەق دەبوو. دایکم لە دەرەوە، لەخوار دالانەکەوە دانیشتبوو، شەربەتێکی گرتبوو بە دەستەوە و کتێبی دەخوێندەوە. گوێی لە دەنگمان بوو لە ژوورەوە. هاتە ژوورەوە و بەخێرهاتنی کرد.

وا بزانم پێشتر پێم گوتن کە هەموو ژن و پیاوە گەورەکانی شارۆچکەکەمان جەیمییان خۆش دەویست، بێگومان دایکیشم. هەرچەند هێگبێرت زۆربەی جار لە وتارەکانیدا ناوی

بنەماڵەکەی ئێمەی بە خراپ دەهێنا، بەڵام دایکم جەیمیی هەر خۆش دەویست و قەت نەیدەخستە ملی ئەو، چونکە کچێکی دڵساف و ڕۆحسووک بوو. ئیدی ئەوان هەردوو پێکەوە قسەیان دەکرد و منیش چوومە نهۆمی سەرەوە، نێو کەنتۆرەکەم دەگەڕام بۆ کراس و بۆینباخێکی پاک. ئەو دەمە کوڕان گەلێک جار بۆینباخیان دەبەست، بەتایبەت گەر چاوپێکەوتنێکیان هەبووایە لەگەڵ کەسێکی پلەداردا. تا خۆم گۆڕی و هاتمە خوارەوە، جەیمی باسی تەگبیری ڕۆیشتنەکەمانی بۆ خانەی هەتیوان بۆ دایکم کردبوو.

جەیمی بە بزەیەکی نەرمەوە بە دایکمی وت، "بیرۆکەیەکی گەلێک جوانە، بەڕاستی لاندن دڵێکی زۆر باش و تایبەتی هەیە."

دایکیشم - بڕوای نەدەکرد گوێی لەم قسانە بێت و بە شان و باڵی مندا هەڵبدەن - بڕۆکانی وێک هێنانەوە و بەحەپەساوی لێم ڕاما. بە جۆرێک چاوی سەرنجی تێ بڕیم، وەک بڵێی لە ئاسمانەوە بەر بوو‌بێتمەوە.

ئەوجا دایکم وتی، "کەواتە ئەمە بیرۆکەی تۆ بووە؟" وەک هەموو خەڵکی تری شارۆچکەکە، دایکیشم دەیزانی جەیمی قەت درۆ ناکات.

قوڕگم بۆ پاک کردەوە، لە زەینیشمدا، هەر بیرم لەو ئێریکە دەکردەوە، چۆن تووشی ئەمەی کردم، خوا خێری نەنووسێ.

وتم، "تەقریبەن."

دایکیشم وتی، "جوانە." تەنیا ئەو وشەیەی لە زار دەر پەڕی و هیچی تر. ئاگای لە وردەکارییەکانی ئیشەکە نەبوو، لێ دەیزانی ڕەنگە بەزۆر دابێتیان بەسەرمدا، چونکە من

شتی وام لێ نەدەوەشایەوە. دایکان باش منداڵەکانی خۆیان دەناسن، دەمبینی دایکم، وەک ئەوەی بڕوا نەکات، هەر بە چاوی تێڕامانەوە سەرنجی دەدام. منیش بۆ ئەوەی خۆم لەم تەماشاکردنەی قوتار بکەم، سەرنجم دایە کاتژمێرەکەی دەستم و بەدرۆوە خۆم تێک دا و بە جەیمیم گوت، درەنگە با بڕۆین. ئەوجا دایکم چوو سویچی ئۆتومبێلەکەی لە جانتاکەیدا دەر هێنا و دایە دەستم. تا لە دەرگاکەش چووینە دەرەوە، هەر بڕوای نەدەکرد ئەوە من بم. ئاهێکی ڕزگاربوونم پێدا هاتەوە، وەک ئەوەی لە چنگ شەپۆلی لافاوێک قوتارم بووبێت، بەڵام کە بەرەو لای ئۆتومبێلەکە دەچووین، گوێم لێ بوو دایکم بە دەنگی بەرز وتی، "جەیمی، سەرمان لێ بدەرەوە. هەرکاتێک هاتی، بەخێر بێیت."

تا پێمان نایە نێو ئۆتومبێلەکەشەوە، من لە پەستی و بێزاریدا هەر سەرم ڕادەوەشاند.

جەیمی وتی، "دایکت ژنێکی باشە."

ئۆتومبێلەکەم ئیش پێ کرد و وتم، "بەڵێ، وایە، ژنێکی چاکە."

"ماڵەکەشتان زۆر خۆشە."

"ڕاستە."

"دەبێت شوکرانەبژێر بیت."

بەمەغزاوە وتم، "بێگومان، هەر وایە. من بەختەوەرتین کەسم."

لێ ئەو لە مەغزای قسەکانم تێنەدەگەیشت.

ئەو دەمەی ئێمە گەیشتینە خانەی هەتیوان، ئاسمان خەریک بوو تاریک دادەهات. یەک-دوو خولەک پێش وادەی

خۆی گەیشتینە جێ، کە پێمان نایە ژوورەوە، بەڕێوەبەری خانەکە بە تەلەفۆن قسەی دەکرد. تەلەفۆنێکی گرنگی بۆ هاتبوو، لەبەر ئەوە، ڕاست لەو کاتەدا نەیتوانی چاوی پێمان بکەوێت، ئیدی کەمێک پشوومان دا، تا ئەویش لە قسەکانی بووەوە. لە هۆڵی تەنیشت ژوورەکەی، لەسەر ڕیزێک کورسی دانیشتین و چاوەڕوان بووین. لەو کاتەدا جەیمی ڕووی کردە من، کتێبی ئینجیلەکەی لەسەر کۆشی دانابوو. وا بزانم بۆ ئەوە هێنابووی، تا کارمان خێر بێت، بەڵام ئیتر دایمەی خواش بە دەستیەوە بوو.

ڕووی تێ کردم و وتی، "ئەمڕۆ زۆر باش بوویت، قەسدم ئەوەیە، لەگەڵ دەقەکانتدا زۆر باش دەڕۆیشتیت، هەموویت لەبەر کردبوو."

"سوپاس." هەستم دەکرد شانازی بە خۆمەوە دەکەم و لە هەمان کاتیشدا نائومێدی و پەژارە دای دەگرتم. "هێشتا بەتەواوی فێری ڕیتمەکان نەبووم." نزام دەکرد، خوایە گیان ئێستا نەڵێت دەی با لێرە، لەسەر ئەم کورسییانە فێرت بکەم.

وتی، "هیچ نییە، ئاسانن، کە هەموو دەقەکانت لەبەر کرد، ئەوانیش ئاسان دێن بە دەستەوە."

"هیوادارم وا بێت."

جەیمی بزەیەکی کرد و پاش کەمێکی تر بابەتەکەی گۆڕی، لێی پرسیم، "لاندن، تۆ قەت بیر لە ڕۆژانی داهاتوو دەکەیتەوە؟"

بە پرسیارەکەی واقم وڕ ما، چونکە پرسیارێکی... زۆر سادە بوو.

پێش ئەوەی وەڵامی بدەمەوە، لە زەینمدا وردم کردەوە و

ئەوجا وتم، "بەڵێ، بەدڵنیاییەوە، ئەی چۆن."

"دەی کەواتە پێم بڵێ، دەتەوێت ژیانت بەرەو کوێ بەریت؟"

شانێکم هەڵتەکاند، کەمێک تێرامام، بزانم قەسدی لەم پرسیارە چییە. وتم، "هێشتا نازانم. جارێ بیرم لێ نەکردووەتەوە. گەر خوا بیکا، پاییزی داهاتوو بەنیازم بچم بۆ زانکۆی کارۆلاینای باکوور. پێشتر دەبێت فۆڕمی وەرگرتن پێشکەش بکەم و وەر بگیرێم. هیوادارم وا بێت."

"وەر دەگیرێیت."

"چۆن دەزانیت؟"

"چونکە نزای خێرم بۆ کردوویت."

کە ئەمەی گوت، گوتم بە خوا ئیتر باسەکەمان بوو بە بابەتی نزا و پاڕانەوە و دین و ئیمان، لێ باش بوو پرسیارێکی تری تێ گرتم، "ئەی دوای ئەوەی کۆلێژت تەواو کرد، نیازی چیت هەیە بیکەیت؟"

بە شانەهەڵتەکاندنێکەوە وتم، "نازانم، ڕەنگە وەک هێنری پرێستن ببم بە کابرایەکی یەکقۆڵ و دار ببڕمەوە."

هیچ پێکەنینی بەم قسەیەم نەهات.

بە تۆنێکی جیددییەوە وتی، "بە ڕای من، باشتر وایە ببیتە قەشەی کڵێسا. هەست دەکەم تۆ کەسێکی دڵسافیت و لەگەڵ خەڵکدا باشیت، ئەوانیش ڕێزت دەگرن."

هەرچەند ئەمەی باسی کرد بە مێشکمدا نەدەچوو، بەڵام دەشمزانی ئەم قسەی لە ناخی دڵیەوە کرد، وەک دەستخۆشیکردنێک بۆ من.

وتم، "سوپاس، جارێ نازانم، بیرم لێ نەکردووەتەوە،

بەڵام بەدڵنیابییەوە کارێک دەدۆزمەوە." کەمێکی پێ چوو، ئەوجا هاتمەوە هۆش خۆم، کە قسەکانمان تەواو بووە و سەرەی منە پرسیاری لێ بکەم.

"ئەی تۆ؟ تۆ دەتەوێت لە داهاتوودا چی بکەیت؟"

جەیمی ڕووی وەر چەرخاند و لە ئاسۆیەکی دووری ڕوانی، دەمگوت باشە دەبێت بیر لە چی بکاتەوە، بەڵام هەر زوو هۆش هاتەوە و بەهێمنی وتی، "دەمەوێت ژیانی هاوسەری پێک بێنم. ئەوجا دەمەوێت باوکم دەستم بگرێت و بەنێوان ڕیزی کورسییەکانی کەنیسەکەدا بمبات، حەز دەکەم هەرچی دەناسم، لەوێ ئامادە بن، کەنیسەکە جمەی بێت لە جەنجاڵیی خزم و ناسیاو."

"هەر ئەوەندە؟"

"بەڵێ، تەنیا ئەوەندە و هیچی تر."

بە بیستنی ئەم وەڵامەی، گوتم دیارە دەترسێ چارەنووسی وەک خاتوو گاربەری لێ بێت و قەت شوو نەکات، بۆیە تەقلام دا لە بیری بەرمەوە و دڵی خۆش بکەم، هەرچەند بەلامەوە شتێکی پڕوپووچ بوو.

"ڕۆژێک دێت شوو بکەیت، ڕۆژێک هەر دێت کەسێکی باش بناسیت و پەیوەندییەکی قووڵتان هەبێت، ئەوجا ئەویش داوات لێ دەکات شووی پێ بکەیت. دڵنیاشم باوکت پێی خۆش دەبێت لە کەنیسەکەدا دەستت بگرێت و بەنێوان ڕیزەکورسییەکاندا بتبات." باسی ئەوەم نەکرد، کە کەنیسەکە لە جانجاڵیدا جمەی بێت. چونکە نەدەچووە عەقڵمەوە ئاوها بێت.

جەیمی بەوردی بیرێکی لە وەڵامەکەم کردەوە، ئەویش بە هەمان دەستووری من وەڵامی دامەوە، بەڵام نازانم بۆ.

"هیوادارم وا بێت."

دیار بوو نەیدەویست چیی تر لەسەری بڕۆین، ئیتر نازانم لێم مەپرسن چۆن، بۆیە بابەتەکەم گۆڕی و قسەیەکی ترم هێنایە پێشێ.

وتم، "لە کەییەوە هاتوچۆی ئەم خانەی هەتیوانە دەکەیت؟"

ئەویش وتی، "تاکوو ئێستا، حەوت ساڵ دەبێت سەردانی ئەم خانەیە دەکەم. یەکەم جار کە هاتم بۆ ئێرە، تەمەنم دە ساڵ دەبوو، لە زۆربەی منداڵەکانی تر بچووکتر بووم."

"دڵت بەم شوێنە دەکرێتەوە، یان بێتاقەتت دەکات؟"

"هەردووکیان. هەندێک لە منداڵەکانی ئەم خانەیە، لە بارودۆخێکی گەلێک خراپ و ناهەمواردا بوون. کە گوێ لە بەسەرهاتیان دەگریت، یروسکەیەکی جەرگبڕ بە گیانتدا دێت. بەڵام کاتێکیش دەتبینن بە خۆت و هەندێک کتێب و دەستودیارییەوە دەچیت بۆ لایان، بزەو خەندەی سەر لێوانیان جێی هەموو خەم و ئازارەکانیان دەگرێتەوە. هەستێکی گەلێک شادیبەخشە."

کە قسانی دەکرد، ڕەنگوڕووی وەک پشکۆ دەگەشایەوە. هەرچەند کە ئەم قسانەی بۆ دەکردم، بۆ ئەوە نەیدەکرد من هەست بە تاوانباری بکەم، بەڵام ئیتر من بۆخۆم وام لێک دەدایەوە. هەر لەبەر ئەمەش بوو، هاوڕێیەتیکردنی جەیمی تا ڕادەیەک زەحمەت بوو، لێ من وردەوردە لەگەڵی ڕاهاتم. ئەم کچە دەیتوانی بە هەموو جۆرێک دڵت بگوشێ، بێ ئەوەی درکی پێ بکەیت.

لەو ساتەدا بوو، بەڕێوەبەری خانەکە دەرگای نووسینگەکەی خۆی کردەوە و فەرمووی لێ کردین.

ژوورەکە کتومت دەتگوت قاوشی نەخۆشخانەیە، زەوییەکەی کاشییەکی ڕەش و سپی، دیوارەکان و سەقفەکەیش هەر سپی، لەگەڵ ڕیزێک دۆلاب و چەکمەجەش پاڵ درابوو بە دیوارەکەوە. لەولاشەوە مێزێکی لێ دانرابوو، دەتگوت لە مێزێکی درێژتریان بڕیوەتەوە و هێناویانەتە ئێرە. خاڵی بوو لە هەرشتێکی پێویستی ناو نووسینگە. بگرە وێنەیەکیشی لەسەر نەبوو.

جەیمی منی بە جەنکینزی بەڕێوەبەر ناساند و تەوقەمان کرد. دانیشتین و جەیمی سەری قسەی لەگەڵ بەڕێوەبەردا کردەوە، دیار بوو یەکدییان لەمێژ بوو دەناسی، چونکە فەرمووی لێ کردین و چووینە ژوورەوە، باوەشێکی گەرمیان بەیەکدا کرد. پاش بەخێرهاتن و هەواڵپرسین، جەیمی باسەکەی لەگەڵدا کردەوە. جەنکینز شانۆگەرییەکانی ساڵانی تری بینیبوو، بۆیە هەر کە جەیمی سەری باسەکەی دەر خست، ئەویش ڕاست زانیی باسی چیی بۆ دەکات. بەڵام هەرچەند گەلێک جەیمیی خۆش دەویست و دەیشیزانی چەند مەبەستێتی، کەچی بیرۆکەی کارەکەمانی بە دڵ نەبوو.

وتی، "لەو بڕوایەدا نیم کارێکی باش بێت."

ئەم قسەیەی کرد، بۆیە دەڵێم بە دڵی نەبوو.

جەیمی ڕووی گرژ کرد و لێی پرسی، "بۆچی کارێکی باش نابێت؟" بەئاشکرا پێوەی دیار بوو واقی وڕ ما لە کەمتەرخەمی و پەرۆشنەبوونی بەڕێوەبەر بەرامبەر بەم کارەمان.

بەڕێوەبەر پێنووسێکی لەسەر مێزەکەی هەڵگرت و بەدەم قسەوە تەقتەق دەیکێشا بەسەر مێزەکەیدا، دیار بوو لە

زەینی خۆیدا وردی دەکردەوە و دەیهێنا و دەیبرد. ئەوسا پێنووسەکەی دانا و هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا. وتی، "ڕاستە داواکەتان بەجێیە و دەشزانم حەز دەکەن کارێکی مرۆڤدۆستانە بکەن، شانۆگەرییەکە باس لە باوکێک دەکات، کە دواجار هۆشی بە خۆی دێتەوە و هەست دەکات چەندە کچە تاقانەکەی خۆش دەوێت،" هەنگێ بێدەنگ بوو، جارێکی دی پێنووسەکەی بەردەمی گرتەوە بە دەستەوە و ئەوجا بەردەوامیی دا بە قسەکانی، "لێرە یادکردنەوەی جەژنی کریسمس، بەبێ دڵخۆشکردنی منداڵەکان، گەلێک سەختە. بە بڕوای من، گەر یەکی دیارییەک بۆ منداڵەکان..."

هیچ پێویستی نەدەکرد قسەکەی تەواو بکات. جەیمی دەستی برد بۆ دەمی خۆی و دەستبەجێ وتی، "ئای خوایە گیان، تۆ ڕاست دەکەیت. من ئەوەم بە خەیاڵدا نەهاتبوو."

پیاو ڕاست بڕوا، منیش شتی وام هەر بە مێشکدا نەهاتبوو. جەنکینزی بەڕێوەبەر ڕاستی دەکرد، قسەکەی جوان بوو.

بە هەرحاڵ، سوپاسی کردین و ئەوجا باسی تەگبیرەکەی خۆی بۆ کردین. وتی، "ئێوارەی جەژنی کریسمس درەختێکی سنەوبەری بچووک و هەندێک دیاری دەهێنین - دیارییەکانیش وا بن، کە هەموویان بتوانن یاریی پێ بکەن. بە هاتنی ئێوەش، گەلێک خۆشحاڵ دەبین..."

دوای ئەوەی ماڵئاواییمان لە بەڕێوەبەری خانەکە کرد، هەردووکمان، بێ ئەوەی هیچ لەگەڵ یەکدا بڵێین، هاتینە دەرەوە. دیار بوو جەیمی لە دڵەوە بێتاقەت بوو. تا زیاتر لەگەڵ جەیمی بوومایە، زیاتر شارەزای هەستونەستەکانی دەبووم - بۆم دەر کەوت ئەم کچە هەموو کات دڵخۆش

و کامەران نەبوو. ئەوە یەکەمین جارم بوو، درکم پێ کرد ئەویش لە هەندێک ڕووەوە هیچ جیاوازیی نەبوو لەگەڵ ئێمەدا.

بە دەنگێکی کز و مات وتم، "پێم ناخۆش بوو کارەکانمان سەری نەگرت."

"منیش."

جارێکی دی نیگای گواستەوە بۆ ئاسۆیەکی دوور، وەک بڵێی کەوتبێتە نێو دونیای خەیاڵەوە، کەمێکی پێ چوو، ئەوجا پەتی خەیاڵی بچڕاند و وتی، "تەنیا ویستم ئەمساڵ شتێکی جیاوازتر لە ساڵانی پێشوو بۆ ئەو منداڵە هەتیوانە بکەم. شتێکی تایبەت، کە هەرگیز لەبیریان نەچێتەوە. وام زانی ئەو نمایشە باشترین دیاری دەبێت بۆ ئەوان..." ئاهێکی هەڵکێشا و بەردەوامیی دا بە قسەکانی، "دیارە قەدەری خودای گەورە وایە و شتێکی تری بۆ داناوین و هێشتا نایزانین چییە."

بۆ ساتێک بێدەنگی باڵی بەسەردا کێشا، ئەمنیش سەرنجێکم دایێ. دیتنی جەیمی بەو ڕوخسارە خەماوییەوە، دڵی دەپروکاندم. لە ڕاستیدا من شایانی ئەو خەم و پەژارەیە بووم، نەک ئەو - چونکە خۆم دەمزانی چ جۆرە کەسێکم، بەڵام ئەو...

بێدەنگییەکەم شکاند و وتم، "هەتا لێرەین، ناتەوێ بچیت سەرێک لە منداڵەکان بدەیت؟" ئەوە تەنیا شت بوو بە خەیاڵمدا هات، تا هیچ نەبێت، کەمێک لەو بێتاقەتییەی جەیمی کەم بکاتەوە. "تا تۆ دێیتەوە، من لێرە چاوەڕوانت دەکەم، گەر نا، با بچین سواری ئوتومبێلەکە ببین."

ئەویش وتی، "تۆش دێیت لەگەڵمدا بچین بۆ لایان؟"

ڕاستیتان دەوێ، لـە خـۆم دڵنیـا نەبـووم بتوانـم یـان نـا، بـەڵام دەشمزانی جەیمی حـەزی دەکرد لەگەڵی بچم. هێند دڵی تەنـگ بـوو، بـە جۆرێـک، نەمدەتوانـی دڵـی بشـکێنم.

"بەڵێ، منیش دێم لەگەڵت."

وتـی، "ئێسـتا منداڵـەکان لـە هۆڵەکـەن، لـەم کاتـەدا پشـوویان هەیـە، لـەوێ یـاری دەکـەن."

بـە ڕاڕەوەکـەدا ڕۆیشـتین، لـە کۆتاییـیەکەیـدا دوو دەرگا هەبـوو، بەسـەر هۆڵێکـی فراوانـدا دەکرانـەوە. لـە قوژبنـی ئەوسـەری هۆڵەکـە، تەلەڤزیۆنێکـی بچـووک و نزیکـەی سـی کورسـیی بـەدەوردا دانرابـوون. منداڵـەکان لەسـەر کورسـیەکان بـوون، بەدیـار تەلەڤزیۆنەکـەوە خـڕ ببوونـەوە، دەتبینـی تەنیـا منداڵەکانـی پێشـەوە بەباشـی چاویـان لـە تەلەڤزیۆنەکەیـان دەبـوو.

چاوێکم بەنێو هۆڵەکـەدا گێـڕا. لـە سـووچێکی تـردا، مێزێکـی یاریـی تێنـس دانرابـوو. سـەر ڕووی مێزەکـە هەمـووی تـۆز و خـۆڵ و ڕووشـان و شـکاویی پێـوە بـوو، شـەبەکەی هـەر پێـوە نەمابـوو. دوو پەرداخـی سـەفەریی سـپیی لەسـەر بـوو، دەتگوت چەنـد سـاڵێکە کـەس توخنـی نەکەوتـووە. دیوارەکـەی تەنیشـت مێـزی تێنسـەکە، ڕیزێـک ڕەفـەی پێـدا هەڵواسـرابوو، لێـرە و لـەوێ، هەندێـک بووکەڵـە و یاریـی منداڵانـەش خرابوونـە سـەر ڕەفـەکان. شـتەکان زۆر نەبـوون، ئـەوەی هەشـبوو هێنـد کـۆن بـوون، دەتگـوت چەندین سـاڵە بـەکار دێـن. لەتـەک دیوارەکەی لای خۆشـمەوە، چەنـد مێزێکـی یەکنەفەریـی بچووکـی لـێ بـوو، لەگـەڵ کۆمەڵێک کاغـەزی ڕۆژنامـە، کـە بـە سلەبۆیە منداڵەکان لەسـەریان نووسـیبوون و وێنەیـان کێشـابوو.

لەناو دەرگای هۆڵەکەدا بۆ ساتێک وەستاین. هێشتا منداڵەکان ئێمەیان نەدیتبوو. لە جەیمیم پرسی، ئەم ڕۆژنامانەیان بۆ چییە؟ ئەویش بەچرپە وەڵامی دامەوە، "کتێبی ڕەنگاوڕەنگی منداڵانەیان نییە، بۆیە ئەم ڕۆژنامانە بەکار دەهێنن." کە قسەکانی دەکرد، ڕووی لە من نەبوو، تەماشای منداڵەکانی دەکرد. جارێکی دی بزەی سەر لێوی بۆ گەڕابووەوە.

لێم پرسی، "تەنیا ئەم تۆزە بووکەڵە و یارییانەیان هەیە خۆیانی پێوە خەریک بکەن؟"

سەرێکی ئەرێنی لەقاند و وتی، "بەڵێ، جگە لە یاریەکانی تری ژوورەکانی خۆیان، کە نابێت بیهێننە دەرەوە. لێرەش، لەم هۆڵەدا، تەنیا ئەو تۆزە بووکەڵانەیان هەیە، کە بە چاوی خۆت دەیانبینی."

وا بزانم جەیمی بەم حاڵەی منداڵە هەتیوەکان ڕاهاتبوو. کەچی من کە ئەم هۆڵە پەرشوبڵاو و خاڵییەم بینی، دڵی دەپرواندم. گەر من بۆخۆم منداڵ بوومایە، نەمدەتوانی لەم شوێنەدا گەورە ببم.

ئەوجا لەنێو دەرگاکە پێمان نایە ژوورەوە، یەکێک لە منداڵەکان بە دەنگی پێمان ئاوڕی دایەوە. تەمەنی نزیکەی هەشت یان زیاتر دەبوو، قژی سوور و ڕوخساریشی کونجکونجاوی، دوو ددانەکەی پێشەوەی کەوتبوون.

هەر کە چاوی بە ئێمە کەوت، لە خۆشیدا هاواری کرد، "جەیمی!" ئیدی هەموو ئەوانی تریش بە هاوارەکەی ئەو ئاوڕیان دایەوە. منداڵەکان تەمەنیان لەنێوان پێنج بۆ دوازدە ساڵاندا دەبوون، ژمارەی کوڕەکان زۆرتر بوون وەک لە

کچەکان. دواتر زانیم ئەم منداڵانە، دوای ئەوەی تەمەنی دوازدەساڵی تێدەپەڕێنن، دەیاننێرن بۆ ئەو خێزانانەی منداڵە بێکەسەکان لە خۆیان دەگرن و بەخێویان دەکەن.

"سڵاو ڕۆجەر، تەندروستیت چۆنە؟"

ئیدی ڕۆجەر و هەندێکی تر لە منداڵەکان لێمان خڕ بوونەوە. ئەوانی دیکەش، کە کورسییەکانی پێشەوە چۆڵ بوون، چوونە بەردەم تەلەڤزیۆنەکە و گوێیان نەدا بە ئێمە. یەکێک لە منداڵە هەراشەکان کە هاتبووە دەورمان، لە جەیمیی پرسی ئاخۆ من کەپڵی ئەوم، ئەویش پێی ناساندم. بە دەنگی ئەو منداڵەدا دیار بوو، وەک برادەرەکانی قوتابخەنەم، هەمان بۆچوونی هەبوو بەرامبەر بە جەیمی.

جەیمی پێی وت، "نا، تەنیا هاوڕێیەکە و هیچی تر. بەڵام زۆر کوڕی چاکە." نزیکەی کاتژمێرێک لایان ماینەوە. منداڵەکان پرسیاری زۆریان لێ کردم، ماڵتان لەکوێیە؟ خانووەکەتان خۆشە؟ چ جۆرە ئوتومبێلێکت پێیە؟ دواتر کە وەختی ڕۆیشتنمان هات، جەیمی بەڵێنی پێ دان زوو سەریان لێ بداتەوە. بەڵام لە بەڵێنەکەیدا ناوی منی نەهێنا لەگەڵی دێمەوە یان نا.

کە بەرەو ئوتومبێلەکە دەڕۆیشتین، وتم، "زۆر ڕۆحسووکن، پێم خۆشە کە یارمەتییان دەدەیت."

سەرنجێکی دام و بزەیەکی کرد. هیچی نەگوت. دیار بوو هێشتا لە زەینیدا بیری دەکردەوە بۆ کریسمس چییان بۆ بکات بۆ منداڵەکان.

# ٧

لە دەمەدەمی سەرەتای مانگی کانوونی یەکەمدا، کە ئەو کاتە دوو هەفتە زیاتر دەبوو دەستمان کردبوو بە ڕاهێنانەکان، ڕۆژگار دابووی لە کورتی، بۆیە خاتوو گاربەر زوو ئیزنی دەداین دەست هەڵبگرین و بچینەوە ماڵەوە. جەیمی داوای لێ کردم، ئێواران تا ماڵەوە بیگەیەنم. نازانم لەبەر چی بوو. خۆ بیوفۆرت شوێنێکی پارێزراو بوو، هەرگیز نەتدەبیست تاوانێک یان کوشتنێکی تێدا ڕوو بدات. یەک جار شتێکی وا ڕووی دا، ئەویش شەش ساڵ لەوەوبەر، لە گوزەری ماوریس، کە شوێنی خواردن و خواردنەوە بوو، کابرایەکیان کوشت، با ئەوەش بڵێم، گوزەرەکە شوێنی خەڵکی وەک لیو بوو. ئیتر تا کاتژمێرێک دواتریش، خەڵکەکە هەموو ترسیان لێ نیشت و کەوتنە تەلەفۆنکردن بۆ یەکدی، شارۆچکەکە بەتەواوی خرۆشا، هەموو دەرگایان قاییم کرد و پیاوەکانیش بە چەک و دەمانچەوە، هەرکەسە لە پەنجەرەی ماڵی خۆیەوە چاودێریی شەقامەکانیان دەکرد، نەبا پیاوخراپێک لەوێوە ڕەت ببێت. بەڵام پێش ئەوەی شەو دابێت، کاتێک کابرای تاوانبار خۆی ڕادەستی پۆلیس کرد، ئیدی هەموو شتێک خامۆش بووەوە.

بە گوتەی کابرا، لە بارێکدا لەگەڵ کوژراوەکە لەسەر قومار شەڕیان بووە، ئەمیش بێمەبەست فیشەکی لە دەست دەر چووە. دواجار کابرای تاوانبار بە تاوانی کوشتنی نمرە دوو حوکمی شەش ساڵ زیندانییان بەسەردا سەپاند و فڕێیان دایە ئەودیو دەرگای بەندیخانەوە. پۆلیسی شارۆچکەکەمان هەر بۆڵەیان دێت و دەڵێن، گوایە ئیشەکەیان گەلێک قورس و گرانە، کەچی ساڵ دوازدەی مانگیش بە شانازیکردنەوە دێن و دەچن، یان لە قاوەخانەکان دادەنیشن و باسی ئازایەتیی خۆیان و ئەو تاوانە گەورەیە دەکەن، وەک بڵێی شارێکیان ڕزگار کردبێت. یەکێ نەزانێت، دەڵێ ئەمانە شەو و ڕۆژ لە ئامادەباشیدان، پشوویان نییە.

ڕاستییەکەی،ماڵی جەیمی هەر لەسەر ڕێگەکەی من بوو، ئێ نەشدەکرا بڵێم ناتوانم بتگەیەنم، لێم زویر دەبوو. بەهەڵە لێم تێمەگەن، لەبەر ئەوە نییە حەزم لێ کردبێت یان شتێک، بەڵام بۆخۆتان حوکم بدەن، گەر هەموو ڕۆژێک چەند کاتژمێرێک لەگەڵ کەسێکدا ڕاهێنانت هەبێت و تا هەفتەیەکی دواتریش هەر لەگەڵیدا بەردەوام بیت، ئایا دەکرێ کارێکی وا بکەیت شەرمەزاری لای یەکدی بین و بۆ بەیانی کە هاتیتەوە، لە ڕووت نەیەت سەر هەڵببڕی و تەماشای بکەیت؟

ئەو هەفتەیە، لە ڕۆژانی هەینی و شەممەدا بڕیار بوو شانۆگەرییەکە نمایش بکرێت، خەڵکێکی زۆر چاوەڕوانیان دەکرد. خاتوو گاربەر بە توانای من و جەیمی گەلێک سەرسام و بەئومێد بوو، بەردەوام لای خوێندکارەکانی تر مەدحی دەکردین و دەیگوت، ئەم شانۆگەرییەی ئەمساڵ، باشترین نمایش دەبێت لە مێژووی خوێندنگەکەماندا. خاتوو

گاربەر لە پیاهەڵدانـدا دەستێکی باڵای هەبوو. ئێزگەیەکی ڕادیۆ هەبوو لە شارۆچکەکە، تا ئەو کاتە یەک-دوو جار چاوپێکەوتنیان لەگەڵ ئەنجام دابوو. لە چاوپێکەوتنەکەدا گوتبووی، "نمایشێکی گەلێک نایاب دەبێت." جگە لەوەش، پەیوەندیی کردبوو بە ڕۆژنامە ناوخۆییەکەوە، ئەوانیش بڕیاریان دابوو ڕاپۆرتێکی لەبارەوە بنووسن، زیاتر لەبەر پەیوەندیی نێوان جەیمی و هێگبێرت بوو لە شانۆگەرییەکەدا، گەرچی پێشتر هەموو خەڵک ئەمەیان دەزانی. خاتوو گاربەر بێوچان و بێ ماندوبوون کاری دەکرد. ئەو ڕۆژە پێی گوتین، کە هۆڵی شانۆگەرییەکە بەنیازن کورسیی زیاتر بێنن، تا جێگەی خەڵکی زیاتر ببێتەوە، چونکە وا چاوەڕوان دەکرێت گەلێک جەنجاڵ ببێت. پۆلەکەمان کە ئەمەیان بیست، هەراوهوریای خۆشیان لێ هەڵسا، بەڵام هەمووشمان نا، بەڵکوو هەندێکمان. گەر لەبیرتان مابێت، خەڵکی وەک ئێدیمان لەگەڵ بوو لە پۆلدا. جا بۆیە لەوە دەچوو وای خەیاڵ کردبێت، کە بۆ یەکەمین جار لە ژیانیدا ڕەنگە بچێتە دڵی خەڵکییەوە. کێشەکەش ئەوە بوو، لەوانەیە ڕاست بێت.

ئێستا وێدەچێ ئێوەش وا خەیاڵ بکەن، کە ئەمنیش گەلێک دڵم پێی خۆش بووبێت، بەڵام ڕاستییەکەی، نەوەڵڵا، هیچ دڵم پێی خۆش نەبوو. برادەرەکانم لە قوتابخانە هێشتا هەر گاڵتەیان پێ دەکردم و سەریان دەخستە سەرم، لە لایەکی تریشەوە، دوانیوەڕۆیەک نەبوو کەمێک پشوو بدەم. تەنیا شت کە پاڵی پێوە دەنام بەردەوام ببم و بچم، ئەوە بوو هەستم دەکرد کارێکی باش و مرۆڤدۆستانەم لە ئەستۆ گرتووە. دەزانم زۆریش نییە، بەڵام هەر ئەوەندەم لە دەست دەهات.

جاروبار، هەرچەندیش لای کەس نەمگوتبوو، هەستێکی باشم لا دروست دەبوو بۆ ئەو نماییشە. دەمهێنایە بەر زەین، فریشتەکانی ئاسمان کۆ بوونەتەوە و بە پەرۆشەوە لێم دەڕوانن و فرمێسکی ئومێد بە چاوانیاندا دێتە خوار، باس لە ئازایەتی و قوربانیدانەکانم دەکەن.

ئیدی ئەو شەوە تا ماڵەوەم گەیاند، بیروهۆشم هەر لای نماییشەکە بوو، جەیمی لێی پرسیم، "ڕاستە دەڵێن تۆ و هەندێک لە هاوڕێکانت شەوان دەچن بۆ گۆڕستانەکەی پشت کڵێساکە؟"

پێم سەیر بوو ئەم پرسیارەی لێ کردم. هەرچەند شتەکە زۆر نهێنی نەبوو، بەڵام بڕواشم نەدەکرد گرنگی بە شتی وا بدات.

شانێکم هەڵتەکاند و وتم، "بەڵێ، جاروبار دەچین."

"جگە لە چەرەسخواردن، چیی تر دەکەن لەوێ؟"

بە خوا وا بزانم ئەوەیشی دەزانی.

منیش وتم، "بڵێم چی، تەنیا قسە دەکەین... گاڵتەوگەپ و ئەم جۆرە شتانە. هەر ئەوەیە حەز دەکەین بچینە ئەوێ و هیچی تر."

"قەت ناترسی لەو شوێنە؟"

"نا، بۆچی بترسم؟ تۆ لەوێ دەترسیت؟"

"نازانم. لەوانەیە بترسم."

"بۆچی؟"

"لەبەر ئەوەی دەترسم کارێکی هەڵە بکەم لەوێ."

منیش وتم، "ئێمە کە دەچینە ئەوێ، هیچ شتێکی خراپ ناکەین. مابەستم ئەوەیە، ناچین کێلەکان بشکێنین یان پیسی

و پاشەڕۆ بەجێ بێڵین." نەمویست ئەوەشی پێ بڵێم، کە لەوێ باسی هێنری پریستنی داربڕ دەکەین، چونکە دەمزانی حەزی بەو بابەتە نەدەکرد.

لێی پرسیم، "قەت بووە دانیشن و گوێ بۆ دەنگەکانی دەوروبەرتان هەڵبخەن؟ وەک دەنگی زریکەزریکی سیسرکەکان، یان خشەی گەڵاکان، کاتێک با هەڵدەکات؟ یان قەت بووە پاڵ بکەون و تەماشای ئەستێرەکان بکەن؟"

هەرچەندە جەیمی لە تەمەنی هەرزەکاریدا بوو، واتە حەقدە ساڵ دەبوو، کەچی هیچ شتێکی لەبارەی هەڵسوکەوتی هەرزەکارانەوە نەدەزانی، بۆ ئەو تێگەیشتن لە کوڕێکی تەمەن هەرزەکار، وەک ئەوە بوو هەوڵ بدات لە تیۆرێکی فیزیایی تێبگات لەبارەی تەنە جووڵاوەکانی گەردوونەوە.

وتم، "ڕاستییەکەی، نەوەڵڵا."

سەرێکی لەقاند. پاشان وتی، "گەر من بوومایە، وام دەکرد، مەبەستم ئەوەیە گەر بچم... چاوێکم بە دەوروبەردا دەگێڕا، تا شتەکان جوان ببینم، یان بەهێمنی دادەنیشتم و گوێم لە دەنگەکان دەگرت."

کە ئەم قسانەی دەکرد، پێم سەیر بوو، بەڵام خۆشم تێک نەدەدا. لە ڕێگە کەمێکی تر، بێ ئەوەی هیچ لەگەڵ یکتر بڵێین، بێدەنگ ڕێمان دەکرد. لە دڵی خۆمدا دەمگوت، مادام ئەو هەندێک پرسیاری لەبارەی منەوە کرد، کەواتە با منیش هەندێک شتی لێ بپرسم لەبارەی خۆیەوە.

"ئەی تۆ کارت چییە؟ مەبەستم ئەوەیە، جگە لە یارمەتیدانی منداڵە هەتیوەکان و ئاژەڵە برینداره‌کان و خوێندنەوەی ئینجیل." بگرە بەلای خۆشمەوە شتێکی بێمانا بوو، لێ ئیتر

ئەمە ئیشی ئەو بوو.

سەرنجێکی دام و بزەیەکی کرد. وا بزانم ئەویش بە پرسیارەکەم واقی وڕ ما، تەنانەت زیاتر بەوەش سەرسام بوو، کە ئەوها گرنگیی پێ دەدەم.

وتی، "گەلێک شت هەیە بیکەم. پێداچوونەوە بە وانەکانمدا دەکەم، کاتیش تەرخان دەکەم بۆ باوکم. جاروبار پێکەوە یاریی کۆنکەن دەکەین. ئیتر ئەو شتانە."

"قەت لەگەڵ هاورێکانتدا دەچیتە دەرەوە و پیاسە بکەن؟"

"نا." بە وەڵامەکەیدا دیار بوو هاورێکانیشی تاقەتی ئەویان نەبووە لەگەڵی بچنە دەرەوە.

پاشان بابەتەکەم گۆڕی و وتم، "دڵنیام زۆرت پێ خۆشە ساڵی داهاتوو بچیت بۆ زانکۆ."

کەمێکی پێ چوو، تا وەڵامی دامەوە.

بێ ئەوەی لە دەنگیدا هەستێکی نیگەرانیی پێوە دیار بێت، وتی، "بڕوا ناکەم بچم."

چاوەڕوانی وەڵامی ئاوهام لێ نەدەکرد. لە ڕاستییشدا، جەیمی لەچاو ئێمەدا، لە دواقۆناغی ئامادەیی بەرزترین نمرەی هەبوو لە زۆربەی وانەکاندا، جا بەپێی کۆتاییی وەرزی خوێندنی ئەو ساڵە، بووە یەکێک لە خوێندکارە یەکەمینەکان و لە ئاهەنگی دەرچووندا وتارێکی خوێندەوە. ئێمەش، هەر بۆ قەشمەری، لە کاتی وتارەکەیدا گرەومان دەکرد ئاخۆ چەند جار قەدەری خوایی لە قسەکانیدا دووبارە دەکاتەوە.

لێم پرسی، "ئەی ناچیت بۆ کێوی مەسیح؟ گوتم ڕەنگە نیازی ئەوێت هەبێت بچیت. تۆ حەزت لەو جۆرە شوێنانەیە."

نیگایەکی کردم و بە چاوداگرتنێکەوە وتی، "قەسدت

ئەوەیە، من بۆ ئەو شوێنانە باشم؟"

جاری وا هەبوو قسەیەکی دەکرد، وەک خەنجەر دەیکرد بە دڵتدا، جەرگی دەبڕیت.

خێرا وتم، "مەبەستم ئەوە نەبوو. تەنیا ویستم بڵێم، بیستوومە دەڵێن تۆ زۆر حەز دەکەیت ساڵی داهاتوو بچیت بۆ ئەوێ."

بێ ئەوەی وەڵامم بداتەوە، شانێکی نادڵنیاییی هەڵتەکاند، ئەوی ڕاستی بێ، نەمزانی قەسدی چ بوو لەو شانهەڵتەکاندنە. ئەو دەمە گەیشتبووینە بەردەمی ماڵەکەیان و لەسەر شۆستەکەی بەردەمیان وەستاین. سێبەرەکەی هێگبێرتم دەبینی، لەودیو پەردەی ژووری دانیشتنەکەیانەوە دیار بوو. گڵۆپی ژوورەکە هەڵکرابوو، ئەویش لەتەک پەنجەرەکەوە، لەسەر قەنەفەکەیان دانیشتبوو. سەری شۆڕ کردبووەوە، وەک ئەوەی شت بخوێنێتەوە. جگە لە ئینجیل، قابیلە دەبێت چیی تر بخوێنێتەوە؟

"لاندن، سوپاس کە تا ماڵەوە لەگەڵم هاتیت." پێش ئەوەی بەرەو دەرگاکەیان بڕوات، نیگایەکی کردم و ئەوجا ڕووی وەرچەرخاند و لێم جیا بووەوە.

کە تەماشام دەکرد بەرەو دەرگاکەی خۆیان دەچوو، ئەوەم بە خەیاڵدا هات، لەنێو هەموو ئەو ساتانەی پێکەوە گفتوگۆمان کردبوو، ئەمەی ئێستامان گەلێک نامۆتر بوو. سەرەڕای هەندێک لە وەڵامە سەیرەکانیشی، کەچی هێشتا ئاسایی دەهاتە بەرچاو.

شەوی دواتریش کە پێکەوە دەهاتینەوە، لە ڕێگە پرسیاری باوکمی لێ کردم.

منیش وتم، "زۆر باشە، عەیبی نییە. بەڵام زۆر لە ماڵ ناکەوێتەوە."

"ئەی بیری ناکەیت، کە زۆربەی کاتەکان لە ماڵ نابێت؟"

"هەندێک جار با."

ئەویش وتی، "منیش بیری دایکم دەکەم. هەرچەند قەت نەشمبینیوە و نەمناسیوە."

ئەوە یەکەمین جارم بوو، بزانم من و جەیمی لە ژیانماندا هەریەکە بە ئازارێکەوە دەناڵێنین.

لە دڵەوە پێم وت، "ڕەنگە زۆر سەخت بێت بۆ تۆ. هەرچەند باوکم زۆربەی کاتەکان لە ماڵ نییە، بەڵام هێشتا باشترە لەوەی هەرگیز نەیبینم."

هەر بە ڕێگەوە نیگایەکی کردم و ئەوجا ڕووی گواستەوە بەردەمی خۆی. جارێکی دی بەنەرمی دەستێکی بە قژی خۆیدا هێنا. جاروبار تێبینیم دەکرد، هەرکاتێک نەیزانیبایە چ بڵێت یان فشاری بۆ بهاتایە، ئاوها دەستێکی بە قژیدا دەهێنا.

وتی، "بەڵێ، زۆر سەختە. بەهەڵە لێم تێمەگە - لە ناخی دڵەوە باوکیشم گەلێک خۆش دەوێت - بەڵام جاری واش هەیە لە دڵی خۆمدا دەڵێم، گەر دایکم هەبووایە، ژیانم جۆرێکی تر دەبوو. ئەو کاتە زۆر شت، کە ناتوانم لەگەڵ باوکم باسی بکەم، بۆ دایکم باس دەکرد."

لە بیری خۆمدا گوتم، ئەمە مەبەستی باسوخواسی کوڕە. هەتا دواتر، ئەوجا بۆم دەر کەوت من چەند هەڵە بووم لەو گومانەی هەمبوو. بۆیە پیاو هەتا دڵنیا نەبێت لە شتێک، قەت گومان نەکا باشە.

"ژیانت لەگەڵ باوکتدا چۆنە؟ لەماڵیشەوە هەر وەک

کەنیسە هەڵسوکەوت دەکات؟"

"نا، باوکم لە ماڵەوە کەسێکی گەلێک قسەخۆش و قۆشمەچییە."

لە دەمم دەر چوو، بە سەرسوووڕمانەوە وتم، "ئەم هێگبێرتە؟" قەت بڕوام بە شتی وا نەدەکرد.

جەیمی واقی وڕ ما کە بەو جۆرە ناوی باوکیم هێنا، بەڵام گوێی نەدایێ و هیچی نەگوت. بەڵکوو وتی، "پێت سەیر نەبێت. گەر باش بیناسیت، خۆشت دەوێت."

"بڕوا ناکەم هەرگیز بیناسم."

ئەویش وتی، "وا مەڵێ، تۆ نازانیت قەدەری خوا چۆنە."

کە شتی وای دەگوت، ڕقم لێ دەبووەوە. دەتگوت ئەم کچە هەموو ڕۆژێک لەگەڵ خودا قسە دەکات، نازانم خودا لە سەرەوە چیی پێ گوتووە. درۆم نەکردبێ، ڕەنگە بلیتی بەهەشتی پێ بێت، بۆیە ئاوها هەموو شتێک دەزانێ.

وتم، "باشە پێم بڵێ، چۆن ڕوو دەدات بیناسم؟"

وەڵامی نەدامەوە، بەڵکوو بزەیەکی کرد، وەک بڵێی نهێنییەکی لا بێت و لە منی بشارێتەوە. وەکوو گوتم، بەم جۆرە ڕەفتارانەی دەهری دەبووم.

شەوی دواتر کە دەهاتینەوە، لە ڕێگە باسی کتێبی ئینجیلمان کرد.

لێم پرسی، "بۆچی هەمیشە ئەم کتێبەت بە دەستەوەیە و بۆ هەرکوێیەک بڕۆیت، لەگەڵ خۆت هەڵی دەگریت؟"

من بۆخۆم دەمگوت بۆیە دایمەی خوا ئەم کتێبەی بە دەستەوەیە، لەبەر ئەوەی کچی قەشەی کلێسایە. ئێ ئەمەش شتێکی ئاساییە، هیچ لام سەیر نەبوو. بەڵام ئەم کتێبەی ئەو

گەلێک کۆن و بەرگەکەیشی شەقوشڕ و دڕابوو. کەمێکی تر ڕێمان کرد، ئەوجا وەڵامی پرسیارەکەی دامەوە. تەنیا وتی، "ئەمە کتێبی دایکم بوو."

بروسکەیەکی تەلیسماوی بە هەناومدا هات، وەک ئەوەی پێم نابێت بە دەرزیەکدا، ئاوها ڕاچڵەکیم، وتم، "ببوورە..."

نیگایەکی کردم و وتی، "گوێی مەیەرێ، لاندن. تۆش چوزانی..."

"ببوورە، پرسیارێکی..."

وەستا و وتی، "نا، هیچ نییە. تۆش هیچ قەسدێکت نەبووە. ئەم کتێبە وەک دیاری پێشکەش بە دایکم و باوکم کرا لە ڕۆژی ئاهەنگی هاوسەرگیرییەکەیاندا. دایکم بەردەوام دەیخوێندەوە، بەتایبەت ئەو کاتانەی خەفەتێکی هەبووایە یان شتێکی ناخۆشی بهاتایە ڕێ."

هاتەوە یادم، دایکی، پێش جەیمی، شەش منداڵی تری لەبار چووبوو، دواتریش بەسەر ئەمەوە گیانی سپاردبوو.

بەردەوام بوو لە قسەکانی، "دایکم، وەک بۆم باس دەکەن، شەوان پێش ئەوەی بخەوێت حەزی کردووە کتێبەکەی بخوێنێتەوە، بگرە ئەو کاتەی منیش لەدایک بووم، لە نەخۆشخانەکە هەر بە دەستیەوە بووە. کاتێک باوکم هات و زانیی گیانی سپاردووە، من و کتێبەکەی دایکمی پێکەوە لە نەخۆشخانە هێنایەوە."

کاتێک کەسێک کارەساتێکی ناخۆشت بۆ دەگێڕێتەوە، تۆش چ بڵێیت، هەر دەبێت بڵێی، "وەڵلایی بەداخەوە، زۆرم پێ ناخۆشە."

"کە ئەم کتێبە بە دەستمەوە دەگرم، هەست دەکەم

بەشێکم لە بوونی دایکم. تێدەگەیت دەڵێم چی؟" ئەو بە دڵێکی تەنگەوە ئەم قسانەی نەدەکرد، تەنیا بۆ ئەوەی بوو وەڵامی پرسیارەکەی خۆم چنگ بکەوێت. کەچی من زیاتر دڵم گوشرا پێی.

جا کە باسی چیرۆکی خۆی بۆ کردم، ئەوەم هاتە پێشچاو، ئەم هەموو ساڵە لەگەڵ هێگبێرت گەورە بووە، بەڕاستییش نەمدەزانی چ بڵێم. لەو ساتانەدا بوو، لەپشتمانەوە گوێم لە هۆڕنی ئۆتومبێلێک بوو. من و جەیمی ئاوڕمان دایەوە، بینیمان ئۆتومبێلەکە لای دایە لای شۆستەکە و وەستا.

ئێریک و مارگرێت بوون، ئێریک لێی دەخوڕی و مارگرێتیش لەملا دانیشتبوو، بەلای شۆستەکەی ئێمەی لێ وەستابووین. ئێریک لەولاوە کەمێک سەری بەلای سوکانەکەدا شۆڕ کرد، تا ڕووی دەمی ببینین و وتی، "تەماشا، کێ دەبینین." من پێشتر پێم نەگوتبوو کە شەوان جەیمی دەبەمەوە ماڵەوە.

جەیمی دەستپێشخەریی کرد، "سڵاو، چۆنن؟"

ئێریک شەیتانانە پێدەکەنی، ئەمنیش لە پێکەنینەکەیدا هەستم کرد دەیەوێت بڵێت، "لاندن، ئەمەشت کرد؟ ئێوارانیش دەیبەیەوە؟"

پاش جەیمی، منیش سڵاوم لێ کردن، "ئێریک، چۆنی؟" باشە ئەم بەڵایە چ بوو تووشم هات، بە ملی شکاویان بۆ لێرەوە هاتن.

ئێریک هەر بەمەغزاوە وتی، "شەوێکی خۆشە بۆ پیاسەکردن، وا نییە؟" ئەم هەتیوە دەیزانی مارگرێت لەنێوان خۆی و جەیمیدا بوو، بۆیە ئاوها دەمی گەرم بوو لە ئاستیدا، دەنا وەک تر، نەیدەوێرا ئاوها زمان درێژ بکات. جا ئێریک

دەرفەتێکی ئاوها لەکیس خۆی نادات، هەر دەبێت قسەی خۆی بکات و وەک دووپشک پێمەوە بدات.

جەیمی سەرنجێکی دەوروبەری دا و وتی، "بەڵێ، شەوێکی خۆشە."

ئێریکیش چاوێکی خەمبارانەی بە دەوروبەردا گێڕا و هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا، خۆ من چاک دەمزانی ئەم شەیتانە بەئەنقەست خۆی خەمبار دەکرد و شۆخیی پێمان دەهات. وتی، "بەڕاستی جەوێکی خۆشە،" ئاهێکی هەڵکێشا و ڕووی کردەوە ئێمە، "حەزم دەکرد بتانگەیەنم، بەڵام پیاسەکردن بەژێر ئەستێرەکاندا گەلێک خۆشترە، وەک لەوەی بە ئوتومبێل بچنەوەماڵەوە، بۆیە نامەوێ لێتان تێک بدەم." یەکێ نەزانێت، پیاوەتیمان لەگەڵ دەکات.

جەیمی پێی وت، "نا، ئەوەندەمان نەماوە بگەینە ماڵی ئێمە. دەچین لەگەڵ لاندن کەمێک شەربەتی سێو دەخۆینەوە. ئێوەش، گەر پێتان خۆشە، وەرن، زۆرمان هەیە."

شەربەتی سێو؟ لە ماڵی ئەواندا؟ پێشتر شتی وای باس نەکردبوو...

دەستم ئاخنییە نێو گیرفانمەوە، بیرم دەکردەوە، باشە ئەمە چ بوو تووشی بووین.

ئەوانیش وتیان، "نەوەڵڵا، قەینا، ئێمە بەنیازین بچین بۆ کافتریاکە."

جەیمی وتی، "جا بەم شەوە دەچن؟ ئەی سەعیتان نییە؟"

ئێرکیش وەڵامی دایەوە، "زۆر لە دەرەوە نامێنینەوە، بەڵام دەبێت بڕۆین. کاتێکی خۆش لەگەڵ شەربەتەکەتاندا."

ئەوان ڕۆیشتن و جەیمی دەستی بۆ بەرز کردنەوە وتی،

"سوپاس بۆ هەواڵ پرسینتان."

ئێریک ئوتومبێلەکەی لێخوڕی، بەڵام بەخێرایی نەدەڕۆیشت. ڕەنگە جەیمی لە دڵی خۆیدا گوتبێتی، شوفێرێکی باش و لەسەرخۆیە. بەڵام وا نەبوو، هەرکاتێک خۆی بکێشایە بە دیوارێک یان ستوونێکی کارەبا یان هەرشتێکی تر، بە زمانی لووس خۆی لێ دەرباز دەکرد. بیرمە جارێکیان پێش و چەمەلەغی ئوتومبێلەکەی شکابوو، بە دایکی گوت، "دایکە، شتەکە زۆر کتوپڕ بوو، مانگایەک، کەس نەیدەزانی لەکوێوە دەر کەوت و وەک فیشەک هاتە بەردەمم، ئێ منیش فریای هیچ نەکەوتم و خۆم پێدا کێشا." ئێوە بۆخۆتان حوکم بەن، قەت بیستووتانە مانگا وەک فیشەک دەر بچێت؟ کەچی دایکی بڕوای پێ کرد.

پاشان کە دوور کەوتنەوە و لە چاوان ون بوون، جەیمی تەماشایەکی کردم و بە بزەیەکەوە وتی، "لاندن، تۆ هاوڕێی باشت هەیە."

بەوریایی وەڵامەکەم لە مێشکمدا ڕێک خست و وتم، "بەڵێ وایە، مرۆڤی باشن."

پاش ئەوەی گەیاندمەماڵەوە - نا، وا مەزانن بۆ شەربەتخواردنەوە مابێتمەوە - بەڵکوو ڕاست بەرەو ماڵەوە بەڕێ کەوتم، لە ڕێگە چیرۆکەکەی جەیمی بیروهۆشی داگیر کردبووم، دەمهێنایە بەر زەینی خۆم، ئێستا ئێریک و مارگرێت لە کافتریاکە زەمم دەکەن و پێم پێدەکەنن.

فەرموو پیاوەتی بکەیت و گاڵتەشت پێ بکەن.

خوا نەکا شتێک بکەوێتە دەمی ئەوان، بۆ بەیانییەکەی کە چووین بۆ خوێندنگە، هەموو دەیانزانی شەوان جەیمی

دەگەیەنمەوە ماڵەوە. ئیدی بووینە بنێشتەخۆشەی سەر ددانی خەڵک. ئەم جارەیان خراپتریش لە پێشوو. هەموو بە چاوێکی ترەوە تەماشاین دەکردم، وای لێ هات، لە کاتی پشووی خواردنی نیوەڕواندا، دەچوومە هۆڵی کتێبخوێندنەوەکە نانەکەم دەخوارد، تا نەکەومە بەر تانەوتەشەری ئەوان.

ئەو شەوە ڕاهێنانەکەمان گواستەوە بۆ هۆڵی شانۆگەرییەکە و لەوێ ئەنجاممان دا. چونکە دواشەوی ڕاهێنانمان بوو پێش دەستپێکردنی نمایشەکە، بۆیە گەلێک سەرقاڵ بووین. هەر دوای ئەوەی لە وانەکان تەواو بووین، کوڕەکان دەبوو هەموو لەوحە و ستاند و کەلوپەلی نمایشەکە بکەینە ناو ئەو پیکابەی بەکریمان گرتبوو، تا بیانبات بۆ هۆڵی شانۆگەرییەکە. بۆ نەگبەتی، تەنیا من و ئێدی کوڕ بووین لە بەشی دراما، ئەو دەملاڵە، جا ئەویش ئەوەندە دەستوبرد نەبوو پیاو بتوانێ پشتی پێ ببەستێ. پێکەوە کەلوپەلەکانمان دەبردە دەرەوە، لەنێو دەرگاکاندا، دەبوو هەموو قورساییەکە بکەوتایە لای منەوە، خۆ خوا نەکا تین بداتە خۆی و بەرزی بکاتەوە. شتێکی قورسمان هەڵگرتووە، من وا خەریکە دەستم دەشکێ و ئەویش دەست بەر دەدا و جارێ قالۆنچەم بۆ دەکوژێ، ئێ هەموو قورساییەکەش دەکەوێتە سەر دەستی من. دە وەرە شێت مەبە بە دەست ئەم مەغۆلەوە.

ئنجا دەیگوت، "بببببوورە، عەعەعەزێتتتت نەنەنەبوو؟"

منیش چ بکەم، مەجبوور جنێوەکەم قووت دەدایەوە، دانم بە خۆدا دەگرت. "جارێکی تر وا نەکەیتەوە."

جا خۆ هیچ دەچوو بە گوێیدا؟ دەتگوت هەر لەگەڵ ئەویشم نییە. دواتر کە هەموو شتەکانمان بار کرد و دامان

گرتن، پەنجەکانم وەک پەنجەی تۆبیی کابرای داربڕ، هەموو بەقەدەر گوێزێک ئاوسابوون. لەوەش خراپتر، دەرفەتێکم بۆ نەڕەخسا، پێش ئەوەی ڕاهێنانەکان دەست پێ بکەین، بچم شتێک بخۆم، خەریک بوو دەمردم لە برسا. تا هەموو کەلوپەلەکانمان لەوێ بار کرد و هێنامانن بۆ هۆڵەکە، سێ کاتژمێرمان پێ چوو، ئەوجا هەتا ڕێکمان خستن و هەموو شتێک تەیار و ئامادە بوو، درەنگی کرد، کاتێک تەواو بووین، تەنیا چەند خولەکێکی کەمی مابوو خوێندکارەکانی تر و خاتوو گاربەر بگەنە جێ. ئەو ڕۆژە بۆ من نەهات بوو، لەگەڵ ئەوەی شەکەت و ماندوو بووم، مەزاجیشم تێک چووبوو.

ڕاهێنانەکانمان دەست پێ کرد. بیروهۆشم هێند ماندوو بوو، نەمدەتوانی حەواس بکەمە سەر دەقەکانم. بۆیە بێ ئەوەی بیریان لێ بکەمەوە دەمگوتن. خاتوو گاربەریش ئەو شەوە لێم نەبیست بڵێت نایابە! دواتر خاتوو گاربەر پێوەی دیار بوو کە بێتاقەت بوو، بەڵام جەیمی بەردەوام بە بزە شیرینەکەی خۆی دڵنەوایی دەدایەوە و پێی دەگوت، خەمت نەبێت، هەموو شتێک باش دەڕوات بەڕێوە. بۆخۆشم دەمزانی جەیمی لەبەر خاتری من وای دەکرد، تا دڵم هیچ نەکات و خاتوو گاربەر تێڕوانینی نەگۆڕێت بەرامبەر من، بەڵام ئەو شەوە، کە جەیمی داوای لێ کردم تا ماڵەوەی بگەیەنم، ڕەتم کردەوە، گوتم ناتوانم. هۆڵی شانۆگەرییەکە دەکەوتە ناوەندی شارۆچکەکەوە، جا دەبوو زۆر دوور بکەوتمایەتەوە، تا جەیمی بگەیەنم، ڕێگەکەی گەلێک دوور بوو لە ماڵی خۆمانەوە. جگە لەوەش، حەزم نەدەکرد جارێکی دی پێکەوە

بمانبینن. لەو ساتەدا کە جەیمی داوای لێ کردم بیگەیەنم، خاتوو گاربەر گوێی لە قسەکانمان بوو، هەر لەخۆیەوە هەڵی دایێ و وتی، "ئا، ئا، پێی خۆش دەبێت. لە ڕێگەش دەتوانن باسی شانۆگەرییەکە بکەن."

بۆیە ئەمشەویش بوو بە کۆڵمەوە و تا ماڵەوەم گەیاند، بەڵام دیار بوو هەستی پێ کردبووم کە حەواسم بەتاڵ و تاقەتی قسەم نەبوو، چونکە لە ڕێگە هەنگاوێک لەپێش ئەوەوە دەڕۆیشتم، دەستەکانم خنیبووە نێو گیرفانمەوە، هەر ئاورێکیشم لێ نەدەدایەوە، تا بزانم ئاخۆ هەر بەدوامەوەیە یان نا. تا ماوەیەک ئاوها ڕێمان کرد، وشەیەکیش چییە لە زارم نەهاتە دەر.

دواجار جەیمی سەری قسەی کردەوە و لێی پرسیم، "باش نایەیتە بەرچاوم، هیچ بووە؟ لە ڕاهێنانەکەشدا ساردوسڕ دەر دەکەوتیت."

بێ ئەوەی ئاوڕی بۆ بدەمەوە، بەمەغزاوە وتم، "تۆ بە هەموو شتێکەوە هیلاکی، وا نییە؟"

بە لەفزێکی شیرینەوە وتی، "ڕەنگە بتوانم یارمەتیت بدەم." کە بەم جۆرە قسانی دەکرد، زیاتر دەهری دەبووم.

ئەمنیش بە زمانێکی ڕەقەوە وتم، "بڕوا ناکەم بتوانی."

"گەر پێم بڵێیت چی بووە، ئەوا ڕەنگە..."

لێنەگەڕام تەواوی بکات. گورج وەستام و ئاوڕم لێ دایەوە، وتم، "سەیر بکە، بەدرێژاییی ئەمڕۆ ئێشیان پێ کردووم، وەک کەر باریان پێ بار کردووم، لە نیوەڕۆشەوە هیچ بەر زارم نەکەوتووە، ئێستاش دەبێت ڕێگەیەکی دوور ببڕم لەبەر خاتری جەنابت، تا بەسەلامەتی بگەیتە ماڵەوە،

کە بۆخۆشت دەزانی هیچ پێویست ناکات، خۆ قابیلە گورگ ناتخوات."

ئەوە یەکەمین جارم بوو دەنگی بەسەردا بەرز بکەمەوە. ڕاستتان دەوێ، بەو دەنگبەرزکردنەوەیە ئارام بوومەوە، چونکە هاتبووە سەر لووتم، خەریک بوو دەتەقیمەوە. جەیمی واقی وڕ مابوو، نەیدەزانی چ بڵێت. بەردەوام بووم لە قسەکانم، "من ئەمە لەبەر خاتری باوکت دەکەم و کەچی منیشی خۆش ناوێت. شتێکی بێمانایە، خۆزگا هەر یەکەم جار ڕازی نەبوومایە."

ئەویش وتی، "تۆ قەلەقی شانۆگەرییەکەیت، بۆیە ئەوها دەهری بوویت..."

بە سەرڕاوەشاندن قسەکانیم پێ بڕی. من کە تینم بۆ هات، جاری وا هەیە بە هیچ ناگیرێمەوە. ئیتر بێزار بووم لە بزە شیرین و دەمولەفزە نەرمەکەی، تەواو تاقەتی ئەمانەم نەمابوو.

بە پەستی و بێزارییەوە وتم، "تێناگەی؟ من هیچ قەلەقی نمایشەکە نیم، تەنیا ئەوەیە نامەوێ لەگەڵت بێمەوە، حەز ناکەم برادەرەکانم تانەوتەشەرم لێ بدەن و ببمە بنێشتەخۆشەی سەر ددانی ئەوان، ناشمەوێ کاتی خۆم لەگەڵ تۆ بەسەر بەرم. وا خۆت نیشان دەدەیت کە من و تۆ هاوڕێ بین، بەڵام وا نییە. نە هاوڕێین، نە هیچ. دەمەوێ ئیتر کۆتایی بەمە بێت، تا بگەڕێمەوە سەر ژیانی ئاسایی خۆم."

بەم هەڵچوون و زمانە ڕەقەی من، گەلێک دڵی بریندار بوو، بەڵام ڕاستییەکەی، ناهەقیشی نەبوو.

"تێدەگەم." ئەوەندەی گوت و هیچی تری لە زار نەهاتە

دەر. چاوەڕوانم دەکرد ئەویش کاردانەوەی هەبێت و دەنگم بەسەردا بەرز بکاتەوە، بەرگری لە خۆی بکات، بەڵام هیچ. تەنیا سەری شۆڕ کردبوو، چاوی بڕیبووە زەوییەکەی بەردەمی. چاوەڕوانم دەکرد بگری، بەڵام هیچ، دواتر بە توڕەییەوە لێم دا و ڕۆیشتم و ئەوم لەوێ بەجێ هێشت. کەمێکی پێ چوو، گوێم لە دەنگی پێی بوو، ئەویش هات. لەدوامەوە دەڕۆیشت، چەند مەترێکی مابوو بگاتە بەردەمی ماڵی خۆیان. هەتا گەیشتە بەردەرگاکەش، هیچی نەگوت. من بە شۆستەکەدا دەڕۆیشتم، خەریک بوو کەمێک دوور دەکەوتمەوە، ئەوسا گوێم لە دەنگی بوو وتی، "لاندن، سوپاس کە ئەمشەویش تا ماڵەوە هاتیت لەگەڵمدا."

کە وای گوت، لە پەستی و بێزاریدا ڕاچەنیم، وەک ئەوەی دەرزییەک بکەن بە گیانمدا. دەبینن لەگەڵ ئەوەی ئەو قسە ڕەقانەشم بە چاودا دا و مامەڵەم لەگەڵی توند بوو، کەچی هەر سوپاسی دەکردم. ئەم کچە ئاوها بوو، منیش ڕقم لەم ئەتوارەی دەبووەوە.

یان ڕاستتر بڵێم، ڕقم لە خۆم دەبووەوە.

# ٨

شەوی دەستپێکردنی نماییشی شانۆگەرییەکەمان، هەوا فێنک و خۆش بوو، ئاسمان ساماڵ و پەڵەیەک هەور چییە نەدەبینرا. دەبوو کاتژمێرێک پێش وادەی دەستپێکردنی نمایيشەکە، لە خوێندنگەکەوە بچین بۆ هۆڵەکە، جا منیش ئەو ڕۆژە، لەبەر ئەوەی شەوی ڕابردوو بەو جۆرە قسەم لەگەڵ جەیمی کردبوو، گەلێک بێتاقەت و کەمحەوسەڵە بووم. ئەو کچە داماوە هیچ تاوانێکی نەبوو، بگرە زۆریش ڕێزی لێ دەگرتم، بەڵام من خۆم گەمژە بووم. لە ڕاڕەوەکەدا بینیم، دەمویست بچم بۆ لای و عوزرخواییی بۆ بێنمەوە، بەڵام تا من فریا کەوتم، ئەو چووە نێو کۆمەڵێک خوێندکارەوە و دەرفەتم بۆ نەڕەخسا.

وەختێک من گەیشتمە هۆڵی نمایيشەکە، ئەو لەمێژ بوو لەوێ ئامادە بوو، بینیم لە بەردەمی پەردەی تەختەی شانۆکە لەگەڵ خاتوو گاربەر و هێگبێرت قسەی دەکرد. ئێمە هەموو لە هاتوچۆ و وەرە و بڕۆدا بووین، تەقەللامان دەدا ترس و دوودڵی بەسەرماندا زاڵ نەبێت، کەچی ئەو گەلێک کەمتەرخەم و بێتاقەت دەهاتە پێشچاو. هێشتا جلوبەرگی نمایيشەکەی

لەبەر نەکردبوو – دەبوو عەزییەکی سپیی پەڕپەڕە بپۆشێت، تا دەوری فریشتەکە ببینێت – بەڵکوو هەر ئەو بلووزەی لەبەردا بوو، کە لە قوتابخانە بینیبووم. سەرەڕای ئەوەی دەترسام کاردانەوەی توندی هەبێت بەرامبەرم، لێ پرکێشیم کرد و چووم بۆ لای هەرسێکیان.

"جەیمی چۆنی؟ جەنابی هێگبێرت سڵاو... خاتوو گاربەر، سڵاوت لێ بێت."

جەیمی تەماشای کردم.

بە دەنگێکی هێمن وتی، "لاندن، تۆ چۆنی؟" دیار بوو هێشتا شەوی ڕابردووی لە دڵ دەر نەچووبوو، چونکە وەک جارانی تر کە دەیبینیم، هیچ بزەیەکی نەکرد بۆم. داوام لێ کرد بچینە ئەولاوە کەمێک قسەی لەگەڵدا بکەم، ئیدی ڕوخسەتمان لەوان وەر گرت. کە هاتینە ئەملاوە، بینیم هێگبێرت و خاتوو گاربەر تەماشایان دەکردین.

بە شپرزەییەوە چاوێکم بەنێو هۆڵەکەدا گێڕا.

وتم، "ببورە کە دوێنێ شەو بەو جۆرە قسەم لەگەڵ کردی، دەزانم ڕەنگە دڵت زویر بووبێت، من هەڵە بووم."

بە جۆرێک سەرنجی دەدام، وەک ئەوەی بڕوا نەکات. ئەوجا پرسیی، "دوێنێ شەو ئەو قسانەت هەموو بەڕاست بوون؟"

"بڕوا بکە حەواسم نەبوو، بێتاقەت و شپرزە بووم. جاروبار وام بەسەر دێت." دەشمزانی هیشتا بەتەواوی وەڵامی پرسیارەکەیم نەدایەوە.

ئەم جاریش بە دەستووری دوێنێ شەو، تەنیا وتی، "تێدەگەم" و هیچی تر. پاشان ڕووی وەر چەرخاند بەرەو

لای کورسییەکانی ئامادەبووان. ئەم جاریش ڕەنگی خەمباری و بێتاقەتی نیشتە سەر ڕووی.

دەستیم گرت و وتم، "سەیر بکە، بەڵێن بێت دووبارە نابێتەوە و هەقت بۆ دەکەمەوە." لێم مەپرسن بۆچی ئاوهام گوت - ئیتر لەو کاتەدا ئەوەم بە خەیاڵدا هات و پێم باش بوو وا بڵێم.

ئەو شەوە، بۆ یەکەم جار بزەیەک کەوتەوە سەر لێوانی.

نیگای گواستەوە سەرم و وتی، "سوپاس."

لەولاوە خاتوو گاربەر بانگی کرد، "جەیمی؟"

"بەڵێ خاتوو گاربەر؟"

خاتوو گاربەر بە دەستی ئاماژەوە وتی، "وا بزانم کاتی ئەوە هاتووە دەست پێ بکەین."

ڕوخسەتی لێ وەر گرتم و وتی، "دەبێت بڕۆم."

"دەزانم، فەرموو. سەرکەوتوو بیت."

دەستیم بەر دا. ئەویش وتی، "گەر خوا حەز بکا، هەردووکمان سەرکەوتوو دەبین."

دوای ئەوە، دەبوو خۆمان تەیار و ئامادە بکەین. هەریەکەمان بۆ شوێنی خۆی جیا بووەوە. ئەمن چوومە ژووری خۆگۆڕینی کوڕانەوە. هۆڵی شانۆگەرییەکە لەچاو ئەوەی لەو شارۆچکە بچووکەدا بوو، بەڵام هەموو پێداویستی و کەلوپەلێکی نماییشت تێدا دەبینی، ژووری تایبەت بە کوڕان و کچانیش جیا کرابووەوە، هەستمان دەکرد شانۆکاری ڕاستەقینە و بەناوبانگین.

ئەو جلوبەرگەی دەبوو بۆ نماییشەکە لەبەری بکەم، لە ژووری خۆگۆڕینەکە دانرابوو. پێشتر لە کاتی ڕاهێنانەکانماندا

جلوبەرگەکانیان بە قەبارەی خۆمان بۆ چاک کردبووین، جا ئەو کاتەی خەریکی لەبەرکردنی جلەکان بووم، ئێریک، بێ ئەوەی لە دەرگا بدات، خۆی کرد بە ژووردا. ئێدییش هێشتا هەر خەریکی لەبەرکردنی جلوبەرگی کارەکتەری دەرۆزەکەرەکە بوو، کە چاوی بە ئێریک کەوت، زارەتەرەک بوو، چونکە هەر بیدیتبا، بە شۆخییەوە کەمەری دەگرت و بەرزی دەکردەوە. ئێدی تا تینی تێدا بوو، تێی تەقاند، جلوبەرگەکانی بەتەواوی هەڵنەکێشابوو، بە ڕاکردنەوە لەبەری دەکردن. ئێریکیش گوێی نەدایێ و هات لەسەر مێزی بەردەم ئاوێنەکە دانیشت. بە پێکەنینێکی بەمەغزاوە وتی، "ها، چۆنی؟ بەنیازی چیت؟"

منیش بە تێڕامانەوە لێم پرسی، "مەبەستت چییە؟"

"کەرە باسی نمایشەکە دەکەم، خۆ دەقەکانت لەبیر نەچووەتەوە؟"

بە سەربادانەوە وتم، "نا."

بە تێڕامانەوە بۆ ساتێک لێم ورد بووەوە، وەک ئەوەی هەرگیز نەیبینیبم. وتی، "لاندن، وا بزانم خەریکە گەورە دەبیت." قسەیەک لە دەمی ئێریکەوە بێت، بڕوام نەدەکرد بەڕاستی بێت.

جا بەڕاستی بوو بێت یان نا، دەمزانی قسەکەی ڕاست بوو.

لە نمایشەکەدا تۆم سۆرنتن کە چاوی بە فریشتەکە دەکەوێت، گەلێک پێی سەرسام دەبێت، بۆیە هەر بەدەوریدا دێت و دەچێت. کاتێکیش فریشتەکە لە کریسمسدا یارمەتیی هەژاران و خەڵکی دەستکورت دەدا، ئەمیش هاوکاریی دەکات.

یەکەمین وشـە کـە لـە زاری تـۆم دێتـە دەر، دەڵێت، "تـۆ زۆر جوانیت." جا ئەمنیش دەبوو بـە جۆرێک ئـەو دەقـە بڵێمـەوە، وەک ئـەوەی بەڕاسـتیم بـێ و لـە ناخـی دڵمـەوە بیڵێـم. ئـەم دەقـەش گرنگتریـن دەق بـوو لەنێـو هەمـوو نمایيشـەکەدا، دەرگای دەخسـتە سـەر پشـت بۆ دەقەکانـی تریش. کێشـەکەش ئەوە بوو، مـن هێشـتا ڕاهێنانـم لەسـەر ئـەو بەشـە نەکردبوو. ڕاسـتە لـە ڕاهێنانەکانـدا حیوارەکـەم دەگـوت، بـەڵام لـە دڵـەوە نەبوو، وەک چـۆن کەسـێکی غەیـرە جەیمـی دەبينێـت و هـەر وا بەکەمتەرخەمـی پێـی دەڵێـت، "تـۆ زۆر جوانيـت،" ئاوهـاش دەقەکـەم لـە زار دەهاتـە دەر. خاتـوو گاربەریـش تەنیـا لـەم بەشـەدا نەیگـوت نایابـە! بۆیـە گەلێـک شـپرزە و قەلـەق بووم. تەقەلـلام دەدا کەسـێکی تـر وەک فریشـتەکە بێنمـە بـەر زەین، تا حەواسـم بجووڵێت و دەقەکـە بەڕاسـتی و لـە دڵـەوە بڵێم، کەچـی لەنێـو هەمـوو ئـەو دەقانـەی تـردا، ئەمەیانـم بـاش بـۆ نەدەگوتـرا.

وەختێـک پـەردەی شـانۆ لا درا بـە ڕووی ئامادەبووانـدا، جەیمـی هێشـتا لـە ژووری خۆگۆڕینەکـە نەهاتبووە دەر. پێش دەسـتپێکردن نەمبینـی، نەهاتبـووە سـەر تەختـە. بـەڵام کێشـە نەبوو، چونکـە دیمەنەکانـی سـەرەتا ئـەوی تێدا نەبوو – تەنیا باسـی لـە تـۆم سـۆرنتن و پەیوەندیـی نێـوان کچـە تاقانەکـەی دەکـرد.

ئەو سـاتەی پێـم نایـە سـەر تەختـەی شـانۆ، بڕوام نەدەکرد هیـچ هەسـت بـە شـپرزەیی بکـەم و بـڕوام بـە خـۆم هەبـوو، چونکـە گەلێک ڕاهێنانـم لەسـەر ئەو دیمەنانە کردبوو، بەڵام کە شـتەکە ڕووی دا، ئەوجا بـۆت دەر دەکەوێت. هۆڵەکە جمـەی

دەهات، وەک خاتوو گاربەر پێشبینی کردبوو، دەبوو دوو ڕیزی تر کورسی لە بەشی پشتەوە دابنێین، تا جێگەی خەڵکی تر ببێتەوە. لە ڕاستیدا هۆڵەکە جێگەی چوار سەد کەسی تێدا دەبووەوە دابنیشن، بەڵام بەو دوو ڕیزەی تریشەوە، نزیکەی پەنجا کەسی تریش دانیشتبوون. جگە لەوە، خەڵکی تریش هەبوون بەپێوە پاڵیان دابوو بە دیوارەکانەوە، دەتگوت تۆپەڵە ماسین چووبوون بەناو یەکدا.

ئەو دەمەی پێم نایە سەر تەختەی شانۆ، هۆڵەکە کشومات، کەس دەنگی لێوە نەدەهات. تێبینیم کرد زۆربەی ئامادەبووان ئەو ژنە پیرە سەرشینانە بوون، کە خوویان بە یاری کۆنکەن و خواردنەوەی قۆدکاوە گرتووە. بینیم ئێریک و برادەرەکانی تریشم لە نزیک ڕیزەکانی دواوە هەڵکووڕ مابوون. بەڕاستی، کاتێک دەچیتە تەختەی شانۆ و لە بەردەم ئەو هەموو حەشامەتەدا دەوەستیت و چاوەڕوانت دەکەن شتێک بڵێیت، هەستێکی گەلێک نامۆت لا دەخولقێت.

بۆیە لە دیمەنەکانی سەرەتادا، هەموو تەقەللای خۆم خستە کار تا هیچ هەست بە شپرزەیی و ترس نەکەم. سالی بە هۆی ئەوەی بەدەنی وردیلە هەڵکەوتبوو، دەوری کچە تاقانەکەی منی دەبینی. پێکەوە دیمەنەکەی خۆمان، هەر وەک چۆن ڕاهێنانمان لەسەر کردبوو، پێشکەش کرد. هیچمان هەڵەیەکیش چییە نەمان کرد، هەرچەند گەلێک لێهاتووش نەبووین. دواتر کە پەردەمان دادایەوە بۆ دیمەنی دووەم، دەبوو جارێکی دی ستاند و لەوحە و شتەکان ڕێک بخەینەوە. جا ئەم جارەیان باش بوو پەنجەم بەسەلامەتی دەر چوو، چونکە لەگەڵ ئێدی شتەکانم هەڵنەدەگرت، خۆم

لەو دەدزییەوە.

تا ئەو کاتە، هێشتا جەیمی دەر نەکەوتبوو – وا بزانم لە ڕێکخستن و هەڵگرتنی لەوحە و کەرەسەی نمایشەکە بەخشرابوو، نەبا بزمارێک یان قەڵبەیەک بچێت بە جلەکانیدا و بدڕێت – بەڵام هێند سەرقاڵ بووین، دەرفەتی ئەوەم نەبوو بیر لەو شتانە بکەمەوە. دواتر پەردەی دیمەنی دووەم بە ڕووی ئامادەبووانندا هەڵدرایەوە، کەوتمە نێو جیهانی هێگبێرت سولیڤەنەوە، بە بەردەمی دوکان و بازاڕەکاندا دەگەڕام بۆ سندوقە مۆسیقاکە بۆ کچە تاقانەکەم، کە داوای کردبوو بۆ کریسمس بۆی بکڕم. ئەو شوێنەی جەیمی لێوەی هاتە سەر تەختەی شانۆ، من پشتم لێ بوو، وەختێ هاتە نێو دیمەنەکەوە، گوێم لە ئامادەبووان بوو هەموو هەناسەیەکی سەرسامییان بۆ هەڵکێشا. هەموو کشومات، کەس چرپەی لێوە نەدەهات. لە تیلەی چاومەوە هێگبێرتم لێوە دیار بوو دەمی دەلەرزی. خۆم ئامادە کرد ئاوڕ بۆ پاش خۆم بدەوە، کاتێکیش ڕووم وەر چەرخاند، چ ببینم خودایە...

بۆ یەکەمین جار، لەو کاتەوەی ناسیبووم، قژە ئاڵتوونییەکەی لەدواوە نەکردبوو بە تەماتە. بەڵکوو خاوی کردبووەوە و بە شان و ملیدا هاتبووە خوار، گەلێک درێژتر بوو لەوەی پێشبینیم دەکرد. کەمێک بریسکەی دابوو لە قژی، ڕووناکیی هۆڵەکەش کە لێی دەدا، وەک کریستاڵ دەبریسکایەوە. بەو عەزییە پەڕپەڕە فریشتەییەوە ئاسایەوە، کە بەتایبەت بۆ خۆی دروابوو، پیاو حەزی دەکرد هەر تەماشای بکات، بەڕاستی لە جوانیدا دڵی دەپرواند. لەو کچە نەدەچوو کە من لە مێژ بوو دەمناسی یان با بڵێم کە بەم

دواییيانـه لـه نزیکـەوە ناسـیم. کەمێک مەکیاجی کردبـوو – زۆر نـا، بەڵکوو تەنیا ئەوەنـدەی جوانـی و ناسـکییەکەی دەر بخـات. بزەیەکـی نەرمـی لەسـەر لێـوان بـوو، وەک بڵێـی نهێنییەکـی گـەورەی لـه دڵـدا هەڵگرتبێـت.

بەڕاستی فریشتەیەکی ڕاستەقینە بوو.

کە بینیـم، دەمـم داچەقی، وەسـتام و بـه واقوڕماوییـەوە بۆ ماوەیەکیدرێـژ هـەر تەماشـام دەکرد. تـا دواتـر بیـرم کەوتـەوە، دەبـوو دەقەکانـم بڵێـم. هەناسـەیەکی سەرسـامیم هەڵکێشـا و دەسـتم کـرد بـه گوتنـی حیوارەکـەم.

"تـۆ زۆر جوانیـت." وا بزانـم هەمـوو ئامادەبـووان، هـەر لـه ڕیـزی ژنـه سەرشـینەکانەوە بگـرە تـا دوای دواوە، زانییـان لـه ناخـی دڵمـەوە ئـەو قسـەیەم کـرد.

بۆ یەکەمین جار، ئەو دەقەم بەباشی گوت.

## ٩

گەر بڵێم نمایشەکەمان گەلێک سەرکەوتوو بوو، هێشتا کەمە. ئامادەبووان پێدەکەنین و دەشگریان. بوونی جەیمی لە نمایشەکەدا، تایبەتمەندییەکی جیاوازی پێ بەخشی. شانۆکارەکانی تریش، بە خۆشمەوە، گەلێک سەرسام بووین بەو سەرکەوتنەی بەدەستمان هێنا، بڕوامان نەدەکرد بەو جۆرە بێت. ئەوانیش کە سەرەتا چاویان بە جەیمی کەوت، واقیان وڕ ما، بۆیە لە کاتی نمایشکردنەکەدا، زیاتر ورەی پێ دەبەخشین و زیاتر بڕوایان بە خۆ دەبوو. بێ هیچ گرفتێک، نمایشی یەکەممان کۆتایی پێ هێنا. بڕواتان بێت، بۆ ئێوارەی ڕۆژی دواتر، وای لێ هات خەڵکی زیاتر هاتن بۆ بینینی شانۆگەرییەکە. تەنانەت ئێریک، لەدوای تەواوبوون، هات پیرۆزبایی لێ کردم بۆ ئەو سەرکەوتنە، کە ئەمەش لەچاو ئەو قسانەی پێشتر پێی دەگوتم، گەلێک سەیر بوو.

وتی، "ڕۆڵی هەردووکتان بێوێنە جوان بوو، من شانازیت پێوە دەکەم، هاوڕێ."

لەم قسانەدا بووین، لەولاوە گوێم لێ بوو خاتوو گاربەر بە دەنگی بەرز هەرکەسێک بەلایدا تێپەڕیبایە دەیگوت، "بەڕاستی

نایاب بوو!" هێندی دووبارە کردەوە، بە جۆرێک، ئەو شەوە تا خەویشم لێ کەوت، هەر لە گوێمدا دەزرینگایەوە. دوای ئەوەی دیمەنەکان هەموو کۆتایی هات و پەردە دادرایەوە، چاوم بۆ جەیمی گێڕا، بینیم لەولاوە، لەگەڵ باوکیدا وەستابوو. باوکی چاوەکانی پڕ بوون لە فرمێسکی شانازی، جەیمی باوەشی پێدا کرد و بۆ ماوەیەکی درێژیش ئاوها لە ئامێزی یەکدا مانەوە. دەستی بە قژی کچەکەیدا دەهێنا و بەچرپە پێی دەگوت، "فریشتەکەم،" جەیمی چاوەکانی داخستبوو، ئەمنیش خۆم پێ نەدەگیرا، قورگم پڕ بوو.

ئەوجا بۆم دەر کەوت، ئەم کارەی من دەستم دایە، شتێکی خراپم نەکرد.

دوای ئەوەی ئامێزیان لەیەک جیا کردەوە، هێگبێرت بە شانازییەوە بەرەو لای شانۆکارەکانی تری برد، دونیایەک پیرۆزبایی لێ کرا. جەیمی هەرچەندە بۆخۆیشی دەیزانی نمایشێکی جوانی پێشکەش کردبوو، کەچی خۆی وا نیشان دەدا، کارێکی وای نەکردووە شایانی ئەو هەموو دەستخۆشی و پیرۆزباییە بێت. بزە و خەندە شیرینەکەی جارانی لەسەر لێو بوو، بەڵام بەو جوانییەی ئێستایەوە، بزە و خەندەیەکی گەلێک جیاوازتر لە ڕوخساری دەباری. لەپشت تەختەی شانۆکەوە وەستام، چاوەڕوان بووم پشووی خۆی وەر بگرێت، ڕاستتان دەوێ، بە هەمان دەستووری هێگبێرت هەستی شانازیم بۆی دەجووڵا. گەشکەیەکی شادمانی کەوتە ڕووم. ئەوجا کە منی بینی لەولاوە وەستابووم، ڕوخسەتی لەوان وەر گرت و بەرەو لام هات و لێم نزیک بووەوە.

بە بزە شیرینەکەیەوە سەرنجی دامێ و وتی، "لاندن،

سوپاس بۆ هەموو شتێکت. تۆ دڵی باوکمت خۆش کرد.“
لە دڵەوە وتم، ”سوپاسی ناوێت.“

سەیر لەوەدا بوو، کاتێک جەیمی وای گوت، بیرم کەوتەوە هێگبێرتی لێیە، کەواتە ئەمشەو بۆخۆی دەیباتەوە بۆ ماڵەوە، خۆزگەم دەخواست دەرفەتێک هەبووایە و من لەگەڵی بڕۆشتمایە.

ڕۆژی دووشەممەی دواتر، دواهەفتەی وەرزی یەکەمی خوێندنمان بوو پێش دەستپێکردنی پشووی کریسمس. خشتەی تاقیکردنەوەکانیش بۆ هەموو پۆلەکان ئامادە کران. لە لایەکی دیکەشەوە، ئەمن دەبوو فۆڕمی زانکۆی کارۆلاینای باکووریش تەواو بکەم، ماوەیەک بوو بە هۆی ڕاهێنانی شانۆگەرییەکەوە، نەپرژابوومە سەری. ئیدی ئەو هەفتەیە تەگبیرم کرد سەعییەکی باش بکەم لە وانەکانمدا و شەوانیش، پێش ئەوەی بخەوم، فۆڕمەکە پڕبکەمەوە. کەچی لەگەڵ ئەوەشدا، بیروهۆشم هەر لای جەیمی بوو.

ئەو گۆڕانکاری و ڕەنگوڕوخسار و جۆری جلوبەرگە نوێیەی جەیمی لە کاتی نمایشەکەدا کردبووی، گوتم ئیدی تەواو، هەر وا دەمێنێتەوە و لەسەر ئەو شێوازە بەردەوام دەبێت. بۆخۆشم نازانم بۆ ئەوها خەیاڵم دەکرد، بەڵام ئیتر وام بە زەیندا دەهات. کەچی دوای شەوی نمایشەکە، بۆ بەیانییەکەی بینیم دیسان چووبووەوە قاڵبە کۆنەکەی جارانی، بەتەواوی سەرم سووڕ ما: بلووزە خوورییە قاوەییەکە، قژی کردبوو بە تەماتە، تەنوورە نەخشچوارگۆشەییەکە، ئیتر بۆخۆتان دەزانن، بە هەمان دەستووری پێشوو.

یەک تەماشای بەس بوو، من بۆخۆم بەزەییم پێیدا

دەهاتەوە. دوای نمایيشەكەم خەڵكی بە نموونەیی لەقەڵەمیان دەدا - بگرە گەلێک تایبەتیش - بەڵام بەدەستی خۆی ئەم پیاهەڵدانەی لە خۆی كرد. ئەو كەسانەی پێشتر نەیانناسیبوو، دەستخۆشییان لێ دەكرد و بە شان و باڵیدا هەڵیان دەدا، لێ من باش دەمزانی ئەمە زۆر ناخایەنێت. مرۆڤ كە لە منداڵییەوە تێڕوانینێكی هەبوو بەرامبەر بە كەسێک، تا ڕادەیەک سەختە بیگۆڕێت. لە لایەكی دیكەشەوە، دڵنیا نەبووم ئاخۆ دوای ئەمە تێڕوانینەكەم خراپتر دەبێت یان نا. ئێستا كە خەڵكی بۆیان دەر كەوت كچێكی سادەوساكارە و بەو جۆرە نییە كە لە نمایيشەكە دەر دەكەوت، ڕەنگە قسەی بۆ هەڵببەستن. خەڵكێک هەن، خوا ناناسن.

دەمویست قسەی لەگەڵدا بكەم و ڕا و سەرنجی خۆمی پێ بڵێم، بەڕاستی مەبەستم بوو، بەڵام تەگبیرم كرد لە كۆتاییی هەفتەدا پێی بڵێم. نەک لەبەر ئەوەی سەرقاڵ بووم و نەدەپرژامە سەر هیچ، بەڵكوو دەمویست كاتم لە بەردەستدا بێت تا بە باشترین شێوازی دەربڕین پێی بڵێم. ڕاستییەكەی، هێشتا لە دڵم دەر نەدەچوو كە ئەو شەوەی تا ماڵەوە بردمەوە، مامەڵەی توندم لەگەڵدا كرد و قسەی ڕەق و ناخۆشم پێ گوت. لەبەر ئەوەش نەبوو بڵێم نمایيشێكی سەركەوتوومان پێشكەش كرد. بەڵكوو زیاتر لەبەر ئەو ڕاستییە بوو، كە لەو ماوە زۆرەی پێكەوە بووین، جەیمی هەمیشە بە قسەی شیرین و مامەڵەی نەرم لەگەڵم هەڵسوكەوتی كردبوو، بۆیە من هەستم بە پەشیمانی دەكرد.

ئەوی ڕاستی بێ، لەو بڕوایەدا نەبووم نیازی هەبێت هەر قسەشم لەگەڵدا بكات. چونكە منی دەبینی لەگەڵ هاوڕێكانمدا

لە کاتی نانی نیوەڕۆدا پێکەوە خڕ دەبووینەوە و بۆخۆیشی لە قوژبنەکەی ئەولاوە دوورەپەرێز دادەنیشت و کتێبی ئینجیلەکەی دەخوێندەوە، نەدەهات بۆ لامان. بەڵام ئەو ڕۆژە، کە لە خوێندنگە دەگەڕامەوە، گوێم لە دەنگی بوو لە پشتمەوە بانگی کردم، داوای لێ کردم گەر بتوانم تا ماڵەوەی بگەیەنم. هەرچەند هێشتا خۆشم ئامادە نەکردبوو ڕا و سەرنجەکانی خۆمی پێ بڵێم، لێ ڕازی بووم بە داواکەی.

کەمێکی پێ چوو، دواتر جەیمی سەری قسەی کردەوە.

"بیرتە چیت پێ گوتم، کە ئەو شەوەی منت گەیاندە ماڵەوە؟"

سەرێکی ئەرێنیم لەقاند، خۆزگا ئەو باسەی نەهێنایەتە پێشێ.

پاشان وتی، "بەڵێنیشت دامێ هەقی هەموویم بۆ بکەیتەوە."

بۆ ساتێک شپرزەیی دای گرتم. بە خەیاڵی خۆم، بە نمایشکردنی شانۆگەرییەکە هەقم بۆ کردبووەوە. ئەو درێژەی دا بە گوتەکانی، "بەردەوام بیر دەکەمەوە، ئاخۆ چۆن هەقم بۆ بکەیتەوە،" بێ ئەوەی بوار بدات دەم بکەمەوە و قسەی خۆم بکەم، ئەو بەردەوام بوو لە قسەکانی، "من بۆخۆم شتێکم بە خەیاڵدا هاتووە گەر بۆم بکەیت."

داوای لێ کردم لە هەقی ئەوەدا یارمەتیی بدەم لە کۆکردنەوەی ئەو کوپ و قووتووانەی لە دوکان و موغازە و شوێنە بازرگانییەکانی شارۆچکەکە دای نابوون. ئەم قووتووانەی لەسەر مێزی دەغیلەوانی ئەو شوێنانە دانابوون، تا هەرکەسە و لای خۆیەوە چەندی توانی، شتێک پارەی تێ بکات بۆ خێر. پارەکە بۆ منداڵە هەتیوەکان تەرخان دەکرا.

جەیمی هەرگیز نەدەچوو ڕاستەوخۆ داوای خێر لە خەڵک و ڕێبواران بکات، بەڵکوو دەیویست هەرکەسە بەپێی توانا و بە حوسن و ڕەزای خۆیان پارە دابنێن. بە بۆچوونی ئەو، لە ئایینی مەسیحیدا ئوسوڵ وایە.

جا بیرمە پێشتر، کە لەگەڵ هاوڕێکانمدا دەچووینە دوکان و کافتریا و ئەو شوێنانانە، ئەو قووتووانەی لێ دانرابوون. ئێمەش بۆ قەشمەری، کە دەمانزانی کابرای دەغیلەوان چاوی لێ غافڵە، دەچووین پارچە کاغەز و پارەی وردەی ساختەمان تێ دەکرد چونکە کە دەکەوتە نێو قووتووەکانەوە، وەک دەنگی پارەی ڕاستی دەهاتە بەرگوێ. ئەوجا بە عەقڵی جەیمی پێدەکەنین و گاڵتەمان پێی دەکرد. دەمانکرد بە نوکتە، کە جەیمی چۆن دێت و قووتووەکانی دەکاتەوە، دەبینێت پڕە لە شت و گەلێک قورسە، چاوەڕوانی ئەوە دەکات، هەمووی پارە بێت، دەیکاتەوە و دواتر سەیر دەکات، جگە لە پارچەکاغەز و پارەی ئاسنی ساختە، هیچی تری تێدا نییە. هەندێک کات کە ئەو ڕەفتارانەی جارانت بیر دەکەوێتەوە، بروسکەیەکی شەرمەزاری بە ئازای گیانتدا دێت، جا منیش کە ئەمانەم بیر دەکەوتەوە، هەستم بە تەریقبوونەوە دەکرد.

جەیمی ڕوخساری خوێندمەوە، هەستی پێ کردم.

وتی، "پێویست ناکات هەقم بۆ بکەیەوە. تەنیا شتێکم لێت دەوێت، بۆخۆت دەزانی جەژنی کریسمس هێندی نەماوە و نزیکە، جا بۆخۆشم ئوتومبێلم نییە، بۆیە گەلێکم پێ دەچێت تا بچم ئەو قووتووانەی دوکان و بازاڕەکان..."

ئەمنیش قسەکانیم پێ بڕی و لێنەگەڕام تەواوی بکات، وتم، "بەسەر چاو، هیچ کارێکی ترم نییە و کاتیشم هەیە."

ئیدی ڕۆژی چوارشەممە دەستم پێ کرد، گەرچی تاقیکردنەوەم هەبوو، دەبووایە سەعییەکی باشم بکردایە و خۆمی بۆ ئامادە بکەم، جگە لەوەی فۆڕمی زانکۆکەشم لەولاوە وەستابوو. جەیمی لیستێکی ناوی ئەو شوێنانەی دامێ، کە قووتووەکانی لێ دانابوون، منیش ئۆتومبێلەکەی دایکمم وەر گرت و لەوسەری شارۆچکەکەوە دەستم پێ کرد. نزیکەی شەست قووتووی لە شوێنی جیاواز دانابوون، ئێ بۆ منیش تەنیا ڕۆژێکم پێ دەچوو تا هەمووی کۆ بکەمەوە. جەیمی ئەو کاتەی قووتووەکانی بەسەر شوێنەکاندا دابەش کردبوو، شەش هەفتەی پێ چووبوو، چونکە دەبوو سەرەتا شەست قووتووی بەتاڵ پەیدا بکات، دواتر لەبەر ئەوەی ئۆتومبێلی پێ نەبووە، لە ڕۆژێکدا تەنیا سێ قووتووی دابەش کردووە بەسەر دوکان و شوێنەکاندا، هەر ئەوەندەشی بۆ هەڵگیراوە. بەراورد بەوە، بۆ من وەک ئاوخواردنەوە بوو. کە دەستم پێ کرد پێکەنینم بە خۆم دەهات، دەمگوت ئەوە منم قووتووەکان بۆ جەیمی کۆ دەکەمەوە؟ خۆ جاران گاڵتەمان بە عەقڵی دەهات. بەڵام لە دڵی خۆمدا بە خۆمم دەگوت، جەیمی پێویستی بە یارمەتیی منە.

دەستم پێ کرد، لەم دوکان بۆ ئەو دوکان، قووتووەکانم کۆ دەکردەوە، ئێوارەی یەکەم ڕۆژ بۆم دەر کەوت کەمێک زیاترم پێ دەچێت وەک لەوەی پێشبینیم کردبوو. تەنیا بیست دانەیەکم پێ کۆ کرایەوە، لەبەر ئەوەی لە شارۆچکەی بیوفۆرت ڕاستییەک هەیە، من بیری ئەوەم نەبوو. لە شارۆچکەیەکی بچووکی ئاوهادا، هەموو یەک دەناسن، نەدەکرا بەبێ سەلام و کەلام ڕاست خۆت بکەیت بە ژووردا و دەست بدەیتە قووتوویەک و چیی تێدایە هەڵی بگریت، یاخود بەبێ ئەوەی

لەگەڵ خاوەن شوێنەکەدا قسە بکەیت و حاڵومەسەلەی تێبگەیەنیت، یان کە ناسیاوێکت بدیتبا، هەر دەبوو تاوێک دەمەتەقێت لەگەڵ بکردایە. ئوسوڵ وا بوو. جا ڕێک دەکەوت کە دەچووومە شوێنێک، برادەرێک باسی ئەوەی دەکرد، پاییزی ڕابردوو ماسییەکی گەورەیان ڕاو کردووە، یان پرسیاری قوتابخانەیان لێ دەکردم، یان جاری وا هەبوو، داوایان لێ دەکردم یارمەتییان بدەم لە داگرتنی کارتۆنەکان، یان بۆچوونی منیان وەر دەگرت، کە سەفتە گۆڤار و ڕۆژنامەکان لەکوێی دوکانەکەدا دابنێن باشترە. لە بیری خۆمدا دەمگوت، جەیمی بۆ ئەمە باشە، ئیتر تەقەللام دەدا بە ویستی جەیمی بجووڵێمەوە، چونکە ئەمە پرۆژەی ئەو بوو.

بۆ ئەوەی کات بەفیڕۆ نەدەم، لە دوکان و بازاڕەکان پارەکانم نەدەژمارد، هەڵم دەگرت و دەڕۆیشتم بۆ دوکانێکی تر. تا ئێوارەکەی سووڕامەوە، لە کۆتاییدا هەموو ئەو پارانەی کۆم کردبوونەوە، دوو قووتووی شووشەی گەورە دەبوون. هەڵم گرتن و بردمە ژوورەکەی خۆم. لە شووشەکەوە دیار بوو چەند پارچە وەسڵ و کاغەزی تێدا بوو - زۆریش نەبوون - قووتووەکانم هەموو هەڵڕشتە سەر زەوییەکە و بینیم زۆربەی پارەکان وردە بوون. هەرچەند زۆریش پارچە کاغەز و پارەی ئاسنی ساختەی تێدا نەبوو وەک خۆم پێشبینیم دەکرد، بەڵام کە ژماردم، دڵم خورپەی پێدا هات. تەنیا بیست دۆلار و سیودوو سەنتی تێدا بوو. ئەو دەمە، کە ساڵی ١٩٥٨ بوو، ئەم پارە کەمە هیچی نەدەکرد، جا وەرە دابەشی بکەیت بەسەر سێ منداڵی هەتیویشدا.

لێ نائومێد نەبووم، گوتم ڕەنگە هەڵەیەک بووبێت، بۆ

ڕۆژی دواتریش تێ هەڵچوومەوە، بیست شوێنی ترم کرد و لەگەڵ هەموو خاوەنەکانیشیاندا کەمێک دەمەتەقێم دەکرد و ئەوجا پارەی نێو قووتووەکانم کۆ کردەوە. ئەم جارە تەماشام کرد، پارەی قووتووەکانی ئەمڕۆ هەمووی بیستوسێ دۆلار و هەشتاونۆ سەنت بوو.

ڕۆژی سێیەم خراپتر. دوای ئەوەی پارەکەم ژمارد، بۆخۆشم بڕوام نەدەکرد. چەند بێت باشە؟ تەنیا یازدە دۆلار و پەنجاودوو سەنت. ئەمەیانم لەو دوکان و بازاڕانەی نزیک کەناری ڕووبارەکە کۆ کردەوە، کە گەشتیار و کوڕوکاڵی وەک خۆم گوزەریان پێدا دەکرد.

کە تەماشای هەموو پارەکەم کرد، شتێکی وا نەبوو – بە هەمووی، پەنجاوپێنج دۆلار و حەفتاوسێ سەنت – ناڕەحەتی دای گرتم، بەتایبەت کە بیرم دەکردەوە ماوەی ساڵێکی ڕەبەق بوو ئەم قووتووانە دانرابوون لەو دوکان و شوێنانە و بۆخۆشم چەندین جار بەلایاندا تێپەڕ ببووم، کەچی ئەوەتا، بە هەمووی ئەو تۆزە پارەیەی تێدایە. ئەو شەوە دەبوو تەلەفۆن بۆ جەیمی بکەم، تا پێی بڵێم چەندم کۆ کردووەتەوە، بەڵام نەمدەتوانی. جەیمی پێی گوتبووم، کە ئەمساڵ دەیەوێت شتێکی گەلێک تایبەت بۆ منداڵە هەتیوەکان بکات، بۆیە ئەم پارە کەمە ئەو ئاواتەی جەیمیی نەدەهێنایە دی – من بۆخۆشم ئەو ڕاستییەم دەزانی. ئێ چی بکەم باشە؟ شتێک پارەم بە دەستەوە بوو، چووم هێنام و تێکەڵی پارەکانی ترم کرد. ئەوسا بەدزۆوە پێم گوت، "لەبەر ئەوەی پڕۆژەکەی هی تۆیە، کۆی پارەکە ناژمێرم، تا پێکەوە هەردووکمان نەیکەین." دڵم نەدەهات لەدەمی منەوە ئەو هەواڵە ناخۆشە ببیستێت.

بەڵێنم دایە، بۆ پاشنیوەڕۆی ڕۆژی دواتر، کە لە خوێندنگە تەواو بووین، پارەکەی بۆ ببەم. ئەو ڕۆژەش دەیکردە ٢١ ی کانوونی یەکەم، کورتترین ڕۆژی ساڵ. تەنیا چوار ڕۆژیشمان لە بەردەم مابوو بۆ جەژنی کریسمس.

پاش ئەوەی پارەکانمان ژمارد، وتی، "لاندن، ئەمە پەرجووی خوابییە!"

لێم پرسی، "چەندی تێدایە؟" بۆخۆشم چاک دەمزانی چەندە. کەچی خۆم لێ نەبان دەکرد.

سەری هەڵبڕی و بە گەشکەیەکی شادمانییەوە وتی، "دوو سەد و چلوحەوت دۆلاری تێدایە!" ئەو دەمە هێگبێرت لە ماڵ بوو، بۆیە ڕێگەم درابوو بچمە ژووری. چووبووینە ژووری دانیشتنەکە، هەر لەوێشدا جەیمی پارەکەی ژمارد. لەسەر ئەرزەکە سەفتەسەفتەی کردن، زۆربەی وردەی دەسەنتی و بیستوپێنجسەنتی بوون. لەو کاتەدا هێگبێرت لەسەر مێزی ئاشپەزخانەکە خەریکی نووسینی وتاری ئایینی بوو، ئەویش کە گوێی لە قسەکەی جەیمی بوو، سەرێکی هەڵبڕی و گوێقوڵاخ بوو.

لێم پرسی، "لەو بڕوایەدایت بەش بکات؟"

چاوێکی بەنێو ژوورەکەدا گێڕا و لە خۆشیدا فرمێسک بە ڕوومەتەکانیدا چۆڕاوگەی بەستبوو، هێشتا بڕوای بە چاوی خۆی نەدەکرد، ئەو بڕەپارەیەی کۆ کردبێتەوە. بگرە دوای نمایشی شانۆگەرییەکەش، ئاوها بەم جۆرەی ئێستا شاگەشکە نەبوو. ڕاست نیگای گواستەوە سەر من و بۆ ساتێک هەر وا چاوی سەرنجی تێ بڕیم.

بە پێکەنینەوە وتی، "شتێکی زۆر باشە." لە دەنگیدا هەست

و سۆزێکی قووڵ و شادمانییەکی بێسنوورتر لە جارانیم هەست پێ کرد. "ساڵی پار، تەنیا حەفتا دۆلارم پێ کۆ کرایەوە."

ئەمنیش بە قورگی پڕەوە وتم، "پێم خۆش بوو ئەمساڵ زیاترت کۆ کردووەتەوە، گەر ئەمساڵیش زوو ئەو قووتووانەت دانەنایە، ڕەنگ بوو ئەوەندەت دەست نەکەوتبایە."

خۆشم دەمزانی درۆ دەکەم، بەڵام گرنگ نەبوو لام. جاروبار ناچار دەبیت درۆ بکەیت.

لە هەڵبژاردن و کڕینی یاری و کەلوپەلی منداڵانەکاندا، لەگەڵی نەچووم - گوتم جەیمی بۆخۆی باشتر دەزانێ منداڵ حەزی لە چی جۆرە یارییەکە - بەڵام زۆری لێ کردم، لە ئێوارەی جەژنی کریسمس لەگەڵی بچم بۆ خانەی هەتیوان، تا منیش لەوێ ئامادە بم کە منداڵەکان دیارییەکانیان دەکەنەوە. وتی، "لاندن، تکایە وەرە." کە بینیم ئاوها پێی خۆش بوو، نەمدەتوانی دڵی بشکێنم.

سێ ڕۆژ دوای ئەوە، دایکم و باوکم بۆخۆیان چووبوون بۆ ئاهەنگێک لە ماڵی سەرۆکی شارەوانی، ئەمنیش لە ماڵەوە مامەوە، چاکەتێکی کەشخەم لەبەر کرد و بۆینباخێکی جوانیشم بەست، دیارییەکەم بۆ جەیمی کڕیبوو، خستمە بن دەستم و بەرەو ئوتومبێلەکەی دایکم چووم. دیارییەکەش بلووزێکی خووری بوو، چونکە گوتم تەنیا بەمە دڵی خۆش دەبێت. شتێکی تر پارەم لە گیرفاندا مابوو، بەو پارەیە کڕیبووم. جەیمی هەرگیز لەو کەسانە نەبوو ڕێگە بدات خەڵکی شتی بۆ بکڕن.

قەول وا بوو کاتژمێر حەوت لە خانەی هەتیوان ئامادە بم، جا پردی پەڕینەوەکەش نزیک بەندەری شاری مۆرهێد بوو،

بۆیە دەبوو چاوەڕوان بم، تا کەشتییە بارهەڵگرەکان وردەوردە بە کەناڵەکەدا تێدەپەڕین. ئەنجام، کەمێک دوا کەوتم. تا من گەیشتم، دەرگای دەرەوە داخرابوو، بۆیە دەبوو لە دەرگا بدەم، تا بەڕێوەبەری خانەکە لێم دەکاتەوە. دواجار گوێی لە تەقەی دەرگاکە بوو، بە خۆی و گورزەیەک کلیلەوە هات و بەنێویاندا گەڕا، تا کلیلی ئەو دەرگایەی دۆزییەوە، ئەوجا لێی کردمەوە. پێم نایە ژووریێ، هێند سارد بوو، لە سەرمادا هەڵدەلەرزیم.

جەنکینزی بەڕێوەبەر بە ڕوویەکی گەشەوە وتی، "فەرموو، ئەوە هاتیت؟ دەمێکە چاوەڕوانت دەکەین. فەرموو با بچین بۆ لای ئەوانیش."

بە ڕاڕەوەکەدا بردمی بەرەو ئەو هۆڵەی منداڵەکان تێیدا لە کاتی پشووەکاندا یارییان لێ دەکرد. هەمان ئەو شوێنەی جارەکەی تر لەگەڵ جەیمی هاتین. پێش ئەوەی پێ بنێمە ژووریێ، بۆ ساتێک وەستام، تا هەناسەیەکی قووڵ هەڵکێشم و ئەوجا خۆم بکەم بە ژووردا.

گەلێک باشتر بوو لەوەی پێشبینیم دەکرد.

لە نێوەندی هۆڵەکەدا، درەختێکی گەورە دانرابوو، بە گڵۆپی ڕەنگاوڕەنگ و قردێلە و سەدان ئیشی دەست ڕازێنرابووەوە. ژێر درەختەکەش بە چواردەوریدا کۆمەڵێک دیاریی پێچراوەی گەورە و بچووک دانرابوون. دیارییەکان لەسەر یەک کۆمەڵ کرابوون، منداڵەکانیش هەموو بە جلوبەرگی جوان و ڕەنگاوڕەنگەوە، بە شێوەیەکی نیوەبازنەیی خڕ ببوونەوە و لەسەر زەوییەکە دانیشتبوون. منداڵە کوڕەکان هەموو پانتۆڵی نیلی و کراسی سپیی یەخەداریان لەبەردا بوو، بۆ کچەکانیش، تەنوورەی نیلی و بلووزی قۆڵدرێژیان لەبەر کردبوون. هەموو

جوان و خاوێن، دەتگوت تازە لە گەرماو هاتوونە دەرێ، زۆربەی کوڕەکانیش قژیان تازە چاک کردبوو.

لەسەر مێزەکەی تەنیشت دەرگاکە، شووشەیەکی گەورە شەربەت و سینییەک شیرینی و بسکیتی لێ دانرابوو، بسکیتەکان لە شێوەی درەختی کریسمس دروست کرابوون و شیرینیی بەسەرەوە بوو. چەند کەسێکیش لەگەڵ منداڵەکان دانیشتبوون، بچووکەکان چووبوونە سەر کۆشیان و بە شادمانییەوە گوێیان بۆ گۆرانیی بابە نوئێل دەگرت.

سەرەتا لەنێو منداڵەکانداجەیمیم بەرچاو نەکەوت، دواتر کە گوێم لە دەنگی بوو، ئەوجا چاوم گێڕا و ناسیمەوە. لەسەر زەوییەکە، لە بەردەم درەختی کریسمسەکە چوارمشقی هەڵکووڕ مابوو، چیرۆکی بۆ دەخوێندنەوە.

سوپاس بۆ خوا، ئەمشەو قژی نەکردبوو بە تەماتە، بەڵکوو بە هەمان دەستووری شەوی نمایشەکە، بە شان و ملیدا بەری دابووەوە. هەروەها لەجیاتی چاکەتە خوورییەکەی، کە دایمەی خوا لەبەری دەکرد، ئەمشەو بلووزێکی سووری یەخەحەوتیی پۆشیبوو، کە بە هۆیەوە ڕەنگی چاوە شینەکانی زیاتر دەر دەخست. پیاو کە تەماشای ئەو جوانییەی دەکرد، خۆی پێ نەدەگیرا. بێ ئەوەی خۆشم هەستی پێ بکەم، لە حەپەساندا هەناسەی خۆم گرتبوو، بە تیلەی چاو بەڕێوەبەری خانەکەشم دەبینی بە خەندەوە تەماشای دەکردم. ئەمنیش بە بزەیەکەوە هەناسەیەکی قووڵم هەڵکێشا و تەقەللام دا بێمەوە سەرخۆم.

جەیمی سەرقاڵی خوێندنەوەی چیرۆک بوو بۆ منداڵەکان، سەرێکی هەڵبڕی و منی بەدی کرد لەنێو دەرگاکەدا وەستابووم، ئەوجا نیگای گواستەوە سەر خوێندنەوەی چیرۆکەکەی. تاکوو

تەواو بوو، کەمێکی تری پێ چوو، ئەوجا هەڵسایە سەر پێ و تەنوورەکەی ڕێک کردەوە و بەنێو منداڵەکاندا، بەرەو لای من هات. نەمدەزانی بۆ کوێم دەبا، بۆیە لە شوێنی خۆمدا وەستام.

لەو کەینوبەینەدا، جەنکینزی بەڕێوەبەر ڕۆیشتبوو.

کە گەیشتە لام، وتی، "ببورە کە چاوەڕوانمان نەکردی تا دێیت، منداڵەکان لە خۆشیدا نەیاندەتوانی زۆر چاوەڕوان بن، بۆیە زوو دەستمان پێ کرد."

منیش بە پێکەنیەوە وتم، "گوێ مەیەرێ." بیروهۆشم تەنیا لای جوانییەکەی بوو.

"زۆرم پێ خۆشە هاتیت."

"منیش."

پێکەنی و دەستی گرتم، ئەوجا بەرەو لای منداڵەکان بردمی. "وەرە، یارمەتیم بدە لە دابەشکردنی دیارییەکان بەسەر منداڵەکاندا."

ئەو کاتژمێرەمان بە دابەشکردنی دیارییەکان بەسەر برد، تەماشای منداڵەکانمان دەکرد، هەرکەسە دیاریی خۆی دەکردەوە، لە خۆشیدا حاڵیان نەبوو. جەیمی هەموو شارۆچکەکەی کردبوو، تا بۆ هەر منداڵە چەند شتێکی جیاواز بکڕێت، هەرگیز شتی وایان بە خۆوە نەدیتبوو. جەیمی تەنیا کەس نەبوو دیاری بکڕێت بۆ منداڵەکان، بەڵکوو ستافی خانەکەش هەریەکە دەستودیاریی خۆیان هێنابوو بۆیان. قاوقیژ و هات و هەرای شادیی منداڵەکان هەموو لایەکی گرتبووەوە. هەستم دەکرد ئەم منداڵانە بۆخۆشیان چاوەڕوانی ئەوە نەبوون ئەم دیارییانەیان بۆ بێت، بەردەوام دەستخۆشی و سوپاسی جەیمییان دەکرد.

دوای ئەوەی کەشی خانەکە ئارام بووەوە و منداڵان هەموو دیاریی خۆیان کردەوە، بێدەنگی و ئارامی باڵی کێشایەوە بەسەر شوێنەکەدا. بەڕێوەبەری خانەکە و ژنێکی دی، کە هەرگیز پێشتر چاوم پێی نەکەوتبوو، قۆڵیان لێ هەڵکرد و دەستیان کرد بە خاوێنکردنەوە و ڕێکخستنەوەی هۆڵەکە. هەندێکیش لە منداڵە وردەکان لەژێر درەختی کریسمسەکەدا خەریک بوو خەویان لێ دەکەوت. ئەوانی دیکەش کە هەراشتر بوون، بە خۆیان و دیارییەکانیانەوە چووبوونەوە ژوورەکانی خۆیان. ڕووناکیی گڵۆپەکانی سەقفی هۆڵەکەشیان کەمێک کز کردبوو. گڵۆپەکانی بە درەختەکەوە بوون، ڕووناکییەکی ناسک و ئارامبەخشیان دەدایەوە، لە قوژبنەکەی ئەولاشەوە قەوانێک دانرابوو، مۆسیقای شەوێکی هێمنیان خستبووە سەر. هێشتا لەتەک جەیمییەوە لەسەر زەوییەکە دانیشتبووم، کچێکی منداڵی لە باوەش کردبوو، خەو بردبوویەوە. ئەوسا بە هۆی قاوقیژ و هەراوزەنای منداڵەکانەوە، دەرفەتی قسەمان نەبوو. ئێستاش هەردوو چاومان بڕیبووە ڕووناکیی گڵۆپە ڕەنگاوڕەنگەکانی درەختی کریسمسەکە، لە بیری خۆمدا دەمگوت، دەبێت جەیمی ئێستا بیر لە چ بکاتەوە. توێژاڵێکی کامەرانی سەر ڕووی نیشتبوو، دەمزانی چەند لە دڵەوە شادە بەوەی ئەم ئێوارەیە بەو جۆرە تێپەڕی، لێتان ناشارمەوە، منیش هەستی شانازی زایە نێو دڵم. خۆشترین ئێوارەی کریسمس بوو، تا ئەو کاتە لە ژیانمدا بەسەرم بردبێت.

سەرنجێکم دایێ، ڕووناکیی گڵۆپە کزەکان نیشتبوونە سەر ڕووی، هێند شۆخوشەنگ دەهاتە بەرچاوم، دڵی دەپڕواندم. ئەوسا وتم، "شتێکم بۆ کڕیوی، مەبەستم ئەوەیە، دیارییەکم

بۆ هێناویت." بەچرپە قسەم دەکرد، نەبا کچە بچووکەکەی باوەشی بێدار بێت، هیوام دەخواست شپرزەیی و قەلەقیم پێوە دیار نەبێت.

نیگای لەسەر درەختەکە گواستەوە بۆ سەر من، بزەیەکی نەرم ڕووی داگرتبوو. ئەویش بە دەنگی نزمی مۆسیقائاسا وتی، "پێویستی نەدەکرد."

"دەزانم، بەڵام حەزم کرد دیارییەکت پێشکەش بکەم." دیارییەکەم لەولای خۆمەوە دانابوو، دەستم بۆ درێژ کرد و دامە دەستی.

"دەتوانی بۆم بکەیتەوە؟ دەستم گیراوە." تەماشایەکی کچە بچووکەکەی باوەشی کرد و سەری هەڵبڕییەوە.

ئەمنیش بە شانهەڵتەکاندێکەوە وتم، "گەر ئێستا حەز ناکەیت، دەتوانی نەیکەیەوە، شتێکی ئەوتۆ نییە."

"بێعەقڵ مەبە، ئێستا هەر لە بەرچاوی خۆتدا دەیکەمەوە."

دیارییەکەی لەگەڵ خۆم هێنابووم، کردمەوە، بەئەسپایی کاغەزی پاکەتەکەم لێدەکردەوە، تا خشەخش نەکا. پاشان کاغەزەکەم خستە لاوە و سەری پاکەتەکەم لا دا، بلووزەکەم دەر هێنا و پیشانیم دا. بلووزێکی ڕەنگ قاوەیی، هەر لەو جۆرەی خۆی دایمە لەبەری دەکرد. لێ بە خەیاڵمدا هات دەکرا مۆدێلێکی تری بۆ بێنم.

بەراورد بەو شادی و کامەرانییەی پێشووتری، چاوەڕوانی کاردانەوەی زیاترم لێ نەدەکرد. وتم، "ئەوەتا، هەر وەک پێم گوتیت، شتێکی ئەوتۆ نییە." دەترسام بە دڵی نەبێت و هەست بە تەریقبوونەوە بکات.

بە لەفزێکی شیرینەوە وتی، "لاندن، زۆر جوانە. ئەم جارە

بێتەوە، لەبەری دەکەم کە یەکمان بینی. گەلێک سوپاس.“

بۆ ساتێک بێدەنگی باڵی بەسەر هەردووکماندا کێشا، دانیشتبووین، هیچمان نەدەگوت. ئەوسا جارێکی دی سەرنجم گواستەوە سەر گڵۆپە ڕەنگاوڕەنگەکانی درەختەکە.

پاشان جەیمی بەچرپە وتی، ”منیش شتێکم بۆ تۆ هێناوە.“ لەگەڵ قسەکەیدا، تەماشای درەختەکەی کرد، منیش لەگەڵ سەرنجی ئەودا، نیگام چووە سەر درەختەکە. دیارییەکەی بۆ منی هێنابوو، لەپشت لقی درەختەکەوە دیار بوو. دەستم دایە. پاکەتێکی شێوە لاکێشەیی و کەمێکیش قورس بوو. هێنام و لەسەر کۆشم دام نا، بێ ئەوەی بیکەمەوە.

تەماشای کردم و وتی، ”بیکەرەوە.“

بە دەمی تەتەڵەوە وتم، ”چۆن دەبێت ئەمەم بدەیتێ؟“ هەستم کرد، ڕاست زانیم چیی تێدایە، بڕوام نەدەکرد شتی وا بکات. دەستەکانم کەوتنە لەرزین.

بە دەنگێکی پڕ لە تکا و پاڕانەوە و بە نەغمێکی شیرین وتی، ”تکات لێ دەکەم، بیکەرەوە. دەمەوێت لێم وەر بگریت.“

بە دوودڵی و شپرزەییەوە، هێواش هێواش دەستم کرد بە هەڵبچڕینی پاکەتەکە. پاشان کە بەرگەکەیم لێ کردەوە و تەنیا پاکەتەکە مایەوە، بەئەسپایی و لەسەرخۆ کردمەوە. کە بینیم، چاوم ئەبڵەق بوو، بە واقوڕماوییەوە دەستم بە بەرگە چەرمەکەیدا هێنا، فرمێسکی شادی لە چاوانمدا قەتیس ما. جەیمی دەستی هێنا و توند دەستەکانمی گوشی. گەرمای دەستی بە ئازای گیانمدا گوزەری کرد.

بە چاوی سەرسامییەوە تەماشایم دەکرد، زمانم گۆی نەدەکرد، نەمدەزانی چ بڵێم.

کتێبی ئینجیلەکەی خۆی بەدیاری بۆ هێنابووم.

بەچرپە وتی، "سوپاس بۆ هەموو ئەو دڵسۆزی و هاوکارییەت. خۆشترین ئێوارەی کریسمسە تا ئێستا بەسەرم بردبێ."

بێ ئەوەی هیچ بڵێم، ڕووم وەر چەرخاند و دەستم دایە پەرداخە شەربەتەکەم. گۆرانییەکەش هێشتا دەنگی دەهات، مۆسیقاکە هەوای هۆڵەکەی پڕ کردبوو. قومێکم لە پەرداخەکەم دا، تا هیچ نەبێ کەمێک قورگمی پێ تەڕ بکەم. هەر کە قومێکم لێ دا، هەموو ئەو یادەوەرییانەی لەگەڵ جەیمی بەسەرم بردبوو، بە بیروهۆشمدا گوزەریان کرد. ئاهەنگی دەستپێکی پشووی هاوینەکەم هاتەوە یاد، کە ئەو شەوە جەیمی چیی بۆ کردم. هەروەها شەوی نمایشەکەم بیر کەوتەوە، کە فریشتەئاسا دەهاتە پێشچاو. بیرم لەو شەوانە دەکردەوە، کە تاماڵەوەم دەگەیاند، کۆکردنەوەی پارەی نێو قووتووەکانم کەوتەوە یاد، کە پڕ بوون لە پارەی وردە بۆ منداڵە هەتیوەکان.

کە ئەم یادەوەرییانە بە بیروهۆشمدا دەهاتن و دەچوون، لەناکاو هەناسەم گیرا. تەماشایەکی جەیمیم کرد، دواتر سەرنجێکی سەقفی هۆڵەکەم دا، گەلێک تەقەللام دەدا زاڵ بم بەسەر شەپۆلی شپرزەیی و هەڵچوونی دەروونمدا، ئەوسا جارێکی دی نیگام گواستەوە سەر جەیمی. ئەو بزەیەکی دا بە ڕووومدا و منیش بە دەستووری ئەو، بزەیەکم بۆ کردەوە، لە بیری خۆمدا وردم دەکردەوە، کە چۆن بۆ دواجار کەوتمە داوی خۆشەویستیی کچێکی وەک جەیمی سولیڤەن.

# ١٠

ئەو شەوە لە خانەی هەتیوانەکەوە گەیاندمەوەماڵەوە. سەرەتا دوودڵ بووم، ئاخۆ بتوانم ئەو ترس و قەلەقییەم بشکێنم و لە ئامێزی بگرم، بەڵام ئەوی ڕاستی بێ، نەمدەزانی لەو کاتەدا ئەویش چ هەستێکی لە دەروونندا بوو بۆ من. ئەو جوانترین دیاری بۆ هێنابووم، کە تا ئەو کاتە بۆم هاتبێت، گەرچی لەوانەیە، بە دەستووری ئەو، ڕاست نەتوانم بیکەمەوە و بیخوێنمەوە، بەڵام دەمزانی ئەم کتێبەی ئەو پێشکەشی کردووم، بەشێکە لە ڕۆحی خۆی. جەیمی لەو جۆرە کەسانە بوو، کە گەر ڕێبوارێکی بدیتابا و پێویستی بە یارمەتیی ئەم بووایە، ئامادە بوو گورچیلەی خۆی بۆ دەر بهێنێت. بۆیە نەمدەزانی چۆنی ورد بکەمەوە لە زەینی خۆمدا. ئاخۆ منیش وەک ڕێبوارێکی لێقەوماو تەماشا دەکات، یان جۆرێکی تر؟

جارێکیان جەیمی بۆخۆی پێی گوتم، کە هێندە بێمێشک و بێئاگا نییە، بۆیە ئەمنیش دواجار بۆم دەر کەوت و دانی پێدا دەنێم، کە کچێکی بەڕاستی وریایە. ڕەنگە جاران... کەسێکی

تر بووبێت، بەڵام ئێستا، ئەوەتا، بە چاوی خۆی دەبینێت و هەست دەکات چۆن هاوکاریم کردووە لە خانەی منداڵە هەتیوەکاندا. گەر ئاوڕێکیش بۆ پێشتر بدەینەوە، ئەو کاتەی لە ماڵی خۆیان بووین و لەسەر زەوییەکە دانیشتبووین و پارەکانمان هەڵڕشتبوو، وا بزانم کە گوتی پەرجووە مەبەستی لە من بوو.

بیرمە ئەو ڕۆژە کە من و جەیمی باسی پارەکانمان دەکرد، هێگبێرت خۆی کرد بە ژووردا، بەڵام هیچی نەگوت. ئەو ماوەیە، وەک من بزانم، هێگبێرت لەسەر خۆی نەبوو. وتارەکانی لەبارەی پارە و ماڵی دونیاوە بوو، کەچی لە نیوەیدا باسی تاوانی زیناکردنی دەهێنایەوە پێشێ، لەم دواییانەشدا وتارەکانی کەمێک کورتتر ببوونەوە وەک لە جاران و لە کاتی وتارخوێندنەوەشدا، جاروبار بۆی دەوەستا و شپرزەیی ڕوخساری دادەگرت، وەک بڵێی لەو کاتەدا شتێکی تری بە خەیاڵدا هاتبێت، شتێکی خەمهێن و دڵپروێن.

ڕاستییەکەی، منیش چونکە باش نەمدەناسی، بۆیە نەمدەزانی چۆنی ورد بکەمەوە. جەیمییش کاتێک باسی ئەوی بۆ دەکردم، بڕوام نەدەکرد، دەتگوت باسی کەسێکی ترم بۆ دەکات، جیاواز لە باوکی. کە دەیگوت باوکم کەسێکی قسەخۆش و قۆشمەچییە، نەدەچوو بە عەقڵمدا. هێگبێرت و نوکتە و قسەی خۆش؟ ئاخیرزەمانە، وەک ئەوەیە بڵێیت گورگ و مەڕ پێکەوە ئاو دەخۆنەوە.

بە هەرحاڵ، ئەو ڕۆژە کە لەگەڵ جەیمی پارەکانمان دەژمارد، خۆی کرد بە ژووردا، جەیمی کە لەو کاتەدا

فرمێسکی شادمانی زابووە نێو چاوەکانی، هەستایە سەر پێ و باوەشی بە باوکیدا کرد. هێگبێرت وەک بڵێی هەر منی لێ نەبم، بەخێرهاتنێکی نەکردم، بە کچەکەی گوت گەلێکی خۆش دەوێت و شانازیی پێوە دەکات، ئەوجا گەڕایەوە ئاشپەزخانەکە و دەستی کردەوە بە نووسینی وتارەکەی. ئێستاش، من بۆخۆم گەرچی زۆر هاتوچۆی کەنیسە و ئەم شتانەم نەدەکرد، کەچی ئەو ڕەفتار و هەڵسوکەوتەی هێگبێرتم لا نامۆ بوو.

لەو ساتەدا کە ئەم بیروخەیاڵانە بە مێشکمدا گوزەریان دەکرد، سەرنجێکم دایە جەیمی کە لەسەر کوشنەکەی تەنیشتمەوە دانیشتبوو. بە ڕوخسارێکی پڕ لە گەشکە و کامەرانییەوە لە دەرەوەی دەڕوانی، بزەیەکیش نیشتبووە سەر لێوەکانی، منیش لەو کاتەدا هەستێکی شادمانی زایە نێو دەروونم. وێدەچوو ئەویش بیروهۆشی لای من بووبێت. وردەوردە دەستم برد بۆ دەستی، بەڵام پێش ئەوەی دەستم بیگاتێ، ڕووی بەلامدا وەر چەرخاند و بێدەنگییەکەی شکاند. وتی، "لاندن، تۆ قەت بیر لە خودای گەورە دەکەیەوە؟"

دەستم گێڕایەوە.

تا ئەو کات، کە بیرم لە خودا دەکردەوە، وەک ئەو نیگار و وێنە کۆنانە دەهاتە پێشچاوم، کە لە کڵێساکاندا بینیبووم - وەک دێوێکی زەبەلاح بە ڕۆبێکی سپی و قژێکی درێژەوە باڵی کێشاوە بەسەر شوێنێکدا - بەڵام دەمزانی ئەوەی جەیمی باسی دەکرد، ئەوە نەبوو کە لە خەیاڵی مندا بوو. ئێستێکم کرد، ئەوسا وەڵامیم دایەوە.

وتم، "بەدڵنیاییەوە، هەندێک جار."

"قەت لە خۆت پرسیوە بۆچی شتەکان بەو جۆرە ڕوو دەدەن؟"

بێ ئەوەی لە خۆشم دڵنیا بم، سەرێکی ئەرێنیم لەقاند.

ئەویش وتی، "ماوەیەکە زۆر بیر لەم شتانە دەکەمەوە."

ویستم لێی بپرسم، ئاخۆ زۆر زیاتر لە جارانیشت بیری لێ دەکەیەوە؟ لێ هیچم نەگوت. دیار بوو قسەی تری پێ بوو بیڵێت، بۆیە من بێدەنگ بووم.

"من باش دەزانم خودای گەورە بۆ هەریەکەمان قەدەرێکی لە چارەمان نووسیوە، بەڵام هەندێک جار لە پەیامەکانی تێناگەم. تۆش قەت شتی وات بەسەر هاتووە؟"

یەکێ نەزانێ من ئیشم نییە، هەر بیر لە شتی وادەکەمەوە.

تەقەلـلام دا خۆم وا نیشان بدەم، منیش وەک ئەو بڕوام بەو شتانە هەیە. وتم، "شەرت نییە ئێمەی مرۆڤ هەموو کاتێک لە تەواوی پەیامەکانی خودای گەورە تێبگەین. بە بڕوای من، هەندێک جار تەنیا پێویستە ئیمانمان بە شتەکان هەبێت و هیچی تر."

وا بزانم وەڵامەکەم لە جێی خۆیدا بوو. ئەو هەست و سۆزەی هەمبوو بەرامبەر بە جەیمی، زیاتر لەچاو جاران مێشکمی دەخستە کار. دیار بوو بیری لە وەڵامەکەم دەکردەوە.

ئەوجا وتی، "بەڵێ، تۆ ڕاست دەکەیت."

زەردەیەکی شانازیم کرد و بابەتەکەم گۆڕی، چونکە باسوخواسی بابەتی ئایینی، شتێک نەبوو هەستی ڕۆمانسیت

لا دروست بکات.

بێ ئەوەی خۆم شپرزە بکەم، وتم، "دەزانی، بەڕاستی شەوێکی گەلێک خۆش بوو، کە پێکەوە لای درەختی کریسمسەکە دانیشتبووین."

"بەڵێ، زۆر خۆش بوو." بیروهۆشی لە شوێنێکی تر بوو.

منیش وتم، "تۆش زۆر قەشەنگ و جوان بوویت."

"سوپاس."

سوودی نەبوو.

بەو هیوایەی شەپۆلی بیرکردنەوەکانی ببچڕێنم و بیروهۆشی بێنمەوە لای خۆم، وتم، "دەکرێت پرسیارێکت لێ بکەم؟"

"بۆ نا؟ فەرمو."

هەناسەیەکی قووڵم هەڵکێشا.

وتم، "سبەینێ، دوای ئەوەی لە کەنیسە هاتیتەوە، مەبەستم ئەوەیە دوای ئەوەی چەند ساتێکت لەگەڵ باوکتدا بەسەر برد... مەبەستم..." دەمم تەتەڵەی دەکرد و بەیەکدا دەهات، وشەکانم لە زار بۆ نەدەهاتە دەر. پاشان تەقەللام دا تەواوی بکەم، "دەتوانیت بێیت بۆماڵی ئێمە بۆ خوانی ئێوارەی کریسمس؟"

هەرچەند هێشتا ڕووی وەر چەرخاندبوو بەلای جامەکەدا، بەڵام بینیم هەر کە ئەو قسەیەم کرد، بروسکەیەکی شادمانی ڕوخساری داگرت.

"بەڵێ لاندن، زۆر حەز دەکەم."

ئاهێکی ئارامیم هەڵکێشا، بڕوام نەدەکرد ئەوە من بم

داوای شتی وای لێ بکەم، سەرم سوورِ مابوو لەم شتانە. بە شەقامەکاندا لێم دەخوڕی، پەنجەرەی ماڵەکان هەموو بۆ یادی کریسمس ڕازێنرابوونەوە، ئەوجا بە گۆڕەپانی نێوەندی بیوفۆرتدا تێپەڕین. پاش کەمێکی تر، جارێکی دی دەستم بردەوە بۆ دەستی، لێ ئەم جاریان ئەویش دەستی لا نەبرد.

گەیشتینە بەردەمی ماڵیان و ئۆتومبێلەکەم ڕاگرت، گڵۆپەکانی ژووری دانیشتنەکەیان هێشتا نەکوژابۆوە، بینیم هێگبێرت لەپشتی پەردەکەوە وەستابوو. دیار بوو بۆیە چاوەڕوانی دەکردین، تا بزانێت لە خانەی هەتیوانەکە چۆنمان گوزەراند. یان دیارە دەیویست بزانێت ئاخۆ لە بەردەرگاکەیان ماچی کچەکەی دەکەم یان نا. شتی وای قبوڵ نەدەکرد. خۆ چاوی دەچووە پشتی سەری.

کە لە ئۆتومبێلەکە دابەزین و بەرەو دەرگاکەیانم برد، بیرم لەوە دەکردەوە کە ماڵئاواییمان کرد، چ بکەم، خۆ ئەو بەڵایەش وا لە سەرەوە چاودێریمان دەکات، دەرفەتی ماچێکیشم نابێت. جەیمی لەو ساتەدا هیچی نەدەگوت، شەپۆلی کامەرانی ڕوخساری داگرتبوو، گەلێک بەوە دڵخۆش بوو، کە داوام لێ کرد بۆ سبەی ئێوارەی کریسمس بچینە ماڵی خۆمان. جەیمی لەبەر ئەوەی بە زرنگیی خۆی پێی دەزانی و لە بەرچاوی بوو چیم بۆ خانەی هەتیوان کردبوو، کەواتە ڕەنگە لەوەش تێگەیشتبێت، کە لە شەوی ئاهەنگی دەستپێکی پشووی هاوینەکە چ هەڵویستێکم هەبوو بەرامبەری. لە زەینی خۆیدا، تەنانەت دیارە درکی بەوەش

کردووە، کە ئەمە یەکەم جاری منە حەز بکەم و داوای لێ بکەم بێت بۆ ماڵمان.

کە دابەزین و گەیشتینە سەر پلیکانەی بەردەم دەرگاکەیان، بینیم هێگبێرت لەودیو پەردەکەوە سەرەتاتکێی بوو. لای هەندێک دایک و باوک، بۆ نموونە، دایک و باوکی ئەنجێلا، ئەم سەرەتاتکێیە واتا ئەوە هاتین، ئێستا دەرگاتان لێ دەکەینەوە. ئێ ئەمەش دەرفەتێکی باش بوو بۆ هەردووکتان لەو ماوە کورتەدا، تا ئەوان دەرگاتان لێ دەکەنەوە، نیگایەکی یەکتر بکەن و ئەوجا یەکدی ڕاموسن.

ڕاستییەکەی، دڵنیا نەبووم ئاخۆ جەیمی نیازی هەیە ماچم بکات یان نا، گومانم هەبوو شتی وا بکات. بەڵام بۆخۆم کە تەماشای ئەو جوانییە سیحراوییەم دەکرد، کە دەمبینی ئەو قژە خاوەی بە شان و ملیدا بەر داوەتەوە، کە یادەوریی ئەو چەند ساتەی پێشترم دەهێنایەوە بەر زەین، گەر هەلێکی وام بۆ هەڵکەوێ، پێم کوفر بوو لەکیس خۆمی بدەم. بڵێسەیەکی ئاگرین لە ناخەوە دەیکولاندم، خەریک بوو دەستی خۆم بوەشێنم، کەچی لەو ساتەدا هێگبێرت دەرگای لێ کردینەوە.

بە دەنگێکی کز وتی، "گوێم لە دەنگی ئوتومبێلەکە بوو هاتنەوە." ڕەنگی پێستی هەر وەک جاران زەرد هەڵگەڕابوو، کەمێکیش شەکەت و ماندوو دەهاتە پێشچاو. بە نائومێدییەوە وتم، "سڵاو جەنابی هێگبێرت."

ئەوجا جەیمی بە گەشکەیەکی ورشەدارەوە وتی، "باوکە گیان چۆنی؟ خۆزگا ئەمشەو تۆش بهاتیایە. زۆر خۆش

بـوو."

ئەویـش وتـی، "بـە خۆشـیت بێـت کچـم." ئێسـتێکی کـرد، وێدەچـوو بیروهۆشـی وێـک بخاتـەوە. ئەوسـا قوڕگـی پـاک کـردەوە و بـەردەوام بـوو، "کەمێـک کاتـت دەدەمـێ، تا شـەوشـاد لەیـەک دەکـەن، مـن دەچمـە ژوورەوە، دەرگاکـەش داناخـەم، دواتـر خـۆت پێـوەی بـدە."

هێگبێـرت ڕووی وەر چەرخانـد و وەژوور کـەوت. لـە ژووری میوانەکـەوە، لـەو شـوێنەی لێـی دانیشـت، دەمزانـی ئێمـەی لێـوە دیـار بـوو. خـۆی وا نیشـان دەدا، وەک ئـەوەی کتێـب یـان شـتێک بخوێنێتـەوە، بـەڵام هیچیشـم بـە دەسـتیەوە نەبینـی.

جەیمـی ڕووی تـێ کـردم و وتـی، "لاندن، بەڕاسـتی شـەوێکی خۆشـم لەگەڵتدا بەسـەر برد."

"منیش هەروەهـا." هەسـتم دەکـرد هێگبێـرت بـە تیلـەی چـاو تەماشـای دەکـردم. گوتـم ئاخـۆ بڵێـی ئـاگای لـەوەش بووبێـت، کە لەنـاو ئۆتومبێلەکە دەسـتی جەیمیـم گـرت. خـۆ ئەمـە بەڵایە، ئـاگای لـە هەمـوو شـتێکە.

"سبەینێ چ کاتێک بێم بۆ ماڵتان؟"

هێگبێرت کە ئەمەی بیست، کەمێک گوێقوڵاخ بوو.

"خۆم دێم بەدواتدا، کاتژمێر پێنج باشـە؟"

لەنێو دەرگاکـەوە ئاوڕێکـی بـۆ ژوورەوە دایـەوە. "باوکـە؟ ڕێگـەم دەدەیـت سـبەینێ بچـم بـۆ ماڵـی لانـدن؟"

هێگبێرت دەسـتێکی هێنا بە ڕوخسـاریدا و ئاهێکی هەڵکێشا. ئەوسـا وتـی، "گـەر خـۆت پێت خۆشـە، دەتوانیت بچیت."

ناڵێم لە خۆشیدا پێم بە خۆمەوە نەدەگرت، نا، ئێجگار واشمان نەوت، بەڵام وەڵامەکەی بە دڵی من بوو.

جەیمی لێی پرسیم، "چی بێنم لەگەڵ خۆمدا؟" لە باشوور، لای ئێمە ئوسوڵ وا بوو، کە کەسێک بچووایە بۆ سەردانی کەسێکی تر، ئەو پرسیارەی دەکرد.

"پێویست ناکات هیچ بێنیت، چارەک بۆ پێنج دێم بەشوێنتدا."

تاوێک هەر وا، بێ ئەوەی هیچمان شتێک بڵێین، لە شوێنی خۆمان وەستاین، دیار بوو هێگبێرت خەریک بوو ئاگر لە دڵی بەر دەبوو. لەو کاتەوەی ئێمە لە بەردەرگا بووین، ئەو پەڕەیەکی لە کتێبەکەی هەڵنەدابووەوە، ئەمە ئەوەی دەگەیاند، خوێندنەوەی چی و شتی چی! بیروهۆشی هەر لای ئێمە بووە. ئەوسا جەیمی وتی، "سبەینێ دەتبینمەوە."

"زۆر باشە."

بۆ ساتێک سەری داخست، پاشان سەری هەڵبڕییەوە و وتی، "گەلێک سوپاس، کە منت گەیاندەوە ماڵەوە."

ڕووی وەر چەرخاند و پێی نایە ژوورەوە. کە دەرگاکەی دەداخست، بەئەستەم بزە شیرینەکەی سەر لێوانیم لە درزی دەرگاکەوە لێوە دیار بوو.

بۆ سبەینێ، هەر وەک قەولمان وا بوو، لە کاتی خۆیدا گەیشتمە جێ، سوپاس بۆ خوا، ئەم جاریش قژی نەکردبوو بە تەماتە، بەڵکوو بە دەستووری نماییشەکە بەری دابووەوە. ئەو بلووزەی لەبەر کردبوو، کە من بەدیاری پێشکەشم کرد، هەر وەک خۆیشی بەڵێنی دابوو، لەبەری بکات.

دایک و باوکم گەلێک سەریان سوور ما، کە ئیزنم لێ خواستن جەیمی بانگ بکەم بۆ خوانی ئێوارەی جەژنی کریسمس. کێشەیەک نەبوو، چونکە هەرکاتێک باوکم لە ماڵ بووایە، دایکم هێلینی بانگ دەکرد - ئاشپەزەکەمان - و بەشی سوپایەکی بچووک خواردنی لێدەنا.

وا بزانم پێشتر باسی ئەو ئاشپەزەم بۆ نەکردوون. لە ماڵی ئێمەدا، ئاشپەزێک و خزمەتکارێکمان هەبوو، تەنیا لەبەر ئەوە نا کە هەبوو بووین، بەڵکوو زیاتر بە هۆی ئەوەی دایکم باش چێشتی نەدەزانی. جاروبار بابۆڵەی بۆ دروست دەکردم بۆ قوتابخانە، بەڵام تا بابۆڵەیەکی ئامادە دەکرد، هەموو جلەکانی خۆی تێوە دەنا. دوو ڕۆژیشی دەویست تا پاکیان بکاتەوە. خوا خێری هێلین بنووسێ، ئەگینا تا ژنم دەهێنا، دەبوو پەتاتەی کوڵاوم بخواردایە. شکور باوکم هەر کە دایکمی هێناوە، ڕاست بۆی دەر کەوتبوو لە چێشتلێناندا لە ترێ کەریشی نەدەزانی، جا بۆیە هەر لەو کاتەوەی من چاوم بە دونیا هەڵهێناوە، ئەم ئاشپەز و خزمەتکارە ئیشمان بۆ دەکەن.

لەگەڵ ئەوەی خانووەکەی ئێمە لە زۆربەی خانووەکانی تری بیوفۆرت گەورەتر بوو - ناڵێم وەک کۆشک و تەلار بوو - بەڵام جێگەوڕێگەی وامان نەبوو تا ئاشپەز و خزمەتکارەکەش لەگەڵماندا بژین. باوکم بۆیە ئەم خانووەی کڕیبوو، لەبەر گرنگیی مێژووەکەی. خۆزگا خانووی کابرای چەتەی ڕیشڕەش بووایە، ئەو کاتە بەلای منەوە گەلێک گرنگتر دەبوو، بەڵام وەک باسی دەکەن، ئەمە

ماڵی ڕیچارد دۆبس سپایت* بووە، کە حاکمی ویلایەتی کارۆلاینای باکوور بووە و دەستووری نووسیوەتەوە. ئەم حاکمە کێڵگەیەکیشی هەبووە لە دەرەوەی شاری نیو بێرن، کە چەند کیلۆمەترێکی زۆر لە شەقامە سەرەکییەوە دوورە، وەک دەڵێن، هەر لەوێشدا نێژراوە. ئەم خانووەی ئێمەی تێدا بووین، ڕەنگە هێندەی ئەو شوێنە ناوبانگی نەبووبێت، کە خۆیان تێدا ناشتووە، بەڵام باوکم شانازیی پێوە دەکرد و لە ئەنجومەنی نوێنەرانیشدا هەیبەت و قورسایی پێ دەدا، هەرکاتێکیش بەنێو باخچەکەیدا دەگەڕا، خەونی بەوەوە دەبینی، لەپاش خۆی بە میراتی بەجێی بێڵێت. من هیچ دڵێکم پێی خۆش نەبوو، چونکە باوکم هەرچییەکی بکردایە، هێندەی ڕیچارد دۆبس ناوبانگی دەر نەدەکرد. ڕووداوێکی مێژوویی وەک نووسینەوەی دەستوور، تەنیا لە چەند سەد ساڵێکدا یەک جار ڕوو دەدا. جا کۆمەککردن و قەرەبووکردنەوەی جووتیاران یاخود تاوتوێکردنی مەسەلەی وەک بیری کۆمۆنیستی، شان لەشانی نادات. بگرە خەڵکی وەک منیش ئەو ڕاستییەیان دەزانی.

خانووەکەمان، وا بزانم هێشتا لە تۆماری شوێنە مێژووییەکاندا بوو. هەرچەندیش جەیمی پێشتر هاتبووە ماڵمان، کەچی هەر کە پێی نایە ژوورەوە، لە جوانی و ڕازاوەیی ماڵەکە سەری سووڕ ما. ئەو ئێوارەیە دایک و

---

* ڕیچارد دۆبس سپایت – Richard Dobbs Spaight: هەشتەهەمین حاکمی ویلایەتی کارۆلاینای باکوور بووە. لە ساڵی ١٧٥٨ لەدایک بووە و لە ساڵی ١٨٠٢ کۆچی دوایی کردووە.

باوکم خۆیان جوان گۆڕیبوو، منیش بە دەستووری ئەوان، خۆم تاسولووس دابوو. دایکم ئەملاولای جەیمیی ماچ کرد و بەخێرهاتنێکی گەرمی کرد. لێتان ناشارمەوە، بەغیلیم بە دایکم دەبرد کە لە ماچکردنی جەیمی پێشی دامەوە.

ئێوارەخوانێکی خۆشمان بەڕێ کرد، خۆراک و خواردنەوەیەکی باشمان خوارد. دایک و باوکم لەگەڵ جەیمی باسوخواسێکی زۆریان هێنایە پێشێ و ئەمنیش جاروبار هەر بۆ پێکەنین قسەیەکم فڕێ دەدا، بەڵام جێی خۆی نەدەگرت. تەنیا جەیمی بە قسەکانم پێکەنینی دەهات، ئەوەش بۆ من شتێکی خۆش بوو.

پاش خوانی ئێوارە، گەرچی سەرماوسۆڵە بوو و گوڵەکانیش وشک ببوون، جەیمیم لەگەڵ خۆم برد پیاسەیەک بەنێو باخچەکەدا بکەین. چاکەت و پاڵتۆمان لەبەر کردو چووینە دەرەوە، هێند سارد بوو، هەناسەمان دەبوو بە هەڵم.

هاتینە دەرەوە و کەمێک گەڕاین، ئەوسا وتی، "دایک و باوکت گەلێک مرۆڤی چاکن." دیار بوو زۆر گوێی نەدابوو بە قسەو وتارەکانی باوکی، کە هەندێک جار لەبارەی بنەماڵەکەمانەوە دەیگوتن.

"بەڵێ، گەلێک باشن، بەتایبەت دایکم، ژنێکی زۆر دڵساف و خوێنشیرینە." ئەم قسەیەم تەنیا لەبەر ئەوە نەکرد، کە بە شان و باڵی دایکمدا هەڵبەم، بەڵکوو لەبەر ئەوەی منداڵە هەتیوەکانیش هەمان شتیان بە جەیمی دەگوت. هیوادار بووم لە مەغزای قسەکەم تێبگات.

هەنگێ وەستا و سەرنجی چووە سەر گوڵەباخەکان. نە

گەڵا، نە گوڵیان نەگرتبوو، نازانم سەرنجی بەلای کوێی ئەم گوڵانەدا چوو.

لێی پرسیم، "ڕاستە دەڵێن جاران باپیرت ئاوها بووە؟"

بە خوا دیارە لە مەبەستی قسەکەی پێشووم تێنە گە یشتو و ە .

خۆم هیچ تێک نەدا و وتم، "بەڵێ، وا دەڵێن."

ئەویش وتی، "شتێکی ناخۆشە باپیرت لەو جۆە کەسانە بێت. پارە هەموو شتێک نییە، چڵکی دەستە و دەڕوات."

"وایە، دەزانم."

نیگایەکی کردم و وتی، "دەزانیت؟"

لە ساتی وەڵامدانەوەمدا تەماشای چاوەکانیم نەدەکرد. مەڵێن بۆچی، چونکە خۆشم نازانم بۆ.

"دەزانم ئەوەی باپیرم دەیکرد، خوا قبوڵی نەدەکرد."

"بەس خۆ تۆش ناتەوێ وەک ئەو بیت، وا نییە؟"

"ڕاستت دەوێ؟ هەرگیز بیریشم لێ نەکردووەتەوە."

"ئەی ڕۆژێک لە ڕۆژان بیری لێ دەکەیەوە؟"

وەڵامیم نەدایەوە، ئەویش ڕووی وەر چەرخاند بۆ لایەکی دی. جارێکی تر سەرنجی گواستەوە سەر گوڵەباخەکان، ڕاست بە زەینمدا هات، کە دەیویست بڵێم بەڵێ، منیش وەک باپیرم دەر دەچم.

خۆم پێ نەگیرا و لێم پرسی، "بۆچی شت وا لێدەکەیت؟"

ڕوومەتەکانم سوور هەڵگەڕان، "مەبەستم ئەوەیە، وام لێ دەکەیت هەست بە تاوانباری بکەم. خۆ من شتی وام نەکردووە، ئیتر تاوانی من چییە کە لەم بنەماڵەیە چاوم بە

دونیا هەڵهێناوە؟"

دەستی برد بۆ لقی دارگوڵەباخێک و بە دەنگێکی کز و لەسەرخۆ وتی، "جا خۆ ئەمە مانای ئەوە نییە نەتوانیت وا نەبیت. مەبەستم ئەوەیە، هەرکاتێک تۆش دەرفەتی وات بۆ ڕەخسا..."

مانای قسەکانی ڕوون و ئاشکرا بوو، بۆخۆشم لە دڵەوە دەمزانی ڕاستی دەکرد. بەڵام گەر شتی وا هەبێت، جارێ زۆری ماوە. بە بۆچوونی خۆم، شتی لەوە گرنگترم لە مێشکدا بوو تا بیری لێ بکەمەوە، نەدەپەرژامە سەر شتی وا. بابەتەکەم گۆڕی بۆ باسێک، کە زیاتر پەیوەندیی بە خۆمانەوە هەبێت.

لێم پرسی، "باوکت منی خۆش دەوێت؟" دەمویست بزانم هێگبێرت دەهێڵێت جارێکی تر چاوم بە جەیمی بکەوێتەوە.

ئێستێکی کرد و وەڵامی دامەوە.

بە دەنگی نزم و لەسەرخۆ وتی، "باوکم گەلێک خەمی منیەتی."

منیش وتم، "جا هەموو دایک و باوکێک هەر وا نین؟"

سەری نزم کرد، پاشان ڕووی بە لایەکی تردا وەر چەرخاند و تەماشای منی کردەوە. وتی، "بەڵام باوکم لە هەموو کەس جیاوازترە. بەڵێ، ئەو تۆی خۆش دەوێت، هەستیشی کردووە کە من بە بینینی تۆ کامەران دەبم، هەر لەبەر ئەمەش بوو ڕێگەی دا ئەم ئێوارەیە بێم بۆ ماڵتان بۆ خوانی ئێوارە."

لە دڵەوە وتم، "پێم خۆش بوو ڕێگەی دایت بێیت."

"منیش هەروەها."

ئاسمانی شەوەکە ساماڵ بوو، لەژێر تریفەی مانگەشەوەکەدا، بۆ تاوێک ئاوها نیگای یەکترمان کرد، خەریک بوو لێی بچمە پێشێ و ماچی بکەم، بەڵام ئەو زووتر وەر چەرخا و شتێکی سەیری گوت، سەرم سووڕ ما پێی.

وتی "لاندن، باوکم خەمی تۆشیەتی." پەژارە و نەرمی لە دەنگیدا دەبیسترا.

جا بۆیە دەڵێم، ئەم قسەیەی بە جۆرێک گوت، هەستێکی لا خولقاندم، هەستم کرد هێگبێرت لەبەر ئەوەی نەبووە کە من هەست بە بەرپرسیارێتی ناکەم یان جاران لەپشت درەختەکانەوە خۆم دەشاردەوە و گاڵتەم پێ دەکرد، یاخود لەبەر ئەوەی بووبێت، کە کوڕی بنەماڵەی کارتەرم.

لێم پرسی، "بۆچی خەمی منیشیەتی؟"

"لەبەر هەمان ئەو هۆکارەی کە منیش خەمی تۆمە."

هەر ئەوەندەی گوت و چیی تر درێژەی نەدایێ، دەمزانی شتێکی لە دڵدا بوو، شتێک، کە نەیدەتوانی بیڵێت، شتێک، کە خەم و پەژارەی بۆ دەهێنا. هەر نەمزانی ئەم نهێنییە چی بوو، تا دوای ماوەیەک، ئەوجا بۆم ڕوون بووەوە.

کەوتنە داوی خۆشەویستیی کچێکی وەک جەیمی سولیڤەن، بێشک نامۆترین هەست بوو لە ژیانمدا پێیدا تێپەڕ بیم. نەک تەنیا لەبەر ئەوەی کچێک بوو هەرگیز پێشتر بیرم لێ نەکردبووەوە - گەرچی هەر لە منداڵییەوە پێکەوە گەورە بووین - بەڵکوو بە هۆی ئەوەی شتێکی جیاواز لە دەروون

و هەستمدا جووڵابوو. ئەمەیان وەک ئەو پەیوەندییە نەبوو، کە کاتی خۆی لەگەڵ ئەنجێلا هەمبوو، کە هەر یەکەم جار زانیم کەسمان لێوە دیار نەبوو ماچیم کرد. کەچی ئەوەتا، هێشتا ماچی جەیمیم نەکردووە و لە ئامێزیشم نەگرتووە، بگرە هەر نەشمبردووە بۆ کافتریاکەی کەنار ڕووبارەکە یان بۆ سینەما و شتی وا. بەکورتی، هیچکام لەو شتانەم لەگەڵ جەیمی نەکردووە، کە ئاسایی لەگەڵ کچانی تردا دەمکرد. لێ ئەوەتا، ئێستا گیرۆدەی عەشقی ئەوم.

کێشەکە ئەوە بوو، هێشتا نەمدەزانی ئاخۆ ئەویش هەستی چۆن بوو بەرامبەر بە من.

ڕاستییەکەی، هەندێک نیشانە هەبوون، دەریان دەخست ئەم کچە منی خۆش دەویست. بێگومان ئەوە کتێبەکەی کە لە ڕۆحی خۆی خۆشتری دەویست، دابووی پێم، هەروەها ئێوارەی جەژنی کریسمسیش کە دەرگاکەی پێوە دەدا و بزەیەکی عاشقانەی کەوتبووە سەر لێو، بۆخۆی نیشانەیەک بوو، ئێ جگە لەمانەش، ئەو شەوەی لە خانەی هەتیوان گەیاندمەوەماڵەوە، لە ئوتومبێلەکەدا لێگەڕا دەستی بگرم. ئەمانە لە خۆڕایی نەبوون – تەنیا ئەوەندە بوو، نەمدەزانی چۆن هەنگاوی دواتر بنێم.

ئیدی ئێوارەی کریسمس، کە شێومان کرد و کاتی ڕۆیشتنەوەی هات، بردمەوە بۆ ماڵی خۆیان، لە ڕێگە لێم پرسی، داخۆ دەتوانم جاروبار بچم سەرێکی لێ بدەم؛ ئەویش بەلایەوە شتێکی باش بوو. هەر ڕاست وەڵامەکەشی وا بوو، گوتی، "شتێکی باشە." گوێم نەدایێ، ئەم وەڵامە

ساردوسڕەیم نەهێنایە سەر خۆم – جەیمی بۆخۆی عادەتی وا بوو کە قسانی دەکرد، دەتگوت گەورەکانە، پێم وا بێ هەر ئەوەش بوو وای کردبوو لەگەڵ خەڵکی لە خۆی بەتەمەنتردا دەگونجا.

بۆ ڕۆژی دواتر، بە پێ بەرەوماڵیان بەڕێ کەوتم، سەیرم کرد ئۆتومبێلەکەی هێگبێرت لە دەرەوە نەبوو. جا کاتێک جەیمی دەرگای لێ کردمەوە، بۆخۆم شعورم پێی شکا، کە نەدەبوو ڕوخسەت بخوازم بچمە ژووری. چونکە هێگبێرت لە ماڵ نەبێت، چوونەژوورەوە حەرامە.

"لاندن، چۆنی؟" وەک هەموو جارەکانی تر، بەو دەستوورە دەرگای لێ کردمەوە، وەک ئەوەی بینینی من ڕێکەوتێکی سەیر بێت بۆ ئەو. ئەم جاریش قژی بەر دابووەوە، لە بیری خۆمدا گوتم، ئەمەشیان لە خۆڕایی نییە.

"سڵاو جەیمی."

دەستێکی بەرەو لای کورسییەکانی ژێر داڵانەکە درێژ کرد و وتی، "فەرموو، باوکم لە ماڵ نییە، بەڵام لە دەرەوە، لەسەر ئەو کورسییانە دادەنیشین..."

ئێوەش هیچ لێم مەپرسن چۆن بوو و چۆن ڕووی دا. چونکە تاکوو ئێستا بۆخۆشم سەری لێ دەرناکەم. ساتی یەکەم لە بەردەمیدا وەستابووم، چاوەڕوانم دەکرد پێشم کەوێت بەرەو لای کورسییەکان، لێ ساتی دووەم نەجووڵام. لەباتی ئەوەی قاچ هەڵهێنمەوە بۆ ئەوێ، کەمێک لێی چوومە پێشێ و دەستەکانیم گرت. دەستم نایە نێو دەستی و چاوم بڕییە چاوەکانی، کەمێکی تر چوومە پێشێ. ئەویش هیچ

هەڵوەستەیەکی نەکرد و لە شوێنی خۆی نەجووڵا، لێی واقی وڕ مابوو. بۆ ساتەوەختێکی کورت وام بە زەیندا هات، شتێکی باش ناکەم، ئاخۆ شەیتان بەنەعلەت بکەم و بەردەوام بم، یان بکشێمە دواوە. ئێستێکم کرد و بزەیەکم بۆ کرد، کەمێک سەرم بەلادا وەر چەرخاند، هەر ئەوەندەم زانی، ئەویش چاوەکانی داخست و زیاتر سەری هێنایە پێشێ، بە جۆرێک، ڕوومان لە ڕووی یەکدی دەدا.

زۆری پێ نەچوو، لەو جۆرە ماچانەش نەبوو کە لەم ڕۆژگارەدا ئێوە لە فیلمەکاندا دەیبینن، بەڵام تاموچێژی خۆی هەبوو، جا ئەوەی لەبیرم بێت، ئەو ساتەیە کە لێومان بەر لێو کەوت. دەمزانی ئەم ساتە کورتە دەبێتە یادەوەرییەک، هەرگیز بیر ناچێتەوە.

## ١١

"تۆ یەکەمین کوڕی لە ژیانمدا ماچم کردبێت."

چەند ڕۆژێکی کەمی مابوو بۆ سەری ساڵی نوێ، من و جەیمی پێکەوە لە شارۆچکەی پاین نۆڵ شۆرس لەسەر کەناری دەریاکە وەستابووین. بۆ ئەوەی بگەینە ئێرە، دەبوو بە پردی سەر ڕووباری ئینتراکۆستڵدا بپەڕینەوە و کەمێکی تر بە دوورگەکەدا ڕێ بکەین، تا دەگەیشتینە ئەم کەنارە. لەم سەردەمەدا شوێنەکە بووەتە یەکێک لە کەنارە گەشتیارییە گرانبەهاکانی ویلایەتی کارۆلاینای باکوور، بەڵام کاتی خۆی، ئەم شوێنە تەنیا تەپۆڵکە لمێکی ورد بووە و هیچی تر.

منیش وتم، "خۆشم هەر وای بۆ چووم، ڕەنگە یەکەم کوڕ بم ماچی بکەیت."

"بۆچی؟ کارێکی هەڵەم کردووە؟" بە شێوازی پرسیارەکەیدا دیار بوو گەر لە وەڵامدا بشمگوتایە بەڵێ، لە دڵی نەدەگرت و بێتاقەت نەدەبوو پێی، بەڵام خودا دەیگرتم گەر وام بگوتایە.

دەستیم توند گوشی و وتم، "ماچت گەلێک خۆش بوو."

سەرێکی لەقاند و نیگای گواستەوە سەر زەریاکە، ئەم

جاریش چاوی بڕییە ئاسۆی دوور. ماوەیەکە زۆر جاران ئەم خووەی گرتووە. منیش تا ساتەوەختێک لێگەڕام ئەوها نوقمی ئاسۆ ببێت، ئەوجا بێدەنگییەکەم شکاند.

لێم پرسی، "جەیمی، تۆ باشیت؟"

لەباتی وەڵامم بداتەوە، بابەتەکەی گۆڕی و وتی، "هەرگیز لە ژیانتدا کەسێکت خۆش ویستووە؟"

دەستێکم بە قژمدا هێنا و لێم پرسی، "مەبەستت پێش ئێستایە؟"

پێشتر ئێریکی هاوڕێم ئامۆژگاریی کردبووم، گەر کچێک ئەو پرسیارەی لێ کردم، منیش ئاوها وەڵامی بدەمەوە. ئێریک لەو مەسەلانەدا سەری سپی کردبوو.

بە تیلەنیگایەک تەماشای کردم و وتی، "لاندن، بەڕاستمە، پێم بڵێ کەست خۆش ویستووە؟"

وا بزانم ئەویش ئەو فیلمانەی دیتووە، لەوسەری هاتبووەوە. کە بیرم لە پرسیارەکەی دەکردەوە، دەکەوتمە ئاقارێکی تاریکەوە، ئاخۆ چۆن وەڵامی بدەمەوە. شپرزەیی دای گرتم. دواجار تینم دایە خۆم و وتم، "ڕاستییەکەی، بەڵێ."

نیگای هێشتا هەر لە دوور دەڕوانی. گوتم ڕەنگە ئێستا بیری بۆ لای ئەنجێلا بچێت و وا بزانێت مەبەستم ئەوە. بەڵام لێتان ناشارمەوە، ئەو هەستەی هەمبوو بۆ ئەنجێلا، گەلێک جیاواز بوو لە هەست و سۆزی ئێستام بەرامبەر بە جەیمی.

لێی پرسیم، "چۆن دەزانیت هەستی خۆشەویستی بووە یاخود نا؟"

شنەبایەکی فێنک هەڵی کردبوو، بەنەرمی یاریی بە قژە

خاوەکەی دەکرد و دەیهێنا و دەیبرد. ئیدی کاتی ئەوە نەما پێچوپەنا بێنمەوە و بە جۆرێکی تر خۆم دەر بخەم و واش نەبم. بۆیە ڕوون و ئاشکرا وتم، "خۆشەویستی ڕاستەقینە کاتێک وەدیار دەکەوێت، کە هەردووکتان پەرۆشی یەکدی بن و تاکە ئامانجتان پێکەوەژیان بێت."

بیرێکی لە وەڵامەکەم کردەوە و بزیەکی کاڵی بە ڕوودا هات.

ئەوسا بە دەنگێکی نەرم وتی، "تێدەگەم."

چاوەڕوان بووم قسەی تریشی بەدوادا بێنێت، بەڵام هیچی تری لە زار نەهاتە دەر. ئەمنیش لەو کاتەدا درکم بە ڕاستییەکی تر کرد.

ڕاستە پێدەچێت جەیمی زۆر تێکەڵی کوڕوکاڵ نەبووبێت، لێ لە هەڵسوکەوتدا گەلێک بە سیاسەت بوو، یاریی بە عەقڵت دەکرد.

بۆ نموونە، دوو ڕۆژی دوای ئەوەش، کە پێکەوە دەچووینە دەرەوە، قژی دیسان دەکردەوە بە تەماتە و لە دواوە دەیبەست.

ئێوارەی سەری ساڵی نوێ، لەگەڵ خۆم بردم تا لە دەرەوە نان بخۆین. ئەو ئێوارەیە یەکەمین ژوانی جەیمی بوو لە ژیانیدا لەگەڵ کوڕێک بچێتە دەرەوە بۆ نانخواردن. چووینە شاری مۆرهێد و لەسەر کەناری ڕووبارەکە چێشتخانەیەکی بچووکمان هەڵبژارد. شوێنەکە ناوی فلاوفین بوو. یەکێک بوو لەو چێشتخانانەی خامی سپییان دەدا بەسەر مێزەکاندا و قاپ و کەوچک و چەتاڵیان پێشتر لەسەر مێزەکە ئامادە دەکرد و بە مۆمی داگیرساو، هەریەک لە مێزەکانیان

دەڕازاندەوە. شاگردەکان هەموو جلوبەرگی ڕەش و سپییان پۆشیبوو. کە لە پەنجەرە گەورەکانیشەوە تەماشای دەرەوەت دەکرد، ڕووناکیی مانگ هێدی هێدی دەکەوتە سەر ڕووی ڕووبارەکە.

پیانۆژەن و گۆرانیبێژێکیش لەوێ ئامادە بوون، ئەمانە هەموو شەوێک نەدەهاتن، بەڵکوو هەرکاتێک لە پشووەکاندا بیانزانیبا شوێنەکە جەنجاڵ دەبێت و خەڵکێکی زۆر ڕووی تێ دەکەن، ئەوجا دەهاتن. پێش ئەوەی بچینە ئەوێ، دەبوو مێزێک بگرم بۆ خۆمان، جا یەکەم جار کە تەلەفۆنم بۆ کردن، گوتیان جێگە نەماوە، بەڵام ناچار دایکم ڕاسپارد پەیوەندییان پێوە بکات، ئیتر ئیشەکەم ماشی بوو. لەوە دەچێت خاوەن چێشتخانەکە ئیشی بە باوکم بووبێت یان شتێک، بۆیە هەر کە دایکم تەلەفۆنی کرد، مێزێکیان بۆ دابین کردم. یاخود ڕەنگە تەنیا لەبەر ئەوە بووبێت، نەیویستووە دڵی باوکم زویر بکات، چونکە زانیویەتی باپیرم هێشتا لە ژیاندا ماوە.

ڕاستییەکەی، تەگبیری دایکم بوو کە جەیمی ببەم بۆ شوێنێکی ئەوها تایبەت. دوو ڕۆژ پێش ئەوە، لەو ماوەیەی جەیمی دیسانەوە قژی دەکردەوە بە تەماتە، هەموو شتێکم بۆ دایکم گێڕایەوە و نیاز و خواسی خۆم بۆ هەڵڕشت.

بە دایکم گوت، "دایکە، ئەم کچە بیروهۆشی داگیر کردووم، دەزانم ئەویش منی خۆش دەوێت، بەڵام نازانم تا چەند وەک من بیر دەکاتەوە."

دایکم لێی پرسیم، "ئەوەندەت ئەو کچە لا گرنگە؟"

"بەڵێ، زۆر."

"باشە، ئەی تا ئێستا چ هەنگاوێکت ناوە؟"
"مەبەستت چییە؟"
دایکم بزەیەکی کرد و ئەوسا وتی، "قەسدم ئەوەیە، کچانی گەنج، تەنانەت جەیمییش، حەز دەکەن گرنگییەکی تایبەتییان پێ بدرێ."
بۆ ساتێک بیرم لەو قسەیەی دایکم کردەوە، هەنگێ تێ ڕامام، نەمدەزانی چۆنی ورد بکەمەوە. تۆ بڵێی مەبەستی هەر ئەوە نەبێ کە خۆم هەوڵم بۆی دەدا؟
وتم، "ماوەیەکە هەموو ڕۆژێک دەچم بۆ ماڵیان."
دایکم دەستی خستە سەر ئەژنۆم. هەرچەند لە کاروباری ناوماڵ و چێشتلێناندا فرێ بەسەر هیچەوە نەبوو، وەک پێشتریش باسم کرد، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا مرۆڤێکی گەلێک دڵساف و خوێنگەرم بوو.
"سەردانکردنی ماڵیان شتێکی خراپ نییە، بەڵام شتی لەوە ڕۆمانسیتر هەیە بیکەیت. دەبێت کارێک بکەیت، کە هەست بکات بەڕاستی خۆشت دەوێت."
دایکم تەگبیری بۆ کردم بچم بۆنێکی خۆشی بۆ بکڕم، لەگەڵ ئەوەی بۆخۆشم دەمزانی جەیمی گەلێکی پێ خۆش دەبێت، بەڵام بیرم لێ کردەوە، گوتم بۆن و عەتر و شتی وا بۆ ئەو نابێت. لەبەر ئەوەی باوکی نەیدەهێشت مەکیاج بکات - جگە لەو ڕۆژەی نمایشەکە - بۆیە دڵنیا بووم گەر بۆیشم بکڕیبایە، لە خۆی نەدەدا. ئیدی کە ئەمەم بە دایکم گوت، ئەویش ئەو تەگبیرەی بۆ کردم، ئێوارەیەک بیبەمە دەرەوە و پێکەوە نانێک بخۆین.
بەخەفەتباری بە دایکم وت "هیچ پارەم پێ نەماوە." ڕاستە

بنەماڵەکەمان دەوڵەمەند بوو و دایمە خواش پارەی گیرفانیان دەدامێ، بەڵام گەر زوو پارەکەم خەرج بکردایە، هیچی تریان نەدەدامێ، تا کاتی خۆی دەهاتەوە. باوکم جارێکیان پێی گوتم، "دەبێت هەست بە بەرپرسیاریێتی بکەیت و دەست بە پارەوە بگریت، چونکە دروستت دەکات."

دایکم پرسیی، "ئەی ئەو پارەیەت چی لێ کرد، کە لە بانک دات نابوو؟"

ئاهێکم هەڵکێشا، ئەوجا بۆم ڕوون کردەوە چیم لە پارەکە کرد، ئەویش بێدەنگ دانیشتبوو، گوێی بۆ شل کردبووم. کە تەواو بووم، تەلیسمێکی ڕەزامەندی بە ڕوخساریدا هات، وەک ئەوەی بڵێ ئافەرین، خەریکە دەبیت بە پیاو.

بە دەنگێکی ئارامەوە وتی، "بۆ خۆمی دابنێ. تۆ تەنیا ئەوەندە بزانە، ئاخۆ بۆخۆی حەز دەکات لەگەڵت بێتە دەرەوە، گەر باوکی لێگەڕێ. ئەو کاتە کە زانیت پێی خۆشە و دەتوانێ، بۆخۆمان ڕێگەیەک دەدۆزینەوە سەر بگرێت. خەمت نەبێت."

بۆ ڕۆژی دوایی، چووم بۆ کڵێسا. دەمزانی هێگبێرت دەچێتە ئەوێ و لە نووسینگەکەی خۆی دەبێت. سەرەتا هێشتا بە جەیمیم نەگوتبوو، چونکە ئەویش هەر دەبوو داوای ڕوخسەت لە باوکی بکات، جا بۆیە بە باشم زانی بۆخۆم بچم لەگەڵ باوکی قسە بکەم. هەرکاتێک دەچووم بۆ ماڵیان، هێشتا نەگەیشتبوومە بەردەرگاکەیان، حاسەی شەشەمی هێند کارا بوو، ڕاست دەیزانی، لەپشت پەردەکانەوە دەکەوتە سەرەتاتکێ وای دەزانی کوێرم، نایبینم. کە لە دەرگاشم دەدا، پێی دەچوو تا لێی دەکردمەوە، دەتگوت ڕێیەکی ئەوەندە

دووره. جارێ بۆ ئێستێک هەر وا لێم ڕادەما، هەناسەیەکی قووڵی هەڵدەکێشا و سڵاوی دەکرد.

بە هەرحاڵ، کە چوومە کڵێسا، کەمێکی دەرگای نووسینگەکەی کرابووەوە، بینیم لەپشت مێزەکەیەوە دانیشتبوو، چاویلەکەکەیشی کەمێک هێنابووە خوارێ بۆ سەر لووتی. هەندێک کاغەزی لە بەردەم بوو، سەری بەسەردا شۆڕ کردبوونەوە – کاغەزەکان لە پسووڵەی پارە و حسابات دەچوون – دیار بوو حسابی بودجەی ساڵی داهاتووی کڵێساکەی دەکرد.

تەقەم لە دەرگا دا، بە ڕوخسارێکی گەشەوە سەری هەڵبڕی، وەک ئەوەی چاوەڕوانی قەشەیەکی تری کڵێساکە بکات. ئەوسا کە بینیی منم، گرێ کەوتە نێوچەوانی و ڕووە گەشەکەی کاڵ بووەوە.

بە ئەدەب و ئوسوڵەوە وتم، "ئەم کاتەت باش، جەنابی هێگبێرت. کاتت هەیە کەمێک قسە بکەین؟"

هێند ماندوو دیار بوو، دەتگوت کۆڵی ئەم دونیایە بەسەر شانی ئەوەوە، دیار بوو حاڵی باش نەبوو.

بە دەنگێکی ماندوو و مردەلۆکەوە وتی، "ئەم کاتەی تۆش باش، لاندن."

جلوبەرگێکی جوان و چاکەت و بۆینباخێکیشم بەستبوو. وتم، "دەتوانم بێمە ژوورەوە؟"

بە ساردوسڕییەوە سەرێکی لەقاند و ئەمنیش وەژوور کەوتم. فەرمووی لێ کردم لەسەر کورسییەکەی بەردەم مێزەکەی دابنیشم.

لێی پرسیم، "فەرموو، خێرە هاتوویت بۆ ئێرە؟"

شپرزەیی دای گرتبووم، لەسەر کورسییەکەم کەمێک خۆم ڕێک خست و وتم، "جەنابی هێگبێرت، ئەوەی ڕاستی بێت، هاتووم داوای شتێکت لێ بکەم."

چاوێکی تێ بڕیم و لێم ورد بووەوە، پاشان وتی، "پەیوەندیی بە جەیمییەوە هەیە؟"

هەناسەیەکی قووڵم هەڵکێشا.

"بەڵێ، جەنابی هێگبێرت. ویستم دواتان لێ بکەم، گەر بەڕێزتان ڕەزامەند بن، جەیمی لەگەڵ خۆم ببەمە دەرەوە بۆ ئێوارەی سەری ساڵی نوێ و پێکەوە نانی ئێوارە بخۆین."

ئەویش ئاهێکی قووڵی هەڵکێشا و وتی، "هەر ئەوەندە؟"

"بەڵێ، هەرکاتێک جەنابتان ئەمرتان فەرموو، ڕاست دەیهێنمەوە بۆ ماڵەوە، زۆرمان پێ ناچێت."

چاویلکەکەی دانا و بە دەستەسڕەکەی خاوێنی کردنەوە، دواتر لەچاوی کردەوە. دیار بوو بیری لێ دەکردەوە. وتی، "دایک و باوکیشت لەگەڵتان دێن؟"

"نەخێر، جەنابی هێگبێرت."

"دەی کە وا بێ، ڕێگە بە شتی وا نادەم. سوپاسیشت دەکەم بۆ هاتنەکەت." دووبارە سەری خستەوە سەر کاغەز و شتەکانی بەردەمی، وەک ئەوەی بڵێ فەرموو، ئێستاش دەتوانی بڕۆیت و ملی خۆت بشکێنی. هەڵسام و بەرەو دەرگای نووسینگەکە ڕۆیشتم، پێش ئەوەی پێ بخەمە ئەودیو، جارێکی دی ئاوڕم بۆ دایەوە. "جەنابی هێگبێرت؟"

سەرێکی هەڵبڕی، سەری سووڕ ما کە هێشتا لەوێ مابووم.

وتم، "داوای لێبووردن دەکەم بۆ هەموو ئەو هەڵسوکەوتە

ناشرینانەی جارانم، داوای لێبووردن دەکەم کە جاران مامەڵەم لەگەڵ جەیمی باش نەبوو. بەلام لە ئێستا بەدواوە، شتەکان دەگۆڕێن. بەڵێنت دەدەمێ."

ڕاست چاوی سەرنجی بڕییە چاوم. منیش هەر بەوەندە دڵم ئاوی نەخواردەوە. وتم، "من ئەوم خۆش دەوێت." کە وام گوت، هێندەی تر لێم ڕاما.

بە خەفەتبارییەوە وتی، "دەزانم کچەکەمت خۆش دەوێ. بەلام نامەوێ تووشی خەم و ئازار بێت." بینیم فرمێسک زایە نێو چاوەکانی و کەمێک سوور هەڵگەڕان.

وتم، "من نایەڵم تووشی خەم و ئازار ببێت."

ڕووی لێم وەر چەرخاند و نیگای چووە سەر پەنجەرەی ژوورەکە، ڕۆژێکی سارد بوو، هەورێکی چڕیش بەری ئاسمانی گرتبوو. دواجار وتی، "بە مەرجێک، دەبێت کاتژمێر دە بیهێنیتەوە ماڵێ."

ڕووم گەشایەوە و ویستم سوپاسی بکەم، بەلام هیچم نەگوت. چونکە دیار بوو دەیویست زوو بەجێی بێڵم و بەتەنها بێت. لەو ساتەدا کە هەنگاوم هەڵهێنا بچمە دەرەوەی ژوورەکە، بینیم دەستەکانی نا بە ڕوخساری خۆیەوە و سەری داخست، وەک ئەوەی بۆخۆیشی بزانێت بڕیارێکی هەڵەی داوە.

کاتژمێرێکی پێ چوو، ئەوجا چووم بە جەیمییشم گوت. یەکەم قسەی ئەوە بوو، گوتی لەوە ناچێت بتوانم لەگەڵت بێمە دەرەوە، منیش حاڵ و مەسەلەم تێ گەیاند و بۆم باس کرد کە بە باوکیم گوتووە و ڕازییش بووە. واقی وڕ ما، بڕوای نەدەکرد بتوانم ئاوها چاونەترسانە بچم بۆ

لای باوکی و داوای شتی وای لێ بکەم. ئیتر وا بزانم هەر ئەمەش بوو، لەوەبەدوا تێڕوانینی بەرامبەر بە من گۆڕا. حاڵ و مەسەلەم تێگەیاند، بەڵام تەنیا ئەوەم پێ نەگوت، کە لە کاتی هاتنەدەرەوەمدا لە نووسینگەکەی باوکی، بینیم فرمێسک زابووە نێو چاوەکانی. نەک تەنیا لەبەر ئەوەی تێی نەدەگەیشتم بۆچی دەگری، بەڵکوو نەمدەویست جەیمی خەفەت بخوا و دڵی لای باوکی بێت. ئیدی ئەو شەوە، دوای ئەوەی جارێکی تر قسەم لەگەڵ دایکمدا کردەوە، ئەویش گوتی ناهەقی نەبووە بگری. دیارە هێگبێرت گەیشتووەتە ئەو بڕوایەی ئیدی کچەکەی گەورە بووە و وردەوردە لێی دوور دەکەوێتەوە و ژیانی خۆی هەڵدەبژێرێت. لێتان ناشارمەوە، خۆزگەم دەخواست وا بێت.

ئەو ئێوارەیە، لە کاتی خۆیدا چووم بەشوێنیدا. گەرچی من پێم نەگوتبوو قژی بەر بداتەوە، کەچی لەبەر خاتری من وای لێ کردبوو. بە پردەکەدا تێپەڕین و لەوێشەوە بۆ چێشتخانەکە، لە ڕێگە هیچمان لە زار نەهاتە دەر. هەر گەیشتینە بەردەم چێشتخانەکە، خاوەنەکەی هات بە پیرمانەوە و بە فەرموو فەرموو بەرەو مێزەکەی خۆمان ڕێنوێنیی کردین. یەکێک بوو لە مێزە تایبەتەکانی ئەو شوێنە.

ئەو ساتەی ئێمە گەیشتین، هێند جەنجاڵ بوو، جمەی دەهات، خەڵکی لە هەرچوار لامانەوە دانیشتبوون و بای باڵی خۆیان دەدا. ئوسوڵ وا بوو، لە شەوانی سەریساڵی نوێدا، هەموو بە جلوبەرگی نوێوە دەهاتنە دەر. لەو شوێنەدا، تەنیا من و جەیمی نەبێت، ئەوانی دیکە هەموو ماڵ و خێزان بوون.

جەیمی پێشتر قەت سەری نەکردبوو بەم چێشتخانەیەدا،

هەر چاوی بە دەوروپشتدا دەگێڕا، بۆیە کەمێکی پێ چوو تا چاوی بە شوێنەکە ڕاهات. شەپۆلێکی بەختیاری سەر ڕووی داگرتبوو، لە زەینی خۆمدا گوتم، بە خوا دایکم تەگبیرێکی چاکی بۆ کردووم.

جەیمی وتی، "شوێنێکی گەلێک خۆشە. سوپاس بۆ ئەم بانگهێشتە."

بە ڕوویەکی گەشەوە وتم، "خۆشحاڵم."

"پێشتر هاتوویت بۆ ئێرە؟"

"هەندێک جار هاتووم. جاروبار کە باوکم لە واشنتۆن دەگەڕێتەوە، لەگەڵ دایکمدا حەز دەکەن بێین بۆ ئێرە."

سەرنجی چووە سەر دەرەوە و لە پەنجەرەکەوە تەماشای بەلەمێکی دەکرد لە ڕووبارەکەدا، کە بەلای چێشتخانەکەدا تێدەپەڕی، ڕووناکیی گڵۆپەکانی تیشکیان دەدایەوە. بۆ ساتێک نوقمی خەیاڵ بوو، پاشان وتی، "ئێرە شوێنێکی زۆر جوان و دڵگیرە."

منیش وتم، "تۆش بە هەمان شێوە."

کەمێک سوور هەڵگەڕا و وتی، "گاڵتەم لەگەڵ دەکەیت؟"

کەمێک دەنگم کز کرد و وتم، "زۆر بەڕاستمە."

دەستمان لەناو دەستی یەک نا و تا شاگردەکان خواردنەکەیان بۆ هێنایین، باسوخواسی چەند مانگی ڕابردوومان هێنایە پێشێ. کە باسی ئاهەنگی دەستپێکی پشووی هاوینەکەمان کرد، جەیمی پێکەنینی دەهات، ئەمنیش بۆم گێڕایەوە، کە ئەو کاتە کچێکم دەست نەدەکەوت ژوانی لەگەڵ ببەستم بۆ ئاهەنگەکە و دواتر هاتم داوام لەو کرد بێت لەگەڵم. دەمزانی بۆخۆیشی هەستی پێ کردبوو. بە هەرحاڵ،

ئیدی تا خواردنەکە هات، قسەی خۆش و یادەوەرییەکانی ئەو ڕۆژانەمان هێنایەوە پێشێ.

بە شۆخییەوە وتی، "جارێکی تر دەمبەیتەوە؟"

"بێگومان."

خواردنەکەیان گەلێک بەتام بوو – هەردووکمان ماسی و زەلاتەمان داوا کرد. دوای ئەوەی تەواومان کرد و شاگردەکان هاتن قاپەکانیان لا برد، مۆسیقا دەستی پێ کرد. هێشتا کاتژمێرێکی مابوو هەڵسین و بڕۆینەوە. دەستم برد بۆ دەستی، تا پێکەوە سەما بکەین.

سەرەتا تەنیا من و جەیمی دەستپێشخەریمان کرد، لەسەر مێزەکە هەڵساین و کە بەرەو نێوەندی چێشتخانەکە دەچووین، هەموو تەماشایان دەکردین.

دیار بوو هەموو دەیانزانی هەستمان بەرامبەر یەکدی چۆنە، کە ئێمەیان دەبینی، زەمانی گەنجێتیی خۆیان دەهاتەوە یاد. بە بزە و خەندەی کامەرانییەوە تەماشایان دەکردین. گڵۆپەکان ڕووناکییەکی کزیان پەخش دەکرد، کاتێکیش گۆرانیبێژەکە ئاوازێکی خاوی دەست پێ کرد، لە ئامێزم گرت و لە خۆ،م نزیک کردەوە. بەدەم سەماکردنەوە، لە زەینی خۆمدا دەمگوت ئاخۆ چ شتێکی تر لە ژیانمدا هێندەی ئەم ساتەوەختە بەچێژ و ئارامبەخش بێت، هەر بۆخۆشم وەڵامی خۆمم دەدایەوە، دەمگوت هیچ شتێک.

هەستی خۆشەویستی زابووە نێو دڵ و دەروونمەوە، هەستێک بوو، ڕاپێچی دونیایەکی دەکردم، هیچ کات و زەمانێک بە عەقڵمدا نەهاتبوو.

دوای سەری ساڵی نوێ، تا هەفتە و نیوێکیش هەر وا

بە دەستووری عاشقەکانی تر پێکەوە دەگەڕاین و پیاسەمان دەکرد و ئەم جۆرە شتانە، جاروباریش جەیمی بێتاقەت و کەمحەوسەڵە دەبوو. لەو ماوەیەدا دەچووینە سەر کەناری ڕووباری نیۆس و لەوێوە بەدەم قسەوباسەوە بەردمان هەڵدەدایە نێو ئاوەکەوە و تەماشای شەپۆلەکانمان دەکرد، هەندێک جاریش دەچووینە قەراغ دەریاکە و لەوێ دادەنیشتین. هەرچەندیش زستان سەرماوسۆڵەی هێنابوو، لێ ئارامی پێ دەبەخشین. دوای کاتژمێرێک، ئەوسا جەیمی داوای دەکرد بیبەمەوە بۆ ماڵێ، لە ڕێگە، لەناو ئوتومبێلەکەدا تا دەگەیشتین، دەستمان لەناو دەست دەکرد. جاروباریش جەیمی لە ئوتومبێلەکەدا خەریک بوو خەو دەیبردەوە و کەچی جاری واش هەبوو، تا بەردەرگای ماڵەوە لە قسان نەدەوەستا، بواری نەدەدا من شتێک بڵێم.

بێگومان هاوەڵیکردنی جەیمی مانای ئەوە بوو هەرچییەک بکەم، دەبێت بە دڵی ئەویش بێت. ئەوی ڕاستی بێ، من نەدەچووم بۆ خولی فێربوونی ئینجیل - نەمدەویست لە بەرچاوی ئەو تەریق ببمەوە - بەڵام دوو جاری تر چووین سەردانی خانەی هەتیوانمان کردەوە، هەرجارێکیش کە دەچووین، گەلێک هەستم بە بەختیاری دەکرد لەوێ، بە ماڵی خۆمم دەزانی. لێ ڕۆژێکیان لە خانەی هەتیوان بووین، ئەوەندەم زانی، جەیمی تایەکی قورس دای گرت و ڕوخساری سوور هەڵگەڕا، ئیدی دەبوو زوو هەڵسین و بەپەلە بیگەیەنمە ماڵەوە.

ئێ بە هەرحاڵ، کە پێکەوە دەبووین، یەکتریشمان ڕادەموسی، هەموو جارێکیش نا، بەڵام جاروباری تێ

دەکەوت، نەمدەویست بیکەم بە خوو و بیتام ببێت. ماچەکانی گەلێک نەرم بوون، کە لێوم دەنا بە لێویەوە، هەستێکی ئارامبەخش بە ڕۆحمدا دەهات، ئەوەندە بۆ من بەس بوو، هەموو دونیای دەهێنا بۆ من. هەتا زیاتر لە جەیمی نزیک بوومایەتەوە و زیاتر لێومان بەر لێوی یەکدی بکەوتایە، زیاتر ئەو ڕاستییەم لا ڕوون دەبووەوە، کە خەڵکی لە سەرەتاوە بەهەڵە لەم کچە گەیشتوون، بگرە بە خۆشمەوە.

جەیمی تەنیا ئەوە نەبوو کچی قەشەیەکی گەورەی کڵێسا بێت و هەر خەریکی خوێندنەوەی ئینجیل بێ و ژیانی تەرخان کردبێت بۆ یارمەتیی منداڵانی هەتیو، بەڵکوو ئەویش، بە هەمان شێوەی کچانی تر، کیژۆڵەیەکی تەمەن حەڤدەساڵانی ئەو سەردەمە بوو، ئەویش، هەر بە دەستووری من، هیوا و خولیای لە مێشکدا هەبوو. هەتاکوو بۆخۆیشی دواجار ئەم شتانەی لا باس کردم.

هەرگیز ئەو ڕۆژەم لەیاد ناچێ، کە چەند بێدەنگ و ئارام دەهاتە پێش چاو، بەدرێژاییی ئەو ڕۆژە لە زەینمدا هەر دەمهێنا و دەمبرد، دەمگوت دیارە شتێکی لە مێشکدایە، بۆیە ئاوها ماتومەلوول بووە.

ڕۆژێکی شەممە، پێش ئەوەی قوتابخانە دووبارە بکرێتەوە، لە کافتریاکە بە پێ دەگەڕاینەوە، ڕۆژێکی باوبۆران و سەرماوسۆڵە بوو، هەوای ساردی زستان، وەک خەنجەر دەچوو بە گیانتدا. لە بەیانیی ڕۆژی پێشووترەوە ئەم ڕەشەبایە هەڵی کردبوو، خۆشی نەدەکردەوە، بۆیە لە ڕێگە کە دەڕۆیشتین، دەبوو خۆمان لە یەکتر بئاڵێنین، تا سەرما زۆر کارمان تێ نەکات. جەیمی لە سەرمادا باوەشی

پێدا کردبووم و بەکاوەخۆ ڕێمان دەکرد، بگرە لە جارانی تر هێواشتر دەڕۆیشتین، دیار بوو ئەمڕۆش حاڵی باش نەبوو. ئەوی ڕاستی بێ، لەبەر هاوڕێکانم، من زۆرم لێ کرد بچینە دەرەوە، دەنا ئەو بە هۆی سەرماوسۆڵەوە دڵی پێوە نەبوو لەگەڵم بێت. دەمگوت ئیدی کاتی ئەوە هاتووە هاوڕێکانم هەموو شتێک بزانن، پێویستی نەدەکرد لێیان بشارمەوە. کەچی قەدەری خوا وا بوو، چووینە کافتریاکە و کەسی تری لێ نەبوو، کەناری ڕووبارەکەی تەنیشتی کشومات، لەبەر سەرمای زستان، کەس نەیدەتوانی بێتە دەرێ.

لە ڕێگە کە دەهاتینەوە، جەیمی بێدەنگی دای گرتبوو هیچی نەدەگوت، دەمزانی شتێکی لە خەیاڵدایە و دەیەوێت شێوازێک بدۆزێتەوە و پێم بڵێت. هەر وا بەو شێوەیە کەمێکی تر ڕێمان کرد، ئەوسا بێدەنگییەکەی شکاند و وتی، "خەڵکی بە کەسێکی نامۆ لە من گەیشتوون، وا نییە؟"

گەرچی بۆخۆم وەڵامی پرسیارەکەیم دەزانی، لێ وتم، "مەبەستت کێیە؟"

"لە قوتابخانە."

"نا، وا نییە." درۆشم دەکرد، ڕاست وا بوو.

ماچێکی ڕوومەتیم کرد و توندتر قۆڵیم گوشی، ئاخێکی کرد، دیار بوو ئازاری پێ گەیشت بە گوشینەکە.

وتم، "ببوورە، ئازارت نەگەیشت؟"

"نا، من باشم." خۆی کەمێک گورج کردەوە و ئەوجا گەڕایەوە سەر بابەتەکەی خۆمان. وتی، "شتێکت پێ بڵێم بۆم دەکەیت؟"

"هەرچییەک بێت."

"بەڵێنم دەدەیتێ ئیتر ڕاستییەکانم پێ بڵێیت؟ مەبەستم هەموو کاتێکە."

"بەدڵنیاییەوە."

لەپڕێکدا وەستا و تەماشای ناو چاوی کردم، وتی، "خۆ درۆم لەگەڵدا ناکەیت؟"

نەمدەزانی ئەم قسانە بەرەو کوێ دەچێت، وتم، "درۆت لەگەڵ ناکەم، بەڵێنیشت دەدەمێ، لە ئێستا بەدواوە، هەرچییەک بێت، ڕاستیت پێ دەڵێم."

کەچی کە وام گوت، ئەوجا زانیم لە دڵەوە هەستم بە پەشیمانی دەکرد لەو بەڵێنەم.

دەستمان بە ڕۆیشتن کردەوە. لەو ساتەدا کە بە شەقامەکەدا ڕێمان دەکرد، سەرنجم چووە سەر دەستەکانی، کە لە سەرمادا لە کەمەرمی ئالاندبوو، بینیم ژێر پەنجەی شین و مۆر هەڵگەڕابوو. نەمدەزانی لە چییەوە وای لێ هاتووە، چونکە ڕۆژی پێشووتر ساغوسەلیم، چ عەیبی نەبوو. سەرەتا وام بە خەیاڵدا هات، گوتم ڕەنگە بە هۆی منەوە بووبێت، بەڵام بیرم کردەوە هەر دەستم بەر ئەو شوێنەی نەکەوتبوو.

جارێکی دی لێی پرسیمەوە، "خەڵکی بە کەسێکی نامۆ لە من گەیشتوون، وا نییە؟"

هەواکە هێند سارد بوو، کە هەناسەم دەدا، دەیکرد بە تەم.

دواجار وەڵامیم دایەوە، "بەڵێ." بۆخۆشم بەو وەڵامە جەرگم کونکون دەبوو.

بە دەنگێکی پڕ لە پەژارەواری و خەمباریەوە وتی، "بۆچی

وا بیر دەکەنەوە؟"

کەمێک بیرم کردەوەو وتم، "هەرکەسە بە شێوازێک بیر دەکاتەوە." وەڵامێکی ناڕوونم دایەوە، تەقەلـلام دەدا چیی تر درێژەی نەدەمێ.

"بەڵام ئاخر بۆچی وا بیر دەکەنەوە؟ ئاخۆ بە هۆی باوکمەوە ئەوهاش لە من دەڕوانن؟ یان هەر لەبەر ئەوەی یارمەتیی خەڵک دەدەم؟"

نەمدەویست هیچ لەم بارەیەوە بڵێم.

"وای بۆ دەچم." ئەوەندەم گوت و هیچی تر. کەمێک شپرزەیی دای گرتم و دڵم بەیەکدا دەهات.

جەیمییش بە وەڵامەکانی من نائومێدی و خەم بەرۆکی گرتن. چەند هەنگاوێکی تریشمان بەبێدەنگی بڕی.

دواتر لێی پرسیم، "تۆش من بە کەسێکی نامۆ لەقەڵەم دەدەیت؟"

پرسیارەکەی نوقمی خەیاڵێکی بەئازاری کردم و خورپەیەکی جەرگبڕ بە دڵمدا هات. ئەو دەمە خەریک بوو دەگەیشتینە بەردەمی ماڵی ئەوان، توند لە ئامێزم گرت و ماچم کرد. کە بەرم دا، سەری شۆڕ کرد و چاوی بڕییە زەوییەکەی بەردەمی.

پەنجەم برد بۆ ژێر چەناگەی و سەریم بەرز کردەوە، تا تەماشام بکات، وتم، "جەیمی، تۆ کەسێکی بێوێنەیت، زۆر جوانیت. تۆ کچێکی دڵساف و خوێنشیرینیت. هەموو شتێکی تۆم بە دڵە. گەر خەڵکێکیش هەبن تۆیان خۆش نەوێت، یان بە نامۆت لەقەڵەم بدەن، ئەوە کێشەی خۆیانە و هیچ لای من گرنگ نییە."

لەنێو تەم و هەوای ساردی زستانی ئەو ڕۆژەدا، بینیم لێوەکانی کەمێک دەلەرزین، منیش بە هەمان دەستوور، هەستم کرد ترپەی دڵم خێراتر لێی دەدا. چاوم بڕییە چاوەکانی، هەموو هەست و سۆزی ناخم لە زەردەخەنەی سەر لێومدا کۆ کردەوە، چیی تر نەمدەتوانی دەروون و ناخم کۆت و زنجیر بکەم.

پێم وت، "جەیمی، خۆشم دەوێیت. تۆ بەنرخترین شتی لە ژیانمدا."

ئەوە یەکەمین جارم بوو لە ژیانمدا ئەو قسانە بە کەسێکی تر، جیا لە خێزانەکەی خۆم، بڵێم. پێشتریش هەرکاتێک بیرم لێ دەکردەوە، گەر ئەم شتانە بە کەسێک بڵێم، گەلێک سەخت دەهاتە بەر زەینم، بەڵام ئەوەتا، سەخت نەبوو. هیچکات هێندەی ئەو ساتەوەختەش لە قسەکانی خۆم دڵنیا نەبووم و بەو شێوەیە لە ناخمەوە نەهاتوونە دەر.

جەیمی سەری شۆڕ کرد و لێشاوی فرمێسک زایە نێو چاوەکانی، ئەمنیش ئامێزم پێدا کرد و توند بە گیانی خۆمەوە گوشیم. بەنەرمی دەستم بە قۆڵیدا دەهێنا و نەمدەزانی ئاخۆ ئەم گریانەی لەبەر چ بوو. بەدەنی هێند باریک و سووکەڵە بوو، بەئاسانی قۆڵم دەهاتەوە یەک. دیار بوو ئەم هەفتە و چەند ڕۆژەی ڕابردوو کێشی دابەزیبوو، لە کاتی نانخواردنەکانیشدا، کەمی دەخوارد. سەری نابوو بە سنگمەوە و بۆ تاوێک هەر وا دەگریا. لێ دڵنیا نەبووم ئاخۆ چی وا گریانی بۆ دێنێ، نەمدەزانی چۆنی ورد بکەمەوە. هیچ پەشیمان نەبووم لە قسەکانم. ڕاستی هەر ڕاستییە، بەڵێنیشم دابووێ، کە هەرگیز درۆی لەگەڵدا نەکەم.

بە قوڕگی گریان و هەنسکەوە وتی، "تکات لێ دەکەم وا مەڵێ، ئەو قسەیە مەکە. تکایە..."

وام دەزانی بڕوام پێ ناکات، وتم، "بەڵام من بەڕاستی خۆشم دەوێیت."

بگرە هێندەی تر دایە قوڵپی گریان. بە قوڕگی گریان و هەنسکەوە وتی، "بمبوورە. دەبێت بمبووری..."

کە ئەمەم لێ بیست، زارەتەرەک بووم، قوڕگم تەڕاییی تێدا نەما و زمانم لە گۆ کەوت. هەرچۆنێک بێت تەقەللام دا و وتم "بۆچی داوای لێبووردن دەکەیت؟" پەرۆش بووم تێبگەم ئاخۆ چ خێریەتی. "لەبەر قسەوقسەڵۆکی هاوڕێکانم وا دەکەیت؟ من چیی تر گوێ بە قسەی ئەوان نادەم، چیی تر." بێ ئەوەی ئاگام لە خۆم بێت، لە شپرزەیی و دڵەکوتەدا دەستم بە هەموو لایەکدا دەجووڵاند. بیروهۆشم تاسابوو.

بۆ ساتێکی تریش هەر وا لە گریان بەردەوام بوو، تا دواتر چاوەکانی سڕی و سەری هەڵبڕی. زاری هێنایە پێشێ و ماچێکی ئەسپاییی کردم، ئەوجا پەنجەکانی هێنا بە ڕوومەتمدا و بە چاوی سوورهەڵگەڕاو و ئاوساوەوە وتی، "لاندن، تۆ نابێت منت خۆش بوێت. دەبین بە هاوڕێ، یەکتریش دەبینین... بەڵام نابێت منت خۆش بوێت."

حەواسم نەدەجووڵا، تێنەدەگەیشتم چ قەوماوە. بە قوڕگی نووساوەوە وتم، "بۆ نابێت؟"

پاشان ئەویش بە دەنگێکی مردەڵۆکەوە وتی، "چونکە من نەخۆشم، لاندن."

وشەکانی هێند نامۆ و سەیر بوون، بە جۆرێک، بۆم هەزم نەدەکرا باسی چیی دەکرد.

وتم، "ئێ جا ئەمە کەی کێشەیە؟ چەند ڕۆژێک پشوو بدە و ئەوجا..."

زەردەخەنەیەکی پڕ لە خەم و پەژارە کەوتە سەر لێوی، ڕاست لێی تێگەیشتم دەیویست چم پێ بڵێت. چاوەکانی بڕییەوە چاوم و نەیدەتروکاندن. ئەوسا وتی، "من نەخۆشیم لەگەڵدایە، دەمرم. لاندن."

بەم هەواڵەی، ئێجگار زارەتەرەک بووم، ڕۆحم سڕ بوو.

## ١٢

نەخۆشیی شێرپەنجەی خوێنی لەگەڵدا بوو، بۆخۆیشی تا هاوینی ڕابردوو درکی پێ نەکردبوو.

ئەو ساتەوەختەی ئەم هەواڵە جەرگبڕەی پێ گوتم، بەرچاوم تاریک داهات و بیروهۆشم لای خۆم نەما، دونیا وەک فرفرۆکە لە پێشچاوم دەخولایەوە. دەتگوت ها لەو ساتەدا کات لەناکاو وەستا و درکم بە شتەکانی نێوانمان کرد. ئەوجا تێگەیشتم داخۆ بۆچی دەیویست من نمایشەکەی لەگەڵدا بکەم: تێگەیشتم ئەو شەوە، دوای ئەوەی لە نمایشەکە بووینەوە بۆیە هێگبێرت باوەشی پێدا کرد و بە چاوی پڕ لە فرمێسکەوە بە گوێیدا چرپاندی و پێی گوت، تۆ فریشتەی منیت، ئەمە بۆیە بەردەوام خەمی ئەم کچەی بوو و هیلاک و کەمحەوسەڵە دەر دەکەوت و هەرکاتێکیش سەردانیماڵیانم دەکرد، خەمبار و نائومێد دەهاتە پێشچاوم. ئیدی هەموو شتێکم وەک ئاوی کانی لا ڕوون بووەوە. لە هەمووی گەیشتم.

بۆیە دەیویست جەژنی کریسمس لە خانەی هەتیوان بکەین و بە شێوازێکی گەلێک تایبەت بەڕێوە بچێت...

بۆیە دەیگوت بڕوا ناکەم بچم بۆ کۆلێژ...

بۆیە کتێبەکەی لە دایکیەوە بۆی مابووەوە، پێشکەشی منی کرد...

لە هەموو ئەمانە گەیشتم، کەچی لە لایەکی تریشەوە نەمدەزانی بۆ.

جەیمی نەخۆشیی شێرپەنجەی خوێنی هەیە...

جەیمی، جەیمی خوێنشیرین و دڵساف دەمرێ...

جەیمییەکەم...

بە دەنگێکی کزو مردووەوە بە گوێیمدا چرپاند، "نا، نا، لەوە دەچێت بەهەڵە تێگەیشتبن..."

بەڵام هەڵەی چی و شتی چی، کە دووبارە دڵنیای کردمەوە، ئیدی تەواو زارەتەرەک بووم، بەری بیناییم تاریک داهات و هیچم نەدەبینی، خۆم بەپێوە بۆ ڕانەدەگیرا، خەریک بوو دەکەوتم، لێ توند ئەوم گرت، تا هاوسەنگیی خۆم ڕابگرم و لە پێ نەکەوم. لەسەر شەقامەکە ژن و پیاوێکم بینی، بەرەو لای ئێمە دەهاتن، لەتاو سەرما، سەری خۆیان کەمێک شۆڕ کردبوو و دەستیشیان بە کڵاوەکانیانەوە گرتبوو، تا ڕەشەباکە هەڵیان نەدا. لەولاشەوە سەگێکم بەرچاو کەوت، بە ڕاکردن بە شەقامەکەدا پەڕییەوە بۆ ئەوبەر و خۆی خزاندە نێو چەند دارودەوەنێکەوە. لەوبەریشەوە دراوسێیەکیان چووبووە سەر پەیژەیەک و خەریکی لێکردنەوەی ئەو گڵۆپ و میزەڵدان و کاغەزە ڕەنگاوڕەنگانە بوو، کە بۆ کریسمس هەڵی واسیبوون. لەم ساتەدا هەموو ئەم دیمەنە ئاساییانەی ژیانی ڕۆژانە، کە پێشتر پیاو حەواسی نەدەچووە سەریان، دەهرییان دەکردم. چاوەکانم داخست، تەقەڵلام دەدا ئەم

شتانە لە بەرچاوم نەمێنن و بیروهۆشم بێنمەوە سەر خۆ.

لێ بۆخۆشم دەمزانی تازە بیروهۆشم بچڕا و تاریکی بەری بینایی گرتووم. جارێکی دی بە پەشۆکاوییەوە پەلامارم دا و لە باوەشم گرت، لێشاوی فرمێسک زایە چاوەکانی منیش، خۆم پێ نەدەگیرا.

بۆ چەند ساتێک لەسەر شەقامەکە هەردووکمان پێکەوە دەستلەملان دەگریان، تەنیا چەند هەنگاوێکی کەمیشمان مابوو بۆ بەردەمی ماڵی ئەوان. بەدەم گریان و هەنسکەوە، بەرێ کەوتینەوە و لە دەرگامان دا. هێگبێرت دەرگای لێ کردینەوە و تەماشای ڕوخساری سوورهەڵگەڕاوی کردین، ئەوجا ڕاست بۆی دەر کەوت ئیدی نهێنییەکەیان ئاشکرا بووە. ئەو دوانیوەڕۆیەش درەنگانێک کە چووین بۆ ماڵی خۆمان، حاڵومەسەلەشمان لە دایکم گەیاند، ئیدی لەگەڵ ئەویشدا چینێکی تر گریاین. دایکم سەری نایە بە سنگی خۆیەوە و ئەویش دایە قوڵپی گریان، بە جۆرێک، هێلینی ئاشپەز و خزمەتکارەکە خەریک بوو تەلەفۆن بۆ دکتۆر بکەن، وایان دەزانی بەڵایەک بەسەر باوکم هاتووە. ڕۆژی یەکشەممەش هێگبێرت چووە کڵێسا و ڕوونکردنەوەیەکی لەبارەی ئەو نهێنییە پێشکەش کرد، کە تاکوو ئەو وەختە پاراستبوویان. خەم و کەسەرێکی بەئازاری نیشتبووە سەر ڕوخسار، ئەویش قاچی بە خۆوە نەدەگرت، پێش ئەوەی وتارەکەیشی تەواو بکات، توانای لێ بڕا و دەبوو دەستی بگرن و بیبەنەوە سەر کورسییەکەی دای بنیشێنن.

هەموو ئەوانەی لەوێدا ئامادە بوون، واقیان وڕ مابوو، بڕوایان بە گوێی خۆیان نەدەکرد، هەر وا بە سەرسامییەوە

چاوەڕوان بوون، بەڵکوو ئەمە ڕاست نەبێت و هێگبێرت بە شۆخییەوە وا بڵێت. بەڵام دواتر کە بۆیان ڕوون بووەوە، ئەوانیش گریان بۆی و فرمێسکی نائومێدی بە ڕوخسارياندا چۆڕاوگەی بەست.

ئیدی ئەو ڕۆژەی جەیمی ڕاستییەکەی لا درکاندم، لەگەڵ باوکی دانیشتبووین، جەیمی بە ئارامییەوە وەڵامی پرسیارەکانمی دەدایەوە. پێی گوتم نەخۆشییەکەی درێژخایەنە و نازانێت چەندی لە ژیاندا ماوە. دکتۆرەکان هیچیان پێ نەدەکرا، پێیان گوتبوو نەخۆشییەکە جۆرێکی دەگمەنە و چارەسەری هێشتا نەدۆزراوەتەوە. ئەو ساڵە، لە سەرەتای کردنەوەی قوتابخانەدا، حاڵی باش بوو، بەڵام لەو چەند هەفتەیەی ڕابردوودا، زیاتر هەستی بە کاریگەرییەکانی نەخۆشییەکەی دەکرد.

جەیمی وتی، "نەخۆشیەکەم وردەوردە پەرە دەسێنێت. سەرەتا هەستی پێ ناکەیت، دواتر هەست دەکەیت ئازای گیانت بێهێز و کەمحەوسەڵە دەبێت، ئەوجا لێت دەدا."

فرمێسک لە چاوەکانمدا قەتیس مابوون، زۆرم لە خۆ دەکرد، لێشاوی گریانم بۆ نەیات. بەردەوام نمایشی شانۆگەرییەکەم دەهاتەوە یاد. وتم، "باشە ئەی بۆچی لە کاتی ئەو هەموو ڕاهێنانەدا... ئەو هەموو ڕۆژەی پێکەوە بووین... کەواتە نەدەبوو..."

دەستی هێنا بۆ دەستم و قسەکانی پێ بڕیم. وتی، "ڕاست دەکەیت. بەڵام ڕاستییەکەی، هەر ئەو شانۆگەرییە بوو هێز و توانای پێ دەبەخشیم و دەیهێشتمەوە."

دواتر بۆی باس کردم، کە لەو کاتەوەی نەخۆشییەکەی

لێ دیاری داوە، حەوت مانگی بەسەردا تێپەڕ بووە.
دکتۆرەکانیش تەنیا ساڵێکیان بۆ دانابوو، ڕەنگە کەمتریش.
گەر لەم سەردەمەی ئێستادا بووایە کە ئەم باسەتان بۆ دەگێڕمەوە، ڕەنگ بوو شتەکان جیاواز بوونایە. لەم سەردەی ئێستادا، ئەو نەخۆشییە چارەسەری هەیە و دەتوانرا جەیمی ڕزگار بکرێت. لەوانە بوو ئێستا لە ژیاندا بمایە. بەڵام ئەوەی من بۆتان دەگێڕمەوە، چل ساڵ بەر لە ئێستایە.
تەنیا پەرجوو ڕزگاری دەکات.
"ئەی بۆچی لە سەرەتاوە پێت نەدەگوتم؟"
ئەمە ئەو پرسیارە بوو، کە لێم نەکرد، تەنیا بیرم لێ دەکردەوە و هیچی تر. ئەو شەوە خەو نەدەچووە چاوم، بەری بینابیم تاریک و پێڵووەکانی چاوم پەنما بوون. خۆزگەم دەخواست و دەپاڕامەوە، خوایە ئەمە خەونێک بێت دوور لە ڕاستی.
بۆ ڕۆژی دوایی چووم بۆ ماڵیان، لە ژووری میوانەکەیان دانیشتبووین، باسی ئەو ڕۆژە دەکەم، کە گوتم هێگبێرت چوو بۆ کڵێسا و نهێنییەکەیانی بۆ هەمووان ئاشکرا کرد. ڕۆژی یەکشەممە، ١٠ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٥٩ بوو.
جەیمی بەو شێوەیە شپرزە و بێتاقەت نەبوو وەک چاوەڕوانم لێ دەکرد. جا فەقیرە چی بکات؟ ئەوە ماوەی حەوت مانگ بوو لەگەڵ ئەم نەخۆشییەیدا ڕاهاتبوو. تەنیا خۆی و باوکیشی ئەمەیان دەزانی، بگرە بە منیشیان نەگوتبوو. دیار بوو هیچیان متمانەیان بە منیش نەکردبوو، بۆیە نەیاندرکاندبوو لام. کە بیرم لەم شتانە دەکردەوە، دڵی دەپروانـدم.
جەیمی وتی، "من لای خۆمەوە بڕیارم دابوو، وا باشترە

بە کەسی تر نەڵێم، بە باوکیشم گوتبوو، کە ئەویش لای کەس نەیدرکێنێ. چونکە بۆخۆت بینیت ئەمڕۆ خەڵکی چەندیان پێ ناخۆش بوو لە کڵێسا. تۆ بۆخۆت بیهێنە پێشچاوی خۆت، گەر چەند مانگێکی کەمت مابێت لە ژیاندا و کەسانی دەوروپشتیشت بێئومێد ببن لێت و بەتەمات نەبن، دەبێت چ هەستێکی جەرگبڕ بێت."

دەمزانی ڕاستی دەکرد، بەڵام هێند ئاسان نەبوو دڵی مرۆڤ بەرگەی بگرێت. یەکەمین جارم بوو لە ژیانمدا هەست بە ئازارێکی قووڵ بکەم لە ڕۆحمدا و کەوتبمە نێو قووڵاییەکی بێبنەوە و کەسێک نەبێت دەستم بگرێ و ڕزگارم بکات.

پێشتر، تا ئەوکاتە، هیچ کەسێکی نزیکم نەمردبوو، بەبیرم نایەت خزمێک یان ئازیزێکم مردبێت. نەنکم وەختێ کۆچی دوایی کردبوو، کە من تەمەنم سێ ساڵان بوو. ئێ هیچ شتێکی ئەوم نەدەهاتەوە یاد، بگرە مەراسیمی پرسە و ساڵانی دوای مردنەکەیشیم لە یادەوریدا نەمابوو. جاروبار باوکم یان باپیرم سەرگوزەشتەی نەنکمیان بۆ دەگێڕامەوە، بەڵام جگە لە چیرۆکێک، هیچی تر نەبوون. وەک ئەوە بوو چیرۆکی ژنێکی کۆچکردوو لە ڕۆژنامەیەکدا بخوێنمەوە، کە هەرگیز نەمبینیبێ و نەمناسیبێ. گەرچی باوکم کە دەچووە سەر گڵکۆی نەنکم و گوڵی بۆ دادەنا، منیشی لەگەڵ خۆی دەبرد، بەڵام هیچ هەستێکم بۆی نەدەجووڵا. تەنیا هەستم بۆ ئەو کەسانە دەجووڵا، کە لەپاش خۆی جێی هێشتبوون.

هیچ کەسێک، نە لە خێزانی ئێمە و نە هیچکام لە هاوڕێکانم، شتی وایان بەسەردا نەهاتبوو. جەیمی تەمەنی تەنیا حەڤدە ساڵان بوو، تاوی لاوێتیی بوو، لە یەک کاتدا

ڕۆحی لە ژیان و لە مردنیشدا گوزەری دەکرد. من گەلێک دەترسام، تەنیا لەبەر ئەو نا، بەڵکوو بۆ خۆیشم. دەترسام شتێکی هەڵە بکەم و هەستی برینداربێت. دەکرا لە بەردەمی ئەودا دەهری ببم و ئەویش خەفەت بخوا؟ دەکرا چیی تر باسی ڕۆژانی داهاتوو بکەم؟ هەرچەند جەیمی گەلێک ئارام و لەسەرخۆ بوو لەگەڵمدا، لێ ترس و نیگەرانی، قسەکردنیشی لا ئاستەنگ کردبووم.

ترس و نیگەرانییەکانم ڕاستییەکی تریان لا ئاشکرا کردم، ڕاستییەک، کە هێندی تر شتەکانی خراپتر دەکرد. درکم کرد ماوەی ئەم چەند مانگە، کە تەندروستیی جێگیر بوو، من بێئاگا بووم لە هەموو شتێک و جەیمیم بەتەواوی نەناسیوە. تەنیا چەند مانگێکی کەم بوو لە یەکدی نزیک ببووینەوە و لەو ماوە کەمەشدا، کە نزیکەی هەشتا ڕۆژ دەبوو خۆشم ویستبوو. ئەو هەشتا ڕۆژە هەموو ژیانی من بوو، کەچی ئێستا کە تەماشای دەکەم، دەڵێم ئاخۆ ئەو ژیانە هەشتا ڕۆژییەی منیش چەندی بە بەرەوە ماوە.

بۆ ڕۆژی دوایی لە خوێندنگە نەمبینی، لە بیری خۆمدا گوتم، ئیدی ڕەنگە جارێکی تر بەنێو ئەم ژوور و هۆڵانەدا هاتوچۆ نەکاتەوە. ئیدی نابینم کتێبەکەی بە دەستەوە بێت و لە پشووەکاندا بچێتە قوژبنێکەوە و دەست بکات بە خوێندنەوەی. ئیدی بە بلووزە خوورییە قاوەیییەکە و قژە تەماتەیییەکەیەوە، نایبینمەوە بەنێو خوێندکارەکاندا بێت و بچێت. تەواو، ئەو خوێندنگەی تەواو کرد، هەرگیز بڕوانامە نابینێت.

ئەو ڕۆژە لە پۆلدا ماتومەلوول دانیشتبووم و حەواسم لای خۆم نەبوو، مامۆستا لەدوای مامۆستا دەهات و هەمان

ئەو قسانەیان بۆ دەکردین، کە پێشتر زۆربەمان بیستبوومان. وەڵامەکانیش هەمان ئەو وەڵامانە بوون، کە ڕۆژی پێشووتر لە کڵێسا دەمانبیست. کچەکان دەستیان کرد بە گریان، کوڕەکان سەریان داخست، بە جۆرێک باسیان دەکرد، وەک ئەوەی مردبێت. سەریان لێ هاتبووەوە یەک و دەیانگوت، "ئێستا چی بکەین؟" هەمووشیان ڕوویان لە من دەکرد وەڵامیان بدەمەوە.

تەنیا دەمگوت، "نازانم" و هیچی تر.

ئەو ڕۆژە، زوو خوێندنگەم جێ هێشت و بەرەو ماڵی جەیمی بەڕێ کەوتم. هەر وەک جاران، بە ڕوویەکی خۆشەوە دەرگای لێ کردمەوە، وەک ئەوەی نە بای دیبێ و نە باران.

"لاندن، چۆنی؟ ئەوە چۆنە هاتیت؟"

سەری هێنایە پێشێ تا ماچم بکات، ئەمنیش توند پەلامارم دا و لێوم نا بە لێویەوە، هەرچەند قوڕگیشم پڕ ببوو لە گریان.

وتی، "باوکم لە ماڵ نییە، گەر حەز بکەیت، دەچینە سەر ئەو کورسییانەی ژێر دالانەکە دادەنیشین."

لێم پرسی، "چۆن ئەمەت پێ دەکرێ؟ چۆن دەتوانی خۆت وا نیشان بدەیت وەک ئەوەی هیچ نەبووبێت؟"

"من خۆم وا نیشان نادەم وەک ئەوەی هیچ نەبووبێت. جارێ با بچم چاکەتەکەم بێنم، ئەوسا لە دەرەوە دادەنیشین قسە دەکەین، باشە؟"

زەردەخەنەیەکی بۆ کردم و چاوەڕوان بوو بڵێم باش. منیش سەرێکم بۆ لەقاند. دەستێکی دا بە شانمدا و وتی، "هەر ئێستا دێمەوە."

چوومە لای کورسییەکانی ژێر داڵانەکە و لەسەر یەکێیان دانیشتم، ئەویش کەمێکی پێ چوو، پاشان بە چاکەت و دەستکێش و کڵاوەوە هاتەوە. ئەو سەرماوسۆڵەیەی چەند ڕۆژی ڕابردوو هەڵی کردبوو، ئەمڕۆ کەمێک ئارام ببووەوە، بەڵام بۆ ئەو، هەر سارد بوو.

هات و دانیشت. وتم، "ئەمڕۆ نەهاتبوویت بۆ خوێندنگە."

سەری کەمێک داخست و وتی، "دەزانم."

"خۆ ئێجگاری واز ناهێنیت، دێیتەوە، وا نییە؟" ئەوی ڕاستی بێ، خۆیشم وەڵامەکەیم دەزانی، بەڵام حەزم دەکرد لە زاری خۆیەوە گوێم لێی بێ.

بە غەمگینییەوە وتی، "نا، ناگەڕێمەوە بۆ خوێندنگە."

"ئاخر بۆچی؟ خۆ ئەوەتا ئێستا تەندروستیت باشە."

لێشاوی فرمێسک زایە نێو چاوەکانمەوە، دەستی هێنا و توند دەستمی گوشی.

"ڕاستییەکەی، ئەمڕۆ گەلێک باشم. تەنیا ئەوەیە، دەمەوێت ئیتر بەیانییان لە ماڵەوە بم پێش ئەوەی باوکم بچێت بۆ کڵێسا. دەمەوێ ئیتر زۆرترین کاتی لەگەڵ بەسەر ببەم."

پێش ئەوەی بمرم! دیار بوو مەبەستی ئەم وشەیە بوو، بەڵام نەیگوت. دڵم تێک دەهات و زمانم لە گۆ کەوتبوو.

ئەو درێژەی دایە و وتی "سەرەتا کە دکتۆرەکان هەواڵەکەیان داینێ، گوتیان دەبێت نائومێد نەبیت و تا دەتوانیت ژیانی ئاسایی خۆت بەڕێ بکە و بیر لە هیچ مەکەرەوە، چونکە زیاتر زیندوو ڕات دەگرێت و وزە و توانات پێ دەبەخشێ."

بە قورگی وشکەوە وتم، "ئەم ژیانەی تۆ هیچ ئاسایی

نییە ئێستا."

"دەزانم."

"ناترسیت؟"

چاوەڕوان بووم بڵێت، "نا" و قسەیەکی کامڵ و تێگەیشتووانە بکات، یاخود بڵێت "ئیتر قەدەری خوایە و کەس نازانێت چیمان بەسەر دێت."

لێ، ڕووی وەر چەرخاند و وتی، "بەڵێ، هەموو کات دەترسم."

"ئەی کەواتە بۆچی ئاوها خۆت دەر دەخەیت و بەسەر خۆتی ناهێنیت؟"

"کە بەتەنها دەبم، زیاتر پێمەوە دیارە."

"لەبەر ئەوەی متمانەت بە من نییە؟"

"نا، مەسەلەکە ئەوە نییە، بەڵکوو دەزانم تۆش دەترسیت، بۆیە."

دەستم کرد بە نزا و پاڕانەوە، بەڵکوو خوایە پەرجوویەک بێت و ڕۆحمی پێ بکات و چاکی بکاتەوە.

وەک باسی دەکەن و بۆخۆیشم لە ڕۆژنامەکاندا بەرچاوم کەوتووە، دەڵێن پەرجوو هەموو کات ڕوو دەدات. ڕۆژانە لێرە و لەوێ دەبیستی، خەڵکێک دەستێک یان قاچێکیان شکاوە و پێیان دەگوترێت ئیتر تەواو، چاک نابیتەوە، کەچی دواتر خوای گەورە ڕۆحمیان پێ دەکات و چاکیش دەبنەوە، یان هەبووە تووشی بەڵایەک بووە و هیچ هیوایەکی نەماوە، کەچی دواتر چارەسەری بۆ دەکرێت و هیوای بۆ دەگەڕێتەوە. جاروبار لەم شارۆچکەیەی خۆشماندا، شێخێک هەبوو لە شوێنێکدا خێوەتی گەڕۆکی دادەنا و نەخۆشیی

چاک دەکردەوە و خەڵکیش دەچوونە تەماشای. من بۆخۆم دوو کەڕەتان چووبووم، گەرچی لە خەیاڵی مندا وام دەبینی لە نماییشێکی سیحربازانە چیی تر نییە، چونکە ئەو خەڵکەی چاک دەبوونەوە، هیچیانم نەدەناسی، کەچی جارجارەش هەندێک شتی دەکرد، سەرم دەسووڕما پێی. پیاوێکی پیر هەبوو لە شارۆچکەکەماندا، ناوی سوینی بوو، کاری نانەواییی دەکرد. ئەم کابرایە، وەک دەگێڕنەوە، لە زەمانی جەنگی جیهانیی دووەمدا لە یەکەی تۆپخانە سەرباز بووە، لەپشت سەنگەرەکانەوە تا چەند مانێگک تۆپی بەرەو دوژمن هاویشتووە و کاریگەریی دەنگی تۆپەکانیش گوێیەکیانی کەڕ کردووە. بۆیە گوێی گران ببوو، ئێمەیش کە ئەو کاتە منداڵ بووین، بەدزییەوە دەچووین نانمان لێ دەبرد، بێ ئەوەی ئاگای لێ بێت. جا ڕۆژێکیان ئەم شێخەی باسم کرد، هات و خێوەتێکی دانا، مامە پیرەی خۆشمان چووە سەردانی، بەڵکوو ئێ خوا دەرووی خێری لێ بکاتەوە و هەستی بیستنی بۆ بگەڕێتەوە. کابرای شێخ سەرەتا بە نزا و پاڕانەوەی شێخانە دەستی پێ کرد و ئەوجا دەستی نایە سەر گوێی مامە پیرە. هێندی پێ نەچوو، مامە پیرە هاوارێکی لێ بەرزبووەوە و ئێمە هەموو لە شوێنی خۆمان زارەتەرەک بووین، هەرکەسە لەسەر کورسییەکەی خۆی ڕاچڵەکی. ڕەنگی بە جۆرێک تێک چوو، وەک ئەوەی شیشی سوورەوەبوویان ئاخنیبێتە گوێی، بەڵام کەمێک سەری ڕاوەشاند و سەرنجی دایە دەوروپشتی خۆی و گوتی، "ئێستا گوێم لە شتە، دەبیستم." بگرە بۆخۆیشی بڕوای نەدەکرد. کابرای شێخ وتی، "خودای مەزن توانای هەموو شتێکی هەیە. نزا و پاڕانەوەکانمان

قبـوڵ دەکات."

ئیـدی ئـەو شـەوە چـووم کتێبـی ئینجیلەکـەی جەیمـی، کـە بەدیـاری پێـی دابـووم، هێنـام و دەسـتم کـرد بـە خوێندنـەوەی. پێشـتر کـە ڕۆژانـی یەکشـەممە دەچوویـن بـۆ کڵێسـا دەمانخوێنـدەوە، بـەڵام ئـەوی ڕاسـتی بێـت، تەنیـا ڕووداوە سـەیرەکانم لەبیـر مابـوو – کـە خـودای گـەورە حـەوت بـەڵای نـاکام دەنێرێـت، تـا ئیسـرائیلییەکان بتوانـن میسـر جـێ بێڵـن، یان کە حەزرەتی یونس دەکەوێتە نێو دەریاکە و نەهەنگێکی گـەورە قووتـی دەدا و سـێ شـەو و سـێ ڕۆژ لـە نـاو سکیدا دەمێنێتـەوە، یاخود ئـەو بەشـەی باسـی حەرزەتی عیسـا دەکات، کـە بـە پـێ بەسـەر ئاوەکـەدا دەڕوات و قەشـەیەکی مـردوو لـەدوای چـوار ڕۆژ زینـدوو دەکاتـەوە. لەبـەر ئـەوە چەندیـن ڕووداوی سـەمەرەی تریشـی تێدایـە و دەشـمزانی هەمـوو بەشـەکانی کتێبەکـە باسـی پەرجووەکانـی خـودای گـەورە دەکات، بـەڵام هەموویانـم لەبیـر نەمابـوو. ئێمـەی مەسـیح لـە ژیانمانـدا گەلێک پشـت بـە وانـە فێـرکاری و ئامۆژگارییەکانـی کتێبـی ئینجیـل دەبەسـتین.

شـەوی یەکـەم دەسـتم کـرد بـە خوێندنـەوەی ئـەو بەشـەی باسـی سـەرەتای دروسـتبوونی جیهـان دەکات، هەروەهـا چۆن خودای گـەورە ئادەم و حەوا دەنێرێتـە سـەر زەوی و دواتریش حەزرەتی ئیبراهیم دەکاتە پەیامبەری خۆی بۆ ڕێنوێنیکردنی مرۆڤایەتـی. شـەوی دواتـر چوومـە سـەر بەشـی دووەمـی کتێبەکە، کە باس لە کۆچی بەکۆمەڵی ئیسـرائیلییەکان دەکات بە سـەرکردایەتیی حەزرەتـی موسـا لـە میسـرەوە بەرەو شـاخی سینا. سێیەم شـەو چوومـە سـەر بەشـێکی تـر، ئەویش کە باس

لە نەوەکانی حەزرەتی یەعقوب و هۆزەکانی بەنی ئیسرائیل دەکات. ئەوجا بۆ شەوی دواییش ئەو بەشەم خوێندەوە، کە باسی حەزرەتی موسا دەکات، کە چۆن پێش ئەوەی ئەهلەکەی بگەنە شاخی سینا، پەیامەکانی خوای گەورەیان بۆ ڕوون دەکاتەوە. لە هەندێک بەشی کتێبەکەدا خاو دەڕۆیشتم، بەتایبەت لەو بەشانەی ڕێنمایی و ئامۆژگارییەکانی تێدا ڕوون دەکرێتەوە. لێ، هێشتا نەمدەتوانی واز لە کتێبەکە بێنم. هێزێکی نادیار لە ناخمەوە هانی دەدام بەردەوام ببم لە خوێندنەوەی. تێنەدەگەیشتم چ بوو.

شەوێکیان درەنگ، شەکەت و ماندبوو ببووم لە خوێندنەوە، دواجار گەیشتمە سەر بەشی نزا و پاڕانەوەکان، بۆخۆیشم ئەوەم دەویست کە بۆی دەگەڕام. ڕۆیشتم ڕۆیشتم، تا دواجار چوومە سەر چەند دێڕێک، کە خەتیان بەژێردا هاتبوو، وای بۆ چووم ئەمە ڕەنگە جەیمی خەتی بەژێردا هێنابن، دیارە لای ئەو شتێکی گرنگی تێدایە. ئەمەش خەتبەژێرداهاتووەکان بوو:

هاوار بۆ تۆ ئەی خوای گەورە، ئەی پشتوپەنام!

پشتم تێ مەکە، تا منیش بە دەردی ئەوانی تر، نەچم بە ناخی زەویدا!

نزاکانم لێ وەر بگرە، هاوارم بۆ تۆیە تا یارمەتیم بدەیت.

دەستی پاڕانەوەم بۆ پیرۆزی و عەرشی موبارەکی تۆ بەرز دەکەمەوە.

ئەی خوای عالەم، ڕەحم و بەزەییی خۆت بەسەرمدا ببارێنە.

بە چاوی فرمێسکاوی و سوورهەڵگەڕاوەوە کتێبی

ئینجیلەکـەم داخسـت، توانـام نەمابـوو هەمـوو نـزاکان تـەواو بکـەم.

پێدەچێت جەیمی ئەم نزانەی بۆ من دیاری کردبن.

بـە دەنگێکـی کـز و غەمگینـەوە ڕووم کـردە دایکـم و وتـم، "نازانـم چـی بکـەم." نیـگام گواسـتەوە سـەر ڕووناکیـی کـزی گڵۆپـی سـەر مێزەکـەی تەنیشـت جێخەوەکـەم. دایکیشـم لەتەکمـەوە دانیشـتبوو. ئـەو دەمـە کۆتاییـی مانگـی کانوونـی دووەم بـوو، سـەختترین و پڕئازارتریـن مانـگ لـە ژیانـی منـدا، دەشـمزانی مانگـی شـوبات گەلێـک خراپتـر دەبێـت بـۆ مـن.

دایکیشـم وتـی، "تێدەگـەم لێـت، کوڕم. بـەڵام دەسـەڵات نییـە، چیمـان پـێ دەکرێت؟"

"مەبەسـتم تەنیـا نەخۆشـییەکەی جەیمـی نییـە، دەزانـم دەسـەڵات نییـە و هیچمـان پـێ ناکـرێ. بەڵکـوو مەبەسـتم هەردووکمانـە، مـن و جەیمـی."

دایکم بە نیگایەکی پڕبەزەیی لێی دەڕوانیم. ئەویش خەمی جەیمیی بوو، بەڵام لە هەمان کاتدا خەمی منیشی بوو.

بـەردەوام بـووم، وتـم، "بـۆ مـن گەلێـک سـەختە قسـەی لەگەڵـدا بکـەم. کـە تەماشـای دەکـەم، تەنیـا بیـر لـەو ڕۆژانـە دەکەمـەوە کـە لەگەڵمـدا نابێـت و نایبینمـەوە. ئیـدی ئـەو کاتـە گـەر بشـچمە خوێندنگـە، هەمـوو بیروهۆشـم هـەر لای ئـەو دەبێـت و خۆزگـە دەخـوازم لەتەکمـەوە بێـت. کاتێکیـش دەچـم بـۆماڵیـان، نازانـم چیـی پـێ بڵێـم."

دایکـم وتـی، "بـڕوا ناکـەم تـازە هیچـت پـێ بکـرێ و بتوانـی کارێـک بکەیـت چـاک ببێتـەوە."

"ئەی باشە من چی بکەم؟"

بە نیگایەکی پڕ لە خەم و پەژارەوە تەماشای کردم و دەستی کردە ملم. وتی، "تۆ بەڕاستی خۆشت دەوێت، وا نییە؟"

"بە دڵ و بە گیان."

هەرگیز پێشتر دایکم بەو شێوەیە نەبینیبوو، ئاوها خەم و پەژارە دای گرتبێت. لێی پرسیم، "دڵت چیت پێ دەڵێت بیکەیت؟"

"نازانم."

ئەوسا بە دەنگێکی ئارام و لەسەرخۆ وتی، "کەواتە دەبێت زیاتر گوێ بۆ دڵت ڕادێری، تا بزانی چیت پێ دەڵێت."

بۆ ڕۆژی دوایی، کەمێک حاڵم باشتر بوو لەگەڵ جەیمی، بەڵام زۆریش نا. پێش ئەوەی بگەمەماڵیان، لە ڕێگە پەیمانم بە خۆم دا، نابێت هیچ کارێکی وا بکەم یان شتێک بڵێم، هەستی بریندار بکەم. بەڵکوو وەک چۆن جاران قسەمان دەکرد، ئەمڕۆش ئەوها بکەم. هەر واشم کرد. لەسەر قەنەفەکەیان دانیشتبووین، باسوخواسی هەندێک لە هاوڕێیان و حاڵ و ئەحواڵیانم پێ گوت، چی دەکەن و چی ناکەن. پاشان مەسەلەی یاریی باسکە و سەرکەوتنەکانی تیمەکەی خۆمانم هێنایە پێشێ. ئەوجا ئەوەشم پێ گوت، کە هێشتا زانکۆی کارۆلینای باکوور وەڵامی فۆڕمەکەیان نەداوەمەتەوە، بەڵام بێهیوا نیم، بەڵکوو لەم چەند هەفتەی داهاتوودا وەڵامم بدەنەوە. پێم گوت حەز دەکەم زوو خوێندنگە تەواو بکەم و بچمە زانکۆ. وا قسەم دەکرد، وەک ئەوەی ئەویش هەفتەی داهاتوو بگەڕێتەوە بۆ خوێندنگە، بۆخۆیشم هەستم کرد لە قسەکانمدا شپرزەیی و تێکچوونم پێوە دیار بوو.

جەیمی جاروبار لەنێوان قسەکانمدا بزەیەک یان سەرێکی دەلەقاند، ناوبەناویش کورتەپرسیارێکی تێ دەهاویشت. بەڵام ئەو کاتەی لە قسان بوومەوە، وا بزانم هەردووکمان ئەو ڕاستییەمان لا ئاشکرا بوو، کە ئەمە دوایین جارە بەو شێوەیە قسەی بۆ بکەم. هیوای بە هیچمان نەدەبەخشی.

دڵیشم هەر وای پێ دەگوتم.

جارێکی دی چوومەوە سەر ئینجیلەکە. بەڵکوو ئێ، شتێکی تێدا بێ و خوا دەروویەکی خێرم لێ بکاتەوە.

دوای چەند ڕۆژێکی تر، چوومەوە بۆ لای جەمی. لێم پرسی، "ئێستا تەندروستیت چۆنە؟"

کێشی گەلێک دابەزیبوو. پێستی خەریک بوو پەڵەپەڵەی بۆری قاوەییباوی لەسەر دەر دەکەوت، هێند لاواز ببوو، ئێسکەکانی بەدیار دەکەوتن. ئەم جارەیش چەند پەڵەیەکی شین و مۆرم لەسەر پێستی بەدی کرد. ئەو ساتە لە ژووری میوانەکەیان دانیشتبووین، دونیا سارد بوو، هەوایەکی ساردیش دەیدا لە بەدەنی.

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، هێشتا جوانی و شۆخوشەنگییەکەی نەمردبوو.

بە زەردەخەنەیەکی پڕ هیوا و بڕوابەخۆبوونەوە وتی، "من باشم. دکتۆر هەندێک دەرمانی ئازارشکێنیان پێ داوم، بەو دەرمانانە کەمێک باشترم."

هەموو ڕۆژێک دەچووم بۆ لای بۆ ماڵەوە. کات سەری لێ تێک دابووم، جارێک خێرا و جارێکیش خاو لێم دەڕۆیشت.

"هیچت بۆ بێنم؟"

"نا، سوپاس، من باشم."

چاوێکم بە ژوورەکەدا گێڕا، پاشان سەرنجم گواستەوە سەری. وتم، "چەند ڕۆژێکە ئینجیلەکە دەخوێنمەوە."

ڕووی گەشایەوە، "بەڕاستت؟" گەشکەیەکی ورشەدار نیشتە سەر لێوی، ئەو وەختەی وەبیر هێنامەوە، کە لە شانۆگەرییەکەدا ڕۆڵی فریشتەی لەگەڵمدا دەگێڕا. بڕوام نەدەکرد بەوەی تەنیا شەش هەفتە بەسەر نمایشەکەدا تێپەڕیبوو.

"تەنیا حەزم کرد بزانیت خەریکی خوێندنەوەیم."

"پێم خۆش بوو پێت گوتم."

"دوێنێ شەو ئەو بەشەم خوێندەوە، کە باسی حەزرەتی ئەیوب دەکات، کاتێک خودای گەورە بەندی دەکات، تا سەبر و ئارامی و بڕوای تاقی بکاتەوە."

زەردەخەنەیەکی کرد، دەستە نەرمەکانی هێنا و خستیە سەر دەستم. هەستێکی خۆشی پێ دەبەخشیم. وتی، "پێویستە شتێکی تر بخوێنیتەوە."

لێم پرسی، "بۆچی خوای گەورە وای بەسەر حەزرەتی ئەیوب دەهێنا؟"

"نازانم."

"تۆش قەت هەستت کردووە وەک حەزرەتی ئەیوب بەسەبر و ئارام بیت؟"

زەردەخەنەیەک کەوتە سەر ڕووی و وتی، "هەندێک جار."

"هەرگیزیش نائومێد نابیت و بیروباوەڕی خۆت لەدەست نادەیت؟"

"هەرگیز." خۆشم وەڵامی پرسیارەکەی خۆم دەزانی، بەڵام وا بزانم بۆخۆم نائومێد ببووم و خەریک بوو بڕوام

بە هیچ نەدەما.

لێم پرسی، "لەبەر ئەوەیە هیوات بە چاکبوونەوەی خۆت هەیە؟"

وتی، "نا، لەبەر ئەوە نییە، بەڵکوو ئەم بیروباوەڕەم لە ناخمدایە و تەنیا شتە بۆم مابێتەوە."

پاشان پێکەوە کە لەسەر قەنەفەکە دانیشتبووین، دەستمان کرد بە خوێندنەوەی ئینجیلەکە. وا بزانم شتێکی خراپ نەبوو لەو کاتەدا کردمان، بەڵام دڵم پێی دەگوتم ڕەنگە شتێکی تر و ڕێگەیەکی تر هەبێت بیگرینە بەر باشترە.

ئەو شەوە خەو نەدەچووە چاوم، هەر بیرم لەوە دەکردەوە.

خوێندنەوەی کتێبەکە بیر و حەواسی هەردووکمانی بەلای خۆیدا ڕاکێشابوو، هێندی پێ نەچوو، شتەکانی نێوانمانی بەرەو باشتر برد، وێدەچێ لەبەر ئەوە بووبێت، کە من بۆخۆم هەرگیز دڵم نەهاتبوو هەستی بریندار بکەم یان زویری بکەم. چ شتێکی تر باشترە لە خوێندنەوەی ئینجیلەکە؟ هەرچەند من بە وێنەی جەیمی وەڵامی ئەو پرسیارەم لا ڕوون نەبوو، بەڵام ئەو پێی خۆش بوو کە بەو جۆرە بیر دەکەمەوە، جاروباریش کە دەمانخوێندەوە، دەنگم پڕ بە ژوورەکە هەڵدەبری، ئەویش دەستەکانی لەسەر ئەژنۆم دادەنا و گوێی لێ دەگرتم.

کاتەکانی تریش لەتەکیەوە لەسەر قەنەفەکەی ژوورەکەیان دادەنیشتم و چاوم دەخستە سەر کتێبەکە و ناوبەناویش بە تیلەی چاوێکم تەماشای ئەوم دەکرد. کە دەگەیشتینە بەشی نزا و پاڕانەوەکان، یان پەند و ئامۆژگارییەک، لێم دەپرسی

ئاخۆ ئەو لە زەینی خۆیدا چۆنی ورد دەکاتەوە و تێدەگات. هەمیشە وەڵامێکی بۆ پرسیارەکانم لا بوو، ئەمنیش سەرێکم بۆ دەلەقاند و بیرم لە وەڵامەکەی دەکردەوە. جاری واش هەبوو ئەو لێی دەپرسیم چۆن لەم نزا و پەند و ئامۆژگارییانە تێدەگەیت. لە وەڵامدا، هەرچەند منیش نەمدەزانی، لێ خۆم وا نیشان دەدا کە دەیزانم، دیار بوو بۆخۆیشی هەستی پێ کردبووم کە تەنیا خۆ نماییشکردنێکە و هیچی تر. ئەوسا لێی دەپرسیم، "تۆ ئاوها لێی تێدەگەیت؟" دەستێکم بە چەناگەمدا دەهێنا و جارێکی دی بیرم لێ دەکردەوە. جا چی تێبگەم، ئەو دەستە نەرمانەی خستبووە سەر ئەژنۆم، حەواسم لای خۆم نەمابوو.

ئێوارەیەکی ڕۆژی هەینی، بۆ خواردنی شێوی ئێوارە هێنامەوە بۆ ماڵی خۆمان. دایکیشم لەگەڵمان دانیشتبوو، دواتر ئەو هەڵسا و جێی هێشتین، چووە هۆڵەکە، تا پێکەوە بەتەنها بین.

هەستێکی گەلێک شادیبەخشی پێ دەدام، کە لەگەڵیدا دادەنیشتم، وا بزانم ئەویش هەر وا بیری دەکردەوە. ماوەیەک بوو لە ماڵی خۆیان زۆر نەدەچووە دەر، بۆیە ئەم هاتنەی بۆ ماڵی ئێمە کەمێک پشووی پێ دەدا.

لەو ڕۆژەوەی کە پێی گوتم نەخۆشە ، ئیتر قژی نەکردبووەوە بە تەماتە، بەڵکوو بەری دەدایەوە بە شان و ملیدا و وەک چۆن لە نماییشەکەدا بۆ یەکەمین جار بەری دایەوە و سەرسامی کردم، ئێستاش ئەو جوانییەی جارانی هەر لێ دەباری. لەسەر مێزی نانخواردنەکە دانیشتبووین، جەیمی سەرنجی چووبووە سەر دۆلابەکەی تەنیشت

دیوارەکە و تەماشای ئەوێی دەکرد، منیش دەستم برد و توند دەستەکانیم گوشی. وتم، "سوپاس کە ئەم ئێوارەیە هاتیت بۆ لام."

نیگای لەسەر دۆلابەکە گواستەوە سەرم وتی، "سوپاس بۆ بانگهێشتەکەت."

کەمێک وەستام، پاشان وتم، "ئەی ئێستا باوکت چۆنە؟"

ئاهێکی پڕ لە خەمی هەڵکێشا و وتی، "زۆر باش نییە، گەلێک دڵم لایەتی."

"تۆی زۆر خۆش دەوێت."

"دەزانم."

"منیش خۆشم دەوێیت." کە وام گوت، ڕووی وەر چەرخاند بۆ لایەکی تر. دیار بوو کە ئەم قسەیەم دەکرد، زارەتەرەک دەبوو پێی.

لێی پرسیم، "ئیتر ئاوها زوو زوو دێیت سەردانمان بکەیت؟ تەنانەت دواتریش گەر من..."

دەستەکانیم توند گوشی، تا بزانێت لە دڵەوە ئەو قسەیە دەکەم. "هەرکاتێک تۆ بتەوێ، من لەوێ ئامادە دەبم."

وتی، "چیی تر ئینجیلەکەش ناخوێنینەوە، گەر تۆ حەزت پێ نەکرد."

"با، دەیخوێنینەوە."

زەردەیەکی هاتێ و وتی، "لاندن، تۆ هاوڕێیەکی گەلێک باشیت. بێ تۆ نازانم چی بکەم."

ئەویش، بە دەستووری من، توند دەستمی گوشی. بەرامبەرم دانیشتبوو، گەشکەیەکی کامەرانی نیشتبووە سەر ڕووی.

جارێکی دی وتم، "خۆشم دەوێت، جەیمی." لێ ئەم جاریان بە وشەکانم زارەتەرەک نەبوو، بەڵکوو نیگامان بڕییە نیگای یەکدی و بینیم ڕوخساری وەک پشکۆی ئاگر دەگەشایەوە. پاشان ئاهێکی هەڵکێشا و سەرنجی بە لایەکی تردا لا برد، دەستێکی بە قژیدا هێنا، ئەوجا دووبارە نیگای گواستەوە سەرم. دەستەکانیم ڕامووسی و ئەویش بە بزەیەکی شیرین وەلامی دامەوە.

بە چرپەیەکی ناسک وتی، "منیش خۆشم دەوێت."

ئەمە ئەو وشانە بوون، نزام دەکرد بە گوێی خۆم لە دەمیەوە بیبیستم.

جا نازانم داخۆ جەیمی بۆ باوکی باس کردبوو کە یەکترمان خۆش دەویست یان نا، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا، گومانم هەبوو پێی گوتبێ، چونکە هێگبێرت هەر وەک جاران بوو، هیچ نەگۆڕابوو. ڕێکەوت وا بوو، هەرجارێک لە خوێندنگە دەهاتمەوە و دەچووم بۆ ماڵیان، لەو وەختەدا ئەویش لە ماڵ دەهاتە دەر و دەچوو بۆ کڵێسا. دەچووم و لە دەرگام دەدا، لەودیو دەرگاوە گوێم لێ دەبوو لە ژوورەوە هێگبێرت بە جەیمیی دەگوت، ئەوا دەڕۆم و دوو کاتژمێری ترم پێ دەچێت، ئەوسا دەگەڕێمەوە. ئەویش دەیگوت، "باشە، باوکە گیان." ئەمنیش چاوەڕوان دەبووم هێگبێرت بێت و دەرگاش لە من بکاتەوە. کە لێی دەکردمەوە و فەرمووی لێ دەکردم، تاکی دۆلابی هۆڵەکەی دەکردەوە و بەئەسپایی پاڵتۆکەی لەبەر دەکرد و کلاوەکەی دەنایە سەری، پێش ئەوەی بچێتە دەرێ، قۆپچەکانی پاڵتۆکەی دادەخستن. پاڵتۆیەکی درێژی ڕەنگ ڕەشی مۆدێلکۆنی لەبەر دەکرد، تا ئەژنۆکانی دەهات.

بەدەگمەن ڕووبەڕوو قسانی لەگەڵ دەکردم، بگرە دوای ئەوەی ئیتر زانیشی من و جەیمی پێکەوە دەستمان کردبوو بە خوێندنەوەی ئینجیل، کەچی زۆر ڕووی نەدەدامێ.

لەگەڵ ئەوەی پێی خۆش نەبوو من بچم بۆ ماڵیان هەرکاتێک خۆی لەوێ نەبووایە، بەڵام هەرچۆنێک بێت، دەستی نەدەنا بە ڕوومەوە. دەمزانی لەبەر خاتری چاوی کاڵی من نەبوو، بەڵکوو لەبەر جەیمی بوو، نەیدەویست لەسەر کورسییەکانی ژێر دالانەکە دابنیشین و سەرمای ببێت، بۆیە ڕێگەی دەدام بچمە ژووری. جا ناچار دەبوو ئەویش لە ماڵەوە لەگەڵمان بمێنێتەوە، تا من دەڕۆم. بەڵام دیار بوو ئەو ڕۆژە ئەویش کەمێک پێویستی بە تەنهایی بوو، بۆیە دەچووە دەرێ. هیچ یاساوڕێساکانی ماڵی خۆیانی ڕاستەوخۆ پێ نەدەگوتم – ئەو کاتەی یەکەمین جاری بوو ڕێگەی دام بچمە ژوورەوە، هەر کە تەماشای دەکردم، بۆخۆم لە چاوەکانیدا هەموویم دەخوێندەوە. تەنیا دەبوو لە ژووری میوانەکە دابنیشین، بۆم نەبوو بچمە هیچ ژوورێکی تری ماڵەکە.

لەگەڵ ئەوەی زستانێکی گەلێک سەخت و سەرماوسۆڵە بوو، بەڵام جەیمی هێشتا تەندروستیی بەو شێوەیە خراپ نەبوو، هەڵدەستا و دەهات و دەچوو. لە ڕۆژانی کۆتاییی مانگی کانوونی دووەمدا، سەرمایەکی توند هەڵی کرد و ماوەی نۆ ڕۆژ خۆشی نەکردەوە، سێ ڕۆژ و سێ شەویش شەستەباران بەردەوام بەخوڕ دای دەکرد. لەگەڵ ئەوەی جەیمی لەم وەختە سارد و سەرمایە نەدەبوو بچێتە دەرێ، لێ دوای ئەوەی هێگبێرت لە ماڵ دەر دەچوو، بۆ چەند

خولەکێکی کەمیش بێ، هەر دەچووینە سەر کورسییەکانی ژێر دالآنەکەی دەرەوە، تا هەوایەکی پاک هەڵبمژین. هەرکاتێکیش وامان دەکرد، خەمی ئەوەم بوو سەرمای ببێت و نەخۆشتری بخا.

جاری وا هەبوو کە دادەنیشتین و سەرقاڵی خوێندنەوەی ئینجیلەکە بووین، لانی کەم، ڕۆژی سێ جار لە دەرگا دەدرا. خەڵکی زوو زوو سەردانیان دەکرد، هەبوو خۆراکی بۆ دەهێنا، هەبوو تەنیا بۆ هەواڵپرسین دەهات، ئیدی بەو جۆرە. بگرە ڕۆژێکیان دانیشتبووین، گوێمان لە تەقەی دەرگا بوو، کە کردمانەوە، تەماشامان کرد ئێریک و مارگرێت بوون. لەگەڵ ئەوەی باوکی بە جەیمیی گوتبوو خەڵکی نەباتە ژووری، بەڵام هەرچۆنێک بێ، فەرمووی لێ کردن. چوارقۆڵی لە ژووری میوانەکە دانیشتین و تاوێک دەمەتەقێمان کرد. ئەو دووانەی تر لە تەریقی و شەرمەزاریدا ڕوویان نەبوو تەماشای چاوی بکەن.

هەردووکیان لە تەریقیدا شپرزە و ڕەنگیان سوور هەڵگەڕابوو، کەمێکی تری پێ چوو، ئەوجا کەمێک بە خۆدا هاتنەوە. ئێریک هاتبوو عوزرخوایی بێنێتەوە، دەیگوت قەت بڕوای نەدەکرد لەنێو هەموو خەڵکدا، جەیمی تووشی ئەو نەخۆشییە هاتبێ. شتێکیشی لەگەڵ دەستی خۆیدا بۆ هێنابوو، زەرفێکی نامە بوو، بە دەستی لەرزۆکەوە لەسەر مێزەکەی بەردەممان دای نا. کە قسانیشی دەکرد، دەمی بەیەکدا دەهات و تەتەڵەی دەکرد. وشەکانی لە ناخی دڵەوە دەگوت، بە جۆرێک، من بۆخۆم هەرگیز ئێریکم نەبینیبوو ئەوها سۆز و عاتیفەی بجووڵێت.

بە جەیمیی گوت، "تۆ خاوەنی دڵێکی زۆر گەورەیت، تا ئێستا هیچ کەسی ترم هاوشێوەی تۆ نەناسیوە." دەنگی لە شەرمەزاریدا مردەڵۆک ببوو. "ڕاستە جاران ڕەفتار و هەڵسوکەوتم لەگەڵتدا باش نەبوو، بۆیە ئێستا هاتووم تا عوزرخواییت بۆ بێنمەوە. هیچکات لە ژیانمدا هێندەی ئێستا پەشیمان نەبووم." تاوێک وەستا و بە پشتی دەستی، چاوەکانی سڕین. جارێکی دی وتی، "تۆ باشترین مرۆڤی من تا ئێستا ناسیبێتم."

ئێریک بە قوڕگی پڕەوە لووشکەلووشکی دەکرد، لێشاوی فرمێسکیش چاوەکانی پڕ کردبوون. مارگرێتیش لەسەر قەنەفەکە گریان زۆری بۆ هێنابوو، زاری لە گۆ نەدەهات. کە ئێریک لە قسەکانی بووەوە، جەیمی فرمێسکەکانی خۆی سڕی و بە زەردەخەنەوە هەڵسایە سەر پێ، باوەشی لێبووردەیی و هاوڕێیەتیی بۆ کردەوە. ئێریکیش باوەشی پێدا کرد و هێندی تر لێشاوی گریان قوڕگی پڕ کرد. ماوەیەک هەر وا مانەوە و ئێریک لووشکەلووشک دەگریا، تا دواتر چیی تر گریانی لە قوڕگدا نەما، ئەوجا باوەشیان لەیەک کردەوە.

پاشان نۆبەی مارگرێت هات. ئەویش، بە دەستووری ئێریک، باوەشی پێدا کرد و کەمێک لووشکەلووشکی دەست پێ کرد.

ئیدی کە ئێریک و مارگرێت کاتی ئەوەیان هات هەڵسن و بڕۆن، چاکەت و پاڵتۆکانیان لەبەر کرد و جارێکی دی تەماشایەکی جەیمییان کرد، وەک ئەوەی بیانەوێت بۆ هەتاهەتایە ڕوخساری لەبیر نەکەن. گومانم لەوە نەبوو، کە ئەوانیش، بە دەستووری من، کە تەماشایان دەکرد، هەستیان

بەو جوانییەی کردبوو.

ئێریک لەنێو دەرگاکەدا کە خەریک بوو پێی دەنایە ئەودیو، ڕووی کردە جەیمی و وتی، "خەفەت مەخۆ، نزای خێرت بۆ دەکەم، هەمووومان نزای خێرت بۆ دەکەین." پاشان سەرنجی دایە من، دەستی دا بەسەر شانمدا و بە چاوی سوورهەڵگەڕاوەوە وتی، "بۆ تۆش." بەڕێ کەوتن و دوور کەوتنەوە، بۆم دەر کەوت هیچکات ئەوەندەی ئێستا شانازیم پێوە نەکردوون.

دواتر کە زەرفی نامەکەمان کردەوە، ئەوسا زانیمان ئێریک چ پیاوەتییەکی کردووە، بێ ئەوەی ئێمە بزانین، چووبوو زیاتر لە چوار سەد دۆلاری بۆ خانەی هەتیوان کۆ کردبووەوە.

چاوەڕوانی پەرجوو بووم.

هێشتا پەرجوو دەر نەکەوتبوو.

دەمەدەمی سەرەتای مانگی شوبات، حەب و دەرمانی زیاتریان بۆ نووسی، تا ئازاری گیانی کەمێک هێورتر بکاتەوە. وەختێ داودەرمانەکانی دەخوارد، سەری بەگێژ دەهات و خۆی بۆ ڕاگیر نەدەکرا. کە چووبوو بۆ گەرماوەکەش، دوو جار کەوتبووە سەر زەوییەکە و جارێکیان سەری کێشابووی بە قەراغی دەستشۆرەکەدا. ئیدی لەوە بەدواوە، داوای لە دکتۆرەکان کرد دەرمانی لێ ببڕنەوە و هیچی تری بۆ نەنووسن، ئەوانیش بە دوودڵی و قەلەقییەوە داواکەیان بەجێ هێنا و چیی تر داودەرمانیان نەدایێ. دوای ئەوەی لە حەب و دەرمانەکان دوور کەوتەوە، بەئاسانی دەیتوانی ڕێ بکا و گێژ نەدەبوو، بەڵام ئازاری گیانی زۆری بۆ هێنا و پەکی خست،

بگره هەندێک جار کە قۆڵیشی حەوا بدایە، بروسکەیەکی جەرگبڕ بە گیانیدا دەهات. نەخۆشیی شێرپەنجەی خوێن، نەخۆشییەکە تووشی خوێنی مرۆڤ دەبێت و هەموو بەدەنی دەگرێتەوە. جا بۆیە جەیمی هیوای چاکبوونەوەی ئەستەم بوو، مەگەر پەرجوو و قەدەری خودا ڕزگاری بکات.

نەخۆشییەکەی هێز و توانای لێ بڕی و وردەوردەش ماسوولکەکانی دەپووکاندەوە، تا وای لێ هات، ئاسانترین جوولەی بەدەنی لا زەحمەت و گران بوو. لە هەفتەی یەکەمی مانگی شوباتدا، کێشی نزیکەی دوو کیلۆ و نیو دابەزی. هێندی پێ نەچوو، بۆ چەند هەنگاوێکی کەم نەبێت، نەیدەتوانی زۆر ڕێ بکات، ئەویش گەر ئازاری زۆر نەبووایە. ئیتر ناچار گەڕایەوە سەر داودەرمانەکان، سەرگێژبوونەکەی گەلێک پێ خۆشتر بوو لەو ئازارە بەسوێیەی جەستەی.

هێشتا هەر ئینجیلەکەمان دەخوێندەوە.

هەروەختێک دەچووم بۆماڵیان، تەماشام دەکرد جەیمی لەسەر قەنەفەکە دانیشتووە و کتێبەکەش بەکراوەیی لەتەکیەوە دانراوە. کار گەیشتە ئەوەی باوکی دەبوو دەستی بگرێت و بیهێنێتە سەر قەنەفەکە و دایبنیشێنێ چونکە بۆخۆی پەکی کەوتبوو. گەرچی خۆی هیچی لەو بارەیەوە نەدەگوت، لێ هەردووکمان لە ماناکەی تێدەگەیشتین.

کاتم هێند بە دەستەوە نەمابوو، دڵیشم پێی دەگوتم ڕێگەچارەیەکی تر هەیە بیگرە بەر.

***

لە ڕۆژی ١٤ی مانگی شوباتدا، کە ڕۆژی خۆشەویستییە*، جەیمی چەند دێڕێک، کە باسی خۆشەویستیی دەکرد و لەلای مانایەکیان هەبوو، دیاریی کرد. پێی گوتم هەرکاتێک خوا بیکا و هاوسەرگیری پێک بێنێت، دەیەوێت ئەم چەند دێڕەی لە ئاهەنگەکەدا بۆ بخوێنرێتەوە، ئەمەش ئەو چەند دێڕە بوو:

خۆشەویستی هەمیشە ئارام و لەسەرخۆیە، هەرگیز ڕق و حەسوودیی لە دڵدا نییە، هیچ کات خۆشەویستی لووتبەرز و لەخۆبایی نییە. خۆپەرست و ڕق و کینەی نییە. دڵی کەس زویر ناکات و کینە ناخاتە دڵی خۆیەوە. حەز بە زەرەری خەڵکی ناکات. هەمیشە گیانی لێبووردەیی و متمانە و هیوای تێدایە. بەرگەی هەموو ناخۆشی و تەنگوچەڵەمەکان دەگرێت.

جەیمی یەکێک بوو لە باشترین نمونەی ئەو چەند دێڕە باسی دەکرد.

سێ ڕۆژ دوای ئەوە، وەختێک پلەی گەرما کەمێک سەر کەوت، شتێکی گەلێک جوانم پیشانی دا، شتێک بوو، کە بڕوام نەدەکرد هەرگیز چاوی پێ کەوتبێ، شتێک بوو، دەمزانی بەپەرۆش بوو بیبینێت.

بەری ڕۆژهەڵاتی کارۆلاینای باکوور، شوێنێکی تا بڵێی دڵگیر و تایبەتیی ویلایەتەکەیە. هەوایەکی لەبار و فێنک، لەگەڵ ئەوەشدا سروشتێکی جوان و دڵڕفێنی هەیە. جا بۆگ بانکس یەکێکە لەو شوێنانەی باسی دەکەم، دوورگەیەکە دەکەوێتە ئەوپەڕی کەناری دەریاکە، نزیک ئەو شوێنەی تێیدا گەورە بووین. ڕووبەری ئەم دوورگەیە، درێژەییەکەی سیوشەش کیلۆمەتر و پانییەکەیشی نزیکەی یەک کیلۆمەتر و نیو دەبێت.

---

* Valentine Day

سروشتی ئەم دوورگەیە وا هەڵكەوتووە، لە ڕۆژهەڵاتەوە بۆ ڕۆژئاوا، بەدرێژاییی كەناری دەریاكەدا درێژ دەبێتەوە. ئەو خەڵكەی لەوێ دەژین، هەموو ڕۆژێك دیمەنی جوانی خۆرئاوابوون و خۆرهەڵاتنی ئەو سروشتە جوانە دەبینن، كە هەردوو كاتەكە واتە، بەیانییان و ئێوارانیش، هەر لە ئاسۆی زەریای ئەتڵەسییەوە دیمەنەكانی خۆی دەدا بە ڕووی دانیشتووانەكەیدا.

جەیمی خۆی گەرم داپۆشیبوو، لەتەكمەوە لەسەر تەختەی لەنگەری بەلەمەكان وەستابوو و هەوای فێنكی ئێوارەش دەیدا لە ڕوومان. بەرەو ئاسۆ دەستم درێژ كرد و پێم گوت تەماشای ئەوێ بكە و چاوەڕوان بە بزانە چی دەبینیت. گەلێك لاواز و كەمحەوسەڵە بوو، خەریك بوو لەتری دەدا، بۆیە دەبوو خۆی بە منەوە بگرتایە، تا نەكەوێت – بەدەنی هیچی نەمابووەوە، هێند سووكەڵە ببوو، بە دەستێك هەڵدەگیرا – ناهەقی نەبوو.

هێندی پێ نەچوو، لەودیو ئاسۆوە مانگ بە خۆی و شێوە كەوانەیییەكەیەوە هێدی هێدی سەری دەر دەهێنا. تیشكە شێوە كریستاڵییەكانی خۆی بەسەر ڕووی زەریاكەدا پەخش دەكرد، تیشكەكانی دەكردن بە هەزاران پارچەكریستاڵی جیاواز لە یەكدی، هەریەكە لەوی پێش خۆی جوانتر خۆی دەنواند. لە هەمان كاتدا، لە ئاسۆی ڕۆژئاواشەوە، خۆر وردەوردە چاوی دەچووە خەو و ڕەنگی ئاسۆی خۆی زەرد و سوور و پرتەقاڵی دەنواند، وەك بڵێی بەهەشت لەناكاو دەرگای پیرۆزی خۆی بۆ ئاسمانی زەوی واڵا كردبێت و هەموو جوانییەكانی خۆی ناردبێتە خوارەوە. وەختێك

ڕەنگە جۆراوجۆرەکان خۆیان دەخزاندە سەر ڕووی ئاوەکە، زەریا ڕەنگێکی زیویی بەبەر خۆدا دەکرد و ئاوەکە لەگەڵ شەپۆلە کورتەکانیدا تیشکی کریستاڵیی دەدایەوە. دیمەنێکی دڵڕفێن، دەتگوت سەرەتای دروستبوونی گەردوونە. خۆر بەردەوام لە ئاوابووندا بوو، تا چاو هەتەری دەکرد، تیشکی ئاڵتوونیی خۆی بە ئاسۆدا پەخش دەکرد، تا دواجار لەودیو شەپۆلەکانی زەریاوە، هێدی هێدی لە چاو ون بوو. مانگیش لە ئاسۆی ئەولاوە بەکاوەخۆ ئێوارەباشی لە زەریا دەکرد و تیشکە زیوینەکەی بە ڕووی زەریادا دەدا و بە هەزاران وردەتیشکی کریستاڵیی بە ڕووی ئاوەکەدا دەڕژاند.

جەیمی لەتەکمەوە، بێ ئەوەی هیچ بڵێت، لە باوەشمدا نوقمی ئەم دیمەنانە ببوو. وەختێک تاریکیی شەو بەتەواوی باڵی بەسەر ئاسماندا کێشا و لەوپەڕی باشوورەوە ڕووناکیی ئەستێرە پرشنگدارەکان دەر کەوت، توندتر لە خۆمم نزیک کردەوە و لە ئامێزم گرت. بەنەرمی ڕوومەتەکانیم ڕامووسی و لێوم نا بە لێویەوە.

وتم، "ئەوە هەست و سۆزی ناخ و دەروونی منە بۆ تۆ."

پاش هەفتەیەکی دیکە، نەخۆشییەکەی زۆری بۆ هێنا و ناچار بوو زووزوو سەردانی نەخۆشخانە بکات، نەیدەویست شەوان لە نەخۆشخانە بمێنێتەوە. دەیگوت، "گەر بشمرم، دەمەوێ لە ماڵەوە بمرم." جا بە هۆی ئەوەی دکتۆرەکانیش هیچ چارەسەرێکی نەخۆشییەکەیان بۆ نەدەکرا، بۆیە ناچار دەبوو مل بۆ داواکەی بنێن و ڕێگەی بدەن بچێتەوە بۆ ماڵەوە.

بۆ ئەوەی هیچ نەبێت تا زیندووە بە دڵی ئەو بجووڵێنەوە.

وتم، "بەردەوام بیر لەو چەند مانگەی ڕابردوو دەکەمەوە."

لە ژووری میوانەکەیان دانیشتبووین، دەستمان لەناو دەستی یەک نابوو، کتێبی ئینجیلەکەمان دەخوێندەوە. ڕوخساری هێندی تر باریک و زەرد هەڵدەگەڕا، قژە خاوەکەی ئەو ڕەونەق و ڕوونییەی جارانی وردەوردە لەدەست دەدا. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، هێشتا چاوە شینە خومارەکانی پرشنگ و گەشییەکەی هەر مابوو. خۆشەویستییان لێ دەباری.

بڕوا ناکەم لە ژیانمدا هیچ کەسێکی ئەوها شۆخوشەنگم بینیبێ.

ئەویش وتی، "منیش هەر بیر لەو ساتانە دەکەوە."

"لە یەکەم ڕۆژی دەستپێکردنی وانەی دراما، دەتزانی من بەشداری لە نمایشەکەدا دەکەم، ئەو کاتەی بە زەردەخەنەیەکەوە نیگایەکت کردم. وا نییە؟"

سەرێکی ئەرێنیی لەقاند و وتی، "وایە."

"وەختێکیش هاتم بۆ لات و داوام لێ کردی لەگەڵم بێیت بۆ ئاهەنگی دەستپێکی پشووی هاوین، بەڵێنت لێ وەر گرتم هەستی خۆشەویستیم بۆت نەجووڵێ، بەڵام دەشتزانی هەر دەکەومە داوی خۆشەویستیتەوە، وا نییە؟"

زەردەخەنەیەکی شیرین سەر ڕووی نیشت و وتی، "بەڵێ، ڕاستە."

"چۆن هەستت بەمانە کردبوو؟"

شانێکی نادڵنیاییی هەڵتەکاند و هیچی نەگوت. بۆ چەند ساتێکی تریش، پێکەوە دانیشتین، تەماشای بارانەکەی دەرەوەمان دەکرد، دڵۆپەکان خۆیان بە شووشەی پەنجەرەکەدا دەدا و پیایدا دەچۆڕانەوە.

پاشان بێدەنگییەکەی شکاند و وتی، "ئەو وەختەی پێم گوتیت نزای خێرت بۆ دەکەم، دەتزانی مەبەستم چ بوو؟"

تا دەهات، نەخۆشییەکەی پتر ماندووی دەکرد و توانا و بڕستی لێ دەبڕی. مانگی ئایاریش نزیک دەبووەوە. حەب و دەرمانی زیاتریان بۆ نووسیبوو، ئازارێکی توندیش ناو گەدەی گرتبوو، بە جۆرێک، خواردنی باش بۆ نەدەخورا. وردەوردە ڕەنگی دەپەڕی و لاوازتر دەبوو. وای لێ هات، گەرچی حەزیشی نەدەکرد، ناچار دەبوو بچێت لە نەخۆشخانە بمێنێتەوە.

ئەنجام، بە یارمەتیی دایک و باوکم، هەموو شتەکان گۆڕا.

باوکم بەپەلە لە واشنتۆن گەڕایەوە، گەرچی دانیشتنی کۆنگرەش هێشتا کۆتایی نەهاتبوو، لێ خۆی مەحتەل نەکرد. دیار بوو دایکم تەلەفۆنی بۆ کردبوو، پێی گوتبوو گەر هەر ئێستا نەیەیتەوە، ئیتر هەر لەوێ بە و مەیەرەوە.

ئیدی کە دایکم حاڵ و مەسەلەی تێگەیاند، باوکم دوودڵ بوو، دەیگوت هێگبێرت مەحاڵە ڕازی ببێت و یارمەتیی ئێمە قبوڵ بکات، ڕووداوەکانی ڕابردووی هێشتا لە دڵدا ماون و هیچمان پێ ناکرێ.

دایکیشم وەڵامەکەی باوکمی نەدەچووە مێشکەوە، پێی وت، "ئەمە هیچ پەیوەندیی بە بنەماڵەکەی تۆ یان هێگبێرتەوە نییە، هیچ پەیوەندیی بە ڕابردووی ئێوەوە نییە چیتان لەنێواندایە یاخود نا. ئەمە چارەنووسی کوڕەکەمانی پێوە بەندە، ئەو کچەی خۆش دەوێت و ئەویش پێویستیی بە یارمەتیی ئێمەیە. تۆش دەبێت ڕێگەچارەیەک بدۆزیتەوە و بە هانای ئەو کچەوە بچین."

ئیدی خەبەرم لەوە نەبوو، نازانم باوکم چۆن چوو بۆ لای هێگبێرت و چییان گوت و چ قەوما، تەنیا ئەوەندەم زانی، جەیمی ڕەوانەی نەخۆشخانەیەکی بەناوبانگ کرا و ئامێری پزیشکیی پێشکەوتوو لە ڕاست و چەپیدا دانرا و داودەرمانی پێویستیان بۆ ئامادە دەکرد. دوو پەرستیاریش شەو و ڕۆژ ئێشکگری بوون و دکتۆرێکیش ناوبەناو دەهاتە لای و پشکنینی بۆ دەکرد.

جەیمی ئیتر توانیی لە ماڵەوە بمێنێتەوە.

ئەو شەوە بۆ یەکەمین جار لە ژیانمدا بەسەر شانی باوکمەوە دەستم کرد بە گریان.

چوومە سەردانی ماڵی جەیمی، لەنێو پێخەفەکەیدا خۆی لە بەتانییەکەوە ئالاندبوو. بە بۆرییەک ئەو خواردن و پێداویستییانەی بەدەنی پێویستی بوون، دەچووە دەمارەکانی قۆڵیەوە. ئاویشیان بۆ هەڵواسیبوو. ڕەنگی زەرد هەڵگەڕابوو، هێندەی پووشێکی لێ مابووەوە. قاچی بە خۆوە نەدەگرت، نەیدەتوانی ڕێ بکات، دەبوو کەسێک بچێتە بنهەنگڵی و یارمەتیی بدات، ئەوجا کەمێک هەنگاوی بۆ هەڵدەهێنرا. لێم پرسی، "هیچ خۆزگەیەکت هەیە لە ڕابردوودا نەتهێنابێتە دی؟"

ئەویش وتی، "لاندن، ئێمە هەمووومان خۆزگە و ئاواتمان هەیە. بەڵام من ژیانێکی خۆشم گوزەراند."

خۆم پێ نەگیرا و دەنگم کەمێک لێ هەڵبڕی، وتم، "چۆن دەتوانی شتی وا بڵێیت؟ لەپای ئەوەی ئەم هەموو دەردی سەرییە و بەڵایەت بەسەر هات، هێشتا دەڵێیت ژیانم خۆش بووە؟"

دەستمی گوشی و بە بزەیەکی شیرین و بەدەم چاوگێڕان بەنێو ژوورەکەدا وتی، "ئەمە لە هەمووی باشترە."

لەگەڵ ئەوەی چاوەکانم پڕ بوون لە فرمێسک، پێکەنینێکی بەمەغزام کرد. کەچی ڕاست پەشیمان بوومەوە لە پێکەنینەکەم. من دەبوو دڵنەواییی بدەمەوە و دڵی ڕابگرم، نەک پێی پێبکەنم و هەستی بریندار بکەم.

جەیمی بەردەوام بوو لە قسەکانی، وتی، "بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، من هەمیشە دڵم خۆش بووە. لاندن، بەڕاستی لە ژیانمدا کامەران بووم. باوکێکی بێوێنەم هەیە، هەر ئەویش فێری خوداناسیی کردم. کە ئاوڕ لە ڕابردووی خۆم دەدەمەوە، ئەوجا دەزانم گەر باوکم نەبووایە، نەمدەتوانی یارمەتیی خەڵک بدەم و منداڵانی هەتیو دڵخۆش بکەم،" ئێستێکی کرد و چاوی بڕییە چاوەکانم، پاشان وتی، "ئەوەتا کەسێکم خۆش ویست و ئەو کەسەش منی خۆش دەوێت."

که وای گوت، دەستیم ڕامووسی و بردم بۆ ڕوومەتەکانم.

وتم، "ئەم ژیانە یەکسانیی تێدا نییە."

هیچی نەگوت.

لێم پرسی، "ئێستاش هەر دەترسیت؟"

"بەڵێ."

وتم، "منیش دەترسم."

"دەزانم، من داوای لێبووردن دەکەم."

بە نائومێدییەوە وتم، "من چیم پێ دەکرێ؟ نازانم ئیتر چی بکەم."

"ئینجیلەکەم بۆ دەخوێنیتەوە؟"

سەرێکی ڕەزامەندیم بۆ لەقاند، لەگەڵ ئەوەی دڵنیاش

نەبووم بتوانم لە خوێندنەوەدا بەردەوام بم.

ئەی خودای گەورە، ئەی خالقی دونیا، ڕەحم و بەزەییت بەسەرمدا ببارێنە و ڕێگەچارەیەکم نیشان بدە.

کە چوومە ماڵەوە، بۆ شەوەکەی بانگی دایکمم کرد، "دایکە!"

"بەڵێ کوڕی خۆم؟"

لەگەڵ دایکمدا پێکەوە لەسەر قەنەفەی ژووری میوانەکە دانیشتبووین، گڕی ئاگردانەکەیش لە بەردەمماندا بڵێسەی دەدا. جا ئەو ڕۆژە، بەیانییەکەی لە ماڵی جەیمی بووم، لەتەکیەوە هەڵکووڕ مابووم ئینجیلەکەم بۆ دەخوێندەوە، کەمێکی پێ چوو، خەوی لێ کەوت، دیار بوو ماندوو بوو، بۆیە بەئەسپایی ماچێکم کرد و هەڵسام بڕۆمە دەرێ، کەچی لەو ساتەدا هێگبێرت خۆی کرد بە ژووردا. تەماشایەکی کردم، لە لایەک بۆخۆیشی دەیزانی کچەکەیم خۆش دەویست، بەڵام لە لایەکی دیش، بینیی یەکێک لە یاساکانی ماڵەکەیم پێشێل کرد. خۆ گەر جەیمی ئەوها نەبووایە، هەرگیز جارێکی تر ڕێگەی نەدەدام پێ بنێمە نێو ماڵەکەیانەوە. بە هەرکڵۆجێک، بێت خۆم گەیاندە دەرگاکە و هاتمە دەرێ.

هێگبێرت ناهەقی نەبوو. لەگەڵ ئەوەشدا هێند سەردانی ماڵیانم کردبوو و لەگەڵ جەیمییش ئەوەندە هەڵسوکەوتم کردبوو، چیی تر سامی باوکیم نەدەکرد و ڕاهاتبووم لە تەماشاکردنەکانی. لە ماوەی ئەو چەند مانگەی ڕابردوودا، جەیمی فێری ئەوەی کردبووم چۆن ڕەفتار و ناخی خەڵک هەڵبسەنگێنم و بیرکردنەوەکانیان بخوێنمەوە، بۆیە دڵنیا بووم گەر بۆ ڕۆژی دواتریش بچمەوە ماڵیان، باوکی ڕێی دەدام

بچمە ژووری. جا ئێوارەکەی کە لەتەک دایکمەوە دانیشتبووم لەسەر قەنەفەکە، بیرم لەم شتانە دەکردەوە.

وتم، "دایکە، تۆ لەو بڕوایەدایت هەرکەسەمان ئامانج و مەبەستێکی هەبێت لە ژیانماندا؟"

ئەوە یەکەمین جارم بوو ئەو جۆرە پرسیارە لە دایکم بکەم، چونکە ئیتر شتەکان گۆڕاون و جیاوازن لە جاران.

ڕووی گرژ کرد و وتی، "تێناگەم، نازانم مەبەستت چییە."

"مەبەستم ئەوەیە، چۆن بزانیت چی بکەیت و چی نەکەیت باشە؟"

"مەبەستت ئەوەیە، کە لەگەڵ جەیمی هەڵسوکەوت دەکەیت؟"

هەرچەند بۆخۆشم دڵنیا نەبووم، لێ، سەرێکم لەقاند و وتم، "دەزانم شتێکی باشم کردووە، بەڵام... شتێک ماوە. ڕاستە پێکەوە هەڵدەستین و دادەنیشین و قسە دەکەین و ئینجیل دەخوێنینەوە، بەڵام..."

قسەکانم لە زار بۆ نەدەهاتنە دەر، بەڵام دایکم بۆی تەواو کردم. وتی، "دەتەوێت لەوە زیاتر بۆ ئەو کچە بکەیت؟"

سەرێکی ئەرێنیم لەقاند.

بە سۆزێکی دایکانەوە وتی، "کوڕی خۆم، جا نازانم چ شتێکی تر هەیە بیکەیت؟"

"ئەی باشە بۆچی من ئەم هەستەم لا دروست بووە؟"

لەسەر قەنەفەکە کەمێک زیاتر لێم نزیک بووەوە و بەدەم تەماشاکردنی گڕی ئاگردانەکەوە وتی، "وا بزانم لەبەر ئەوەیە دەترسیت و هەست دەکەیت هیچت پێ ناکرێ، لەگەڵ ئەوەی هەوڵی خۆشت دەدەیت، بەڵام شتەکان بە دەستەوە نایەن

و زیاتر لێت قورس دەبن – بۆ هەردووکتان. تا زیاتریش تەقەللا بدەیت، زیاتر بێهیوا دەبیت لە شتەکان."

"هیچ شتێک هەیە ئەم هەستەم لا بسڕێتەوە؟"

دەستی کردە ملم و لە خۆی نزیک کردمەوە و بە غەمگینییەوە وتی، "نا، هیچ شتێک نییە."

ڕۆژی دواتر، کە چوومەوە بۆماڵیان، جەیمی حاڵی گەلێک خراپ بوو، نەیدەتوانی لە پێخەفەکەی بێتە خوارێ. بە هۆی ئەوەی هێند لاواز و کەمحەوسەڵە بوو، تەنانەت قۆڵیشیم بگرتایە، هەر نەیدەتوانی لە جێی خۆی بجووڵێ، بۆیە هەر لەو ژوورەدا ئینجیلەکەم بۆ خوێندەوە.

کەمێکی پێ چوو خەو بردییەوە.

هەفتەیەکی تر بەو شێوەیە تێپەڕی و جەیمی حاڵی خراپتر دەبوو، تا دەهات، هێز و توانا لە بەدەنی دەبڕا. ئیدی مەحاڵ بوو لە جێگەکەی بتوانێ بێتە خوارێ، لەڕولاواز، هێندەی تۆزێکی مابووەوە، دەتگوت کچێکی منداڵی شەش ساڵانە.

بە غەمگینییەوە وتم، "جەیمی؟ پێم بڵێ چیم پێ دەکرێ بۆت بکەم؟"

جەیمی وای لێ هاتبوو، بگرە کە قسەشم بۆ دەکرد، حەواسی لای من نەدەما و خپ خەوی لێ دەکەوت، تا چەند کاتژمێرێکیش بێدار نەدەبووەوە. هەناسەکانی سارد و لاواز بوون.

لەتەک پێخەفەکەیەوە دانیشتم و بۆ ساتێکی درێژ ئەوها تەماشام دەکرد، ئای چەندم خۆش دەویست. دەستیم گرت و هێنام خستمە سەر دڵی خۆم، پەنجەکانی تەنیا ئێسکوپرووسکیان لێ مابووەوە. قوڕگم پڕ بوو و لە دڵەوە

دەمویست بدەمە قوڵپی گریان، لێ دەستیم دانایەوە و ڕووم وەر چەرخاند بەرەو لای پەنجەرەی ژوورەکە.

لە زەینی خۆمدا دەمگوت، باشە بۆچی ژیانم ئەوها لێ بوو بە دۆزەخ؟ بۆچی ئەم بەڵایە بەسەر جەیمی هات؟ دەمگوت تۆ بڵێی پەیامێک لەپشت ئەمەوە هەبێت و تاقیکردنەوەیەک بێت بۆ ئەو؟ تۆ بڵێی، وەک جەیمی خۆی دەیگوت، ئەمە قەدەری خودا بێت؟ تۆ بڵێی خودای گەورە ویستبێتی من ئەوم خۆش بوێت؟ یاخود تەنیا ڕێکەوتی خۆم بووە و تووشی هاتووم؟ تا جەیمی زیاتر بخەوتایە، زیاتر لەتەکمەوە هەستم بە بوونی دەکرد، بەڵام وەڵامی ئەم پرسیارانەم لە جاران زیاتر بۆ ڕوونتر نەدەبوونەوە.

لە دەرەوە، بارانی بەیانی خۆشی کردبووەوە. تاقی بەیانییەکەی، هەورەکان بەری ئاسمانیان گرتبوو، بەڵام ئێستا تیشکی خۆری پاشنیوەڕۆ دڕی بە هەورەکان دەدا و تیشکە ئاڵتوونییەکەی خۆی دەگەیاندە سەر ڕووی زەوی. لە هەوای فێنکی بەهاردا، یەکەمین نیشانەی سروشتم بەدی کرد، دووبارە ژیانی بەبەر خۆیدا دەکردەوە. درەختەکان لقوپۆپیان دەر دەکرد و گەڵا و گوڵەکانیش چاوەڕوانی ساتەوەختی خۆیان بوون چرۆ بکەن و بۆنوبەرامەی خۆیان بە هەوای وەرزی هاوینێکی نوێدا پەرتوبڵاو بکەنەوە.

چەند وردەکەلوپەلێکم لەسەر مێزی کۆمەدیی تەنیشت پێخەفەکەیەوە بینی، کە جاروبار جەیمی لە خۆشەویستیدا دەینان بە سنگی خۆیەوە. لەوانە، چەند وێنەیەکی باوکی بوو، کە ئەو دەمەی جەیمی منداڵ بووە و لە یەکەم ڕۆژی باخچەی ساوایانیدا لە بەردەمی باخچەکە لە باوەشیدا گرتبوویان.

هەروەها چەند کارتێکی لەلایەن منداڵە هەتیوەکانەوە بۆ هاتبوون و لەوێدا دای نابوون. ئاهێکم هەڵکێشا و دەستم برد کارتەکەی سەرەوەم هەڵگرت تەماشای بکەم.

بە ماجیکی ڕەنگاوڕەنگ لێی نووسرابوو:

تکایە زوو چاک ببەرەوە. بیرت دەکەم.

کارتەکە ناوی لیدیای لەسەر بوو، ئەو کچەی ئێوارەی کریسمس چووین و لە کۆشی جەیمیدا خەوی لێ کەوت. کارتەکەی دوای ئەوەشم کردەوە و تەماشام کرد، ئەمەیان ڕۆجەر بۆی ناردبوو. ئەویش بە هەمان دەستووری ئەوی دیکە لێی نووسرابوو، بەڵام ئەوەی سەرنجی ڕاکێشام، ئەو وێنەیە بوو کە ڕۆجەر بە دەست کێشابووی. وێنەی باڵندەیەکی کێشابوو، کە بەسەر پەلکەزێڕینەیەکدا دەفڕی.

قوڕگم پڕ بوو، کارتەکەم داخستەوە، نەمدەتوانی چیی تر تەماشای بکەم، ئەوجا کە سەفتە کارتەکەم لە جێی خۆی دانایەوە، پارچە ڕۆژنامەیەکم بەرچاو کەوت لەتەک پەرداخە ئاوەکەیەوە. دەستم بۆ برد و تەماشام کرد ڕاپۆرتێک بوو لەبارەی نمایشی شانۆگەرییەکەوە. لە ڕۆژنامە ناوخۆییەکەدا، ڕۆژێک دوای تەواوبوونی نمایشەکە بڵاو کرابووەوە. لە بەشی سەرووی ڕاپۆرتەکەوە، بینیم وێنەیەکی من و جەیمی گیرابوو، کە تا ئەو کاتە تاکە وێنەی من و ئەو بوو پێکەوە.

دەتگوت ساڵانێک بەسەریدا تێپەڕ بووە. ڕاپۆرتەکەم زیاتر هێنایە پێشێ و لێی ورد بوومەوە. ئەوجا هاتەوە یادم، کە ئەو شەوەی جەیمیم بینی هەستم بە چی دەکرد. نزیکتر لە وێنەکەی جەیمی ورد بوومەوە، تا بزانم ئاخۆ ئەو کاتە هیچ نیشانەیەکی ئەم ڕۆژگارە سەختەی ئەمڕۆی پێوە دیار بووە.

دەزانم ئەو کاتەیش لێی دیاری دابوو، بەڵام ڕەنگوڕوخساری ئەو شەوەی، خۆشبەختی و کامەرانیی لێ دەباری. دواتر پارچە ڕۆژنامەکەم لە جێی خۆی دانایەوە و هەناسەیەکی قووڵی پڕ لە خەم و پەژارەم هەڵکێشا.

ئینجیلەکە هێشتا بەکراوەیی، چۆنم جێ هێشتبوو، ئاوهاش هەر لەوێدا مابوو، گەرچی جەیمی خەویشی لێ کەوتبوو، لێ بەپێویستم زانی هەندێکی تر بخوێنمەوە. ئەنجام، گەیشتمە چەند دێڕێک، ئەمەی تێدا نووسرابوو:

من فەرمانت بەسەردا ناکەم، بەڵام دەمەوێت ڕاست و دروستیی خۆشەویستییەکەت تاقی بکەمەوە، ئەویش بە بەراوردکردن لەگەڵ خۆشەویستیی ڕاستەقینە و ڕاستگۆییی کەسانی تردا.

وشەکان جارێکی دی لێشاوی فرمێسکیان بۆ هێنام، لەو ساتەدا بوو، کە خەریک بوو دەمدایە پرمەی گریان، لەناکاو مانای پشت وشەکانم لە زەینمدا ڕوون بوونەوە و تێگەیشتم لە مەبەستیان.

خودای گەورە دواجار وەڵامی نزاو پاڕانەوەکانمی دایەوە. ئیتر بۆخۆم تێگەیشتم دەبێت چی بکەم.

خێرا خۆم گەیاندە کڵێساکە، گەر بە ئوتومبێلیش بڕۆیشتمایە، ئەوەندە زوو نەدەگەیشتمە جێ. بە گورگەلۆقە بەسەر دیواری حەوشە و سەربان و گەراجی ماڵاندا، هەرچۆنێک بێت، قەڵمبازم دەدا و کام ڕێگە کورتخایەن بووایە، دەمگرتە بەر، تا کڵێساکە نەدەوەستام. هەرچییەک دەهاتە سەر ڕێم؛ نەمدەخوێندەوە، گەرچی لە ڕاکردن و وەرزشدا زۆر باشیش نەبووم، لێ لەو ساتەوەختە گرنگەدا گوێم بە

هیچ نەدەدا و نەدەوەستامەوە، هەستم بە ماندویێتی نەدەکرد، بیروهۆشم تەنیا لای ئەو شتە بوو، کە دەمویست بەجێی بێنم. وەختێک گەیشتمە جێ، گوێم نەدا بەوەی سەروسیمام چۆنە و چۆن نییە، چونکە دەمزانی هێگبێرت ئەم شتانەی بەلاوە گرنگ نەبوو. دەرگای کڵێساکەم کردەوە و بەکاوەخۆ پێم نایە ژووریَ، هەناسەم سوار ببوو، بەرەو بەشی پشتەوەی کڵێساکە چووم بۆ نووسینگەکەی هێگبێرت.

کە منی بینی، سەرێکی هەڵبڕی، دەمزانی هێگبێرت بۆچی چووبووە ئەویَ. فەرمووی لیَ نەکردم، تەنیا ڕووی وەر چەرخاند و نیگای چووە سەر پەنجەرەی ژوورەکە. لە ماڵی خۆیان لەبەر، نەخۆشییەکەی جەیمی، نەیدەهێشت وردەکاغەزێکیش چییە لەو ناوە بکەوێت، بەردەوام ماڵەکەی پاک دەکردەوە و دەستی تێیدا بوو. کەچی لەوێ، سەرمێزەکەی پەرشوبڵاو، پڕ بوو لە کاغەز و کتێب، دەتگوت ساڵێکە کەس نەهاتووە دەستێک بەو ژوور و سەرمێزەدا بێنێت. لە بیری خۆمدا دەمگوت، دیارە لەم ژوورەدا هەر بیر لە کچە تاقانەکەی دەکاتەوە، هەر لەم ژوورەشدا بوو، هێگبێرت جارەکەی تر کە هاتم، دەستی کرد بە گریان.

بە ئەدەب و ئوسوڵەوە وتم، "جەنابی هێگبێرت، دەتوانم بێمە ژوورەوە؟"

هیچی نەگوت، بەڵام من، هەرچۆنێک بێت، خۆم خزانە ژوورەوە.

بە دەنگێکی مردەڵۆک و پڕ لە پەژارەوە وتی، "حەز دەکەم بەتەنها بم."

ئەو هێگبێرتەی جاران نەمابوو، خەم و پەژارە دای

رزاندبوو، هێندەی تریش بەساڵا چووبوو. شەکەت و ماندوێتی و پیری بەرۆکیان گرتبوو. چاوەکانی چووبوون بە قووڵدا، ئەو تۆزە قژەی بە سەریشیەوە مابوو، لەو چەند مانگەی ڕابردووەوە ئەویش لە تەنکیی دابوو.

ڕاست بەرەو مێزەکەی هەنگاوم نا، نیگایەکی کردم و دواتر جارێکی دی ڕووی بەرەو پەنجەرەکە وەرچەرخاندەوە. وتی، "تکا ئەکەم دەمەوێت بەتەنها بم." دەنگی هێند مردەڵۆک و لاواز بوو، دەتگوت توانای قسەکردنیشی نەماوە.

منیش بە بڕوابەخۆبوونەوە وتم، "دەمەوێت قسەت لەگەڵدا بکەم. گەر زۆر گرنگ نەبووایە، نەدەهاتم."

هێگبێرت ئاهێکی هەڵکێشا و لەسەر کورسییەکەی دانیشت، منیش چوومە سەر هەمان ئەو کورسییەی بەردەم مێزەکەی، ئەوەی جارەکەی پێشوو لەسەری دانیشتم کە هاتم و داوام لێ کرد ڕێگەم بدات جەیمی ببەمە دەرەوە لە ئێوارەی کریسمسدا.

ئەو گوێی بۆ شل کردم و هەرچیم لە مێشکدا بوو، تێم گەیاند. وەختێک لە قسەکانم بوومەوە، نیگای گواستەوە سەرم. نازانم ئەو ساتە چی بە مێشکیدا گوزەری دەکرد، بەڵام خۆشبەختانە ڕازی بوو. ئەوجا بە پشتی دەستی، چاوەکانی سڕین و ڕووی وەر چەرخاندەوە بۆلای پەنجەرەکە.

دیار بوو تەنانەت ئەویش بە قسەکانم سەری سووڕ ما و هیچی بۆ نەدەگوترا.

جارێکی دی، بێ ئەوەی هەست بە ماندوێتی بکەم، چۆن هاتم، ئاوهاش وەک فیشەکەشێتە بە سەربان و دیواری حەوشەی مالاندا خۆم گەیاندەوە ماڵی جەیمی. وەختێک

گەیشتمە جێ، بێ ئەوەی تەقە لە دەرگا بێنم، خۆم خزاندە ژووری، لەو ساتەدا پەرستیارەکەی کە هاتبوو حەب و دەرمانی بۆ ، سەرێکی کێشایە دەرەوە، تا بزانێت ئەو خشەخشە چ بوو. پێش ئەوەی ئەو زار هەڵبێنێ، من پێشی کەوتم و بە دەنگێکی پڕ لە ئومێد و لە هەمان کاتیشدا تێکەڵ بە شپرزەیی و نیگەرانی، لێم پرسی، "بەخەبەر هاتووە؟"

پەرستیارەکەش بەئەسپایی وتی، "بەڵێ، کە هەڵسا، پرسیاری تۆی کرد گوتی لەکوێیە."

ئەوجا عوزرخواییم بۆ پەرستیارەکە هێنایەوە، کە بەو شێوەیە بە سەروسیمای شپرزە و پەلەپروزێ خۆم کوتایە ژوورەوە و سوپاسیشم کرد، پاشان داوام لێ کرد بەتەنها جێمان بێڵێت. پێم نایە ژوورەوە و دەرگاکەشم لەدوای خۆم کەمێک بەکراوەیی پێوە دا. جەیمی ڕەنگی زەرد، ڕەنگی بە ڕووەوە نەمابوو، لێ کە بزەیەکی بۆ کردم، ئەوسا زانیم هێشتا گوڕوتینێکی تێدا ماوە و بەتەواوی خۆی نەداوە بەدەستەوە.

بە دەنگی کز و مردەڵۆکەوە وتی، "لاندن، سڵاو. سوپاس کە هاتیتەوە."

کورسییەکم ڕاکێشایە لایەوە و لەتەکیەوە دانیشتم، دەستیم گرت. کە دەمبینی ئاوها لە جێگەدا کەوتووە، جەرگ و هەناوم دەسووتا بۆی، قورگم پڕ دەبوو و لێشاوی فرمێسک دەزایە نێو چاوەکانم.

وتم، "پێشتریش لێرە بووم، بەڵام تۆ خەوت لێ کەوتبوو."

"دەزانم... بمبوورە. چیی تر هێز و توانام نەماوە."

"هیچ نییە، گوێ مەدەرێ."

دەستی کەمێک بەرز کردەوە و ماچم کرد، پاشان سەرم برد و ڕوومەتەکانیشیم ڕامووسی.

لێم پرسی، "منت خۆش دەوێت؟"

زەردەخەنەیەکی کرد و وتی، "بەڵێ."

"دەتەوێت من دڵم خۆش بێت؟" کە ئەم پرسیارەم لێ کرد، دڵم کەوتە پەلەپەل.

"بەدڵنیاییەوە."

"کەواتە شتێکت پێ بڵێم بۆم دەکەیت؟"

ڕووی بەولادا وەر چەرخاند، خەم و پەژارە ڕوخساری داگرت. وتی، "نازانم داخۆ بتوانم یان نا."

"باشە، گەر بتوانیت، بۆم دەکەیت؟"

هەرگیز بڕوا ناکەن گوڕوتینی هەست و دەروونم لەو ساتەدا چۆن بڵێسەی دەدا و کوڵ کوڵ لە ناخمدا دەکوڵا. لە یەک کاتدا خۆشەویستی و تووڕەیی و پەژارە و هیوا و ترس پێکەوە تێکەڵ ببوون، تووشی شپرزەیییەکیان کردبووم، مەگەر خوا بزانێ. جەیمی لێم ورد بووەوە، ئەمنیش هێندەی تر هەناسەم سوار بوو. ڕاست لەو کاتەدا هەستێکم لا خوڵقا، کە پێشتر هیچکات ئەوەندەی ئەو ساتەوەختە بۆ هیچ کەسێکی تر هەست و سۆزم بەو شێوەیە بڵێسەی نەسەندبوو. کە منیش چاوم بڕییە چاوەکانی، لە دڵەوە خۆزگەم دەخواست بتوانییایە کۆتایی بەم نەهامەتییە بێنم. لە توانامدا بووایە، ڕۆحی خۆمم بۆ دەر دەهێنا و ژیانی خۆم پێ دەسپارد. دەروونم هێند کەفوکوڵی دەر دەدا، دەمویست هەست و ناخی خۆمی بۆ دەر ببڕم، لێ لەو کاتەدا بە دەنگی کز، بەڵام پڕ لە بەڵێن و پەیمان وەڵامی پرسیارەکەمی دایەوە و وتی "بەڵێ،

هەرچییەک بتوانم، بۆت دەکەم."

پاشان خۆم بەسەر ناخمدا زاڵ کرد و حەواسی پەرتوبڵاوم هێنایەوە سەر خۆ، جارێکی دی ڕوومەتەکانیم ڕامووسی، ئەوجا بەکاوەخۆ دەستم برد بۆ ڕوخساری و بەنەرمی پەنجەکانم بە ڕوومەتیدا دەهێنا. پێستی نەرمی و چاوە پرشنگدارەکانی مەست و حەیرانیان دەکردم. بگرە دوای ئەو هەموو نەخۆشییەش، جوانییەکەی لەدەست نەدابوو.

هەمدیسان قوڕگم پڕ بوو، بەڵام وەک پێشتر گوتم، بۆخۆم دەمزانی چی لە مێشکمدا بوو، دەمزانی چی دەکەم. لەبەر ئەوەی ئیتر بۆم ڕوون بووەوە کە من ناتوانم لەم نەخۆشییە ڕزگاری بکەم و چاکی بکەمەوە، بۆیە دەمویست شتێکی پێشکەش بکەم، کە هەمیشە ئاواتی بۆ خواستووە.

شتێک بوو، هەمیشە دڵم پێی دەگوتم پێشکەشی بکە.

جەیمی، دواتر تێگەیشتم، لەمێژ بوو وەڵامی ئەو پرسیارەی دابوومەوە کە لەدوای دەگەڕام، ئەو وەڵامەی دڵم عەودالّی بوو. شەوەکەی کە چووین بۆ لای بەڕێوەبەری خانەی هەتیوانەکە و لە دەرەوەی نووسینگەکەی دانیشتبووین، هەر ئەو کاتە وەڵامی دابوومەوە.

بزەیەکی نەرمم بۆ کرد و ئەویش بۆ وەڵامی زەردەخەنەکەم دەستمی توند گوشی، وەک ئەوەی بڵێ هەرچییەک دەکەیت، متمانەم پێتە. گوڕوتینم تێ گەڕا و سەرم لێ بردە پێشەوە، هەناسەیەکی قووڵم هەڵکێشا و ئەم وشانەش لەگەڵ هەناسەدانەوەکەمدا لە زارم هاتنە دەر...

"شووم پێ دەکەیت؟"

# ١٣

ئەو دەمەی تەمەنم حەڤدە سالآن بوو، ژیانم بۆ هەمیشە گۆڕا. ئێستاش دوای چل ساڵ، کاتێک بە شەقامەکانی بیوفۆرتدا دەگوزەرێم، بیر لەو ساڵەی تەمەنی ژیانم دەکەمەوە، دەڵێی ئێستایە، هەموو شتەکانم بەڕوونی لەیادە.

ئەو وەختەم بیرە، کە بە هەناسەسوارییەوە پرسیارەکەم لێ کرد و گوتی بەڵێ، شووت پێ دەکەم، ئەوسا هەردووکمان دامانە پرمەی گریان. لەیادمە چووم قسەم لەگەڵ هێگبێرت و دایک و باوکیشمدا کرد، ئەو تەگبیرەی لە مێشکمدا بوو، پێم گوتن. ئەوان وا تێدەگەیشتن، کە تەنیا لەبەر خاتری جەیمی ئەوەم دەکرد، جا بۆیە بە هەرسێکیان تەقەللایان دا دەست لەو تەگبیرە هەڵبگرم و لە مێشکی خۆمی دەر بکەم، بەتایبەت کاتێک زانییان جەیمی ڕازی ببوو. ئەوەی ئەوان تێی نەدەگەیشتن و دەبوو بۆیان ڕوون بکەمەوە، ئەوە بوو کە دەبووایە پێیان بڵێم لەبەر خاتری خۆم ئەو شتە دەکەم.

من ئەو کچەم خۆش دەویست، هێند لە ناخمەوە خۆشم دەویست، بە جۆرێک، هیچ گرنگ نەبوو لام نەخۆشە یاخود شتێکی لەو بابەتە. گوێم لەوە نەبوو ئاخۆ نەخۆشییەکەی لێ

دەگەڕێ پێکەوە زۆر بژین یان نا. ئەم شتانە لە بیروهۆشی مندا سفر بوون. زەین و خەیاڵم تەنیا لای شتێک بوو، کە دڵم بەردەوام پێی دەگوتم بیکەم. وام بیر دەکردەوە، کە خودای گەورە بۆ یەکەمین جار لە ژیانمدا ڕاستەوخۆ ڕێنوێنیی کردم، بۆیە منیش بڕیارم دا سەرپێچی لە پەیام و ڕێنماییەکانی پەروەردگاردا نەکەم.

گەرچی دەزانم ئێستا ڕەنگە هەندێکتان بڵێن دیارە بەزەییی بە جەیمیدا هاتووەتەوە، بۆیە ئەو کارەی کرد. هەندێک لە خەڵکی تریش وێدەچێت خەیاڵیان بۆ ئەوە بچێت، کە من لە بەرژەوەندیی خۆم ئەم شتەم کردبێت. منیش لە وەڵامدا بە هەردوو لا دەڵێم، نەخێر هەڵەتان کرد. من هاوسەرگیریم لەگەڵدا کرد، بێ ئەوەی گوێ بدەم بە داهاتوو، دەمگوت چا ئەنجام چی دەبێت، با ببێت، هیچ گرنگ نەبوو لام. هەر لە سەرەتاوە کە داوام لێ کرد شووم پێ بکا، دڵنیا بووم لە نیازی دڵی خۆم و ئێستاش دوای چل ساڵ، هیچ پەشیمان نیم.

جەیمی تەنیا کچێک نەبوو خۆشم بوێت و بەس، زۆر زیاتر بوو لەوە. لە ماوەی ئەو ساڵەدا، گەلێک شتی لێوە فێر بووم و کردمی بەم کەسەی ئێستا هەم. بە بزەی شیرین و ئامۆژگارییەکانی، فێری یارمەتیدان و هاوکاریکردنی خەڵکی تری کردم، سەبر و ئارامییەکەی، فێری مانای ژیانیان کردم. بگرە لە ماوەی نەخۆشییەکەشیدا، ڕووگەشی و ئومێد لە چاوەکانی دەبارین. سەرسامیان دەکردم.

لە کڵێسا، هێگبێرت خۆی مارەی کردین، باوکیشم وەک پاڵەوانترین کەسی ژیانم، لەتەکمەوە وەستابوو.

ئەمەش یەکێک بوو لەو شتانەی تر، کە جەیمی کردی. لە ناوچەکانی باشووری ویلایەتەکەمان، عادەت وا بوو لە کاتی هاوسەرگیریدا باوکت لەتەکتەوە دەوەستێت، بەڵام پێش ئەوەی جەیمی بێتە ژیانمەوە، ئەو نەریتە لای من چ مانایەکی نەبوو. هەر جەیمی بوو وای کرد من و باوکم لەیەک نزیک ببینەوە، جگە لەوەش، توانیی هەندێک لەو ناکۆکی و دڵعاجزییەی ساڵانی ڕابردوو ڕووی دابوو لەنێوان بنەماڵەی هەردووکمان، بسڕێتەوە. دوای ئەوەی باوکم ئەو چاکەیەی لەگەڵ من و جەیمی کرد، ئیدی بۆم دەر کەوت کە باشترین کەسە لە ژیانمدا پشتی پێ ببەستم. بگرە پاش ئەوەش، هەتاکوو کۆچی دواییشی کرد، پەیوەندیمان بەهێزتر و بەهێزتر دەبوو.

جەیمی فێری بەهای لێبووردەیی و ئەنجامەکانی کردم. ئەو ڕۆژەی ئێریک و مارگرێت هاتن بۆ ماڵیان و عوزرخواییان بۆ هێنایەوە، ئەو ڕۆژە ئەمەم بۆ دەر کەوت. جەیمی هیچ کینە و بوغزی لە دڵدا نەبوو. ئینجیل چۆنی فێر کردبوو، ئەویش ئەوها ژیانی خۆی بەڕێ کرد.

جەیمی تەنیا ئەو فریشتەیە نەبوو، کە لە شانۆگەرییەکەدا بە فریای تۆم سۆنتن کەوت و بەس، بەڵکوو فریشتەیەک بوو، فریای هەموومان کەوت.

هەر وەک بۆخۆیشی ئاواتی بۆ دەخواست، لە ڕۆژی مارەکردنەکەیدا، کە ١٢ی مانگی ئازاری ساڵی ١٩٥٩بوو، کڵێساکە لەبەر زۆری خزم و کەس جمەی دەهات. ئەو ڕۆژە زیاتر لە دوو سەد کەس لە ژوورەوە بوون و زیاتر لەو ژمارەیەش لە دەرەوە چاوەڕوان بوون. ئەوی ڕاستی

بێت، لێنەگەڕاین وەختی پێ بچێت، هەر زوو تەدارەکی مەراسیمەکەمان ساز و ئامادە کرد، لەبەر ئەوە نەپەرژاین ڕێوشوێنی باش بۆ میوانەکان دەستەبەر بکەین، جا بۆیە خەڵکیش فریای ئەوە نەکەوتن خۆیانی باش بۆ ئامادە بکەن و بە دەستودیاریی زۆرەوە بێن، تەنیا هاتن و پیرۆزباییان لێ کردین. هەرکەسێکم دەناسی، هاتبوو - خاتوو گاربەر، ئێریک، مارگرێت، ئێدی، سالی، کێری، ئەنجێلا، تەنانەت لیۆش لەگەڵ نەنکیدا هاتبوو - وەختێک مۆسیقای سەرەتا دەستی پێ کرد، کەس نەبوو چاوی بە فرمێسک تەڕ نەبێ. لەگەڵ ئەوەی جەیمی بە هۆی نەخۆشییەکەیەوە دوو هەفتە بوو لە جێگەدا کەوتبوو، بەڵام ئەو ڕۆژە وەک پێشتریش ئاواتی بۆ دەخواست، هەر سوور بوو لەسەر ئەوەی بەنێو ڕیزە کورسییەکانی ئەمبەر و ئەوبەری کڵێساکەدا باوکی دەستی بگرێت و پێشکەشی زاوای بکات. پێی گوتم، "لاندن، گەلێک بە ئاواتی ئەوەوە بووم کە وەختێک شووم کرد، باوکم بەنێو ڕیزە کورسییەکانی ئەمبەر و ئەوبەردا دەستم بگرێت و بمبات بۆ لای زاوا، ئەمە یەکێک بوو لە خەونەکانم، لەبیرت ماوە؟"

ئەو کاتە هەرچەند بڕوام نەدەکرد شتی وا ڕوو بدات، تەنیا سەرێکم دەلەقاند و بەس.

جەیمی بەنیاز بوو هەمان ئەو عەزییە سپییە لەبەر بکات، کە لە هۆڵی شانۆگەرییەکە لەبەری کردبوو، ئێ لەم پەلەپەلییەشدا هیچی تری دەست نەدەکەوت، فریا نەدەکەوت بچێتە بازاڕ و بگەڕێت. دەشمزانی لەچاو ئەوکاتەدا دەڵب و شل لەبەریدا دەر دەکەوێت. لەو ساتەدا کە لە بەردەمی

کڵێساکە بیروهۆشم بەم شتانەوە مەشغوڵ بوو، باوکم دەستی خستە سەر شانم و وتی، "من شانازیت پێوە دەکەم، کوڕی خۆم."

بە سەرلەقاندنەوە وتم، "منیش شانازیت پێوە دەکەم، باوکە گیان."

ئەوە یەکەمین جارم بوو تا ئەو کاتە پێی بڵێم شانازیت پێوە دەکەم.

دایکم لە ڕیزی پێشەوە دانیشتبوو، وەختێک مۆسیقای هاوسەرگیری لێدرا، ئەویش بە دەستەسڕەکەی لووشکەلووشک کەوتە سڕینی فرمێسکەکانی. دەرگا کرایەوە، بینیم جەیمی لەسەر کورسییە پێچکەدارەکەی دانیشتبوو، پەرستیارێکیش لەتەکیەوە. چەندی هێز و توانا تێدا بوو، بە لەرزەلەرز خۆی هەڵساند و هێگبێرتیش دەستی نایە بنباڵی و لەسەر کورسییەکەی هێنایە خوارێ. پاشان هێگبێرت دەستی گرت و بەنێو ڕیزە کورسییەکانی ئەمبەر و ئەوبەردا، هێواش هێواش هێنای، هەمووان بە چاوی تێڕامانەوە، بێ ئەوەی ورتەیەک لە دەمی کەس بێتە دەرێ، تەماشایان دەکرد. لە نیوەی ڕێگەکەدا، دیار بوو جەیمی ماندوو ببوو، ساتێک وەستان، تا پشوویەکی کورت وەر بگرێت. لە شەکەتی و ماندوویێتیدا چاوەکانی داخست، من لای خۆمەوە بڕوام نەدەکرد بەردەوام بێت لە ڕۆیشتن. ڕاستییەکەی، دە چرکەشی نەخایاند، بەڵام لای من دەتگوتساڵێکە، لێ دواجار تینی هێنایە بەر خۆی و هەنگاوی هەڵهێنایەوە. هەردووکیان پێکەوە دەستیان کردەوە بە ڕێوڕۆیشتنەکە، ئەمنیش لە ناخەوە هەستی شانازی دای گرتم.

لە ڕاستیدا، ئێستاش لەبیرمە، لە دڵی خۆمدا دەمگوت، ئەو ساتە کورتەی جەیمی بەرەو لام دەهات، سەختترین ڕێوڕۆشتن بوو لە ژیانی هەرکەسێکی تردا.

ڕێوڕۆیشتنێک بوو، دەبێت بە هەموو جۆرێک یاد بکرێتەوە.

تا جەیمی گەیشتە لای من، پەرستیارەکە کورسییەکەی هێنابووە ئەمسەر بۆی. وەختێک جەیمی گەیشتە تەنیشتم، هەموو دەستیان کرد بە چەپڵەلێدان. پەرستیارەکەش کورسییەکەی بۆ هێنایەوە و لەسەری دانیشت، گەلێک ماندوو بوو. ڕووبەخەندە چوومە سەر چۆکان، تا ئاستی ڕووم لە ئاستی ڕووی ئەو بێت، ئەوجا باوکیشم، بە دەستووری من، هەمان شتی کردەوە.

هێگبێرت، پاش ئەوەی جەیمیی ماچ کرد، ئینجیلەکەی هێنا و مەراسیمەکەی دەست پێ کرد. ئیدی لەو وەختەدا، هێگبێرت هەموو شتێکی وەلا خست و تەنیا بیر و حەواسی لای مەراسیمەکە و زاڵبوون بەسەر هەست و دەروونیدا بوو. کە لەپێش دەممماندا وەستابوو، هەستم پێ کرد زۆری لە خۆ دەکرد تا هیچ تێکچوونێکی دەروونی بە ڕوخسارییەوە دەر نەکەوێت. چاویلکەکەی هێنایە سەر لووتی و ئینجیلەکەی کردەوە، پاشان تەماشای من و جەیمیی کرد. هێگبێرت بەپێوە بوو، کەمێک هەر وا بەپێوە تەماشای کردین، دیار بوو چاوەڕوانی ئەوەی نەکردبوو ئەویش بێتە سەر چۆکان، پاشان ئەویش دانەوییەوە. جەیمی بە زەردەخەنەوە دەستی باوکی گرت، ئەوجا هێنای دەستی منیشی گرت، هەرسێکمانی وەک ئەڵقەیەک پێکەوە گرێ دا.

هێگبێرت، بە دەستوور و عادەتی خۆمان، مەراسیمەکەی دەست پێ کرد. ئەوجا چووە سەر خوێندنەوەی ئەو چەند دێڕەی جارێکیان جەیمی پێی گوتم، حەز دەکات بۆی بخوێنرێتەوە. لەگەڵ ئەوەی هێگبێرت دەیزانی جەیمی چەند بێتوانا و کەمحەوسەڵەیە، گوتم ڕەنگە داوامان لێ بکات ئەو چیی گوت، ئێمەش لەدوایەوە نزا و بەڵێنەکان بڵێینەوە، بەڵام جارێکی دیش هێگبێرت سەرسامی کردم. تەماشایەکی من و جەیمیی کرد، پاشان نیگای گواستەوە بۆ ئامادەبووانی نێو کڵێساکە، دواتر جارێکی دی سەرنجی گواستەوە سەر ئێمە، وەک ئەوەی بەدوای وشەیەکی گونجاودا بگەڕێت.

قرخەیەکی بە قوڕگی کرد و پاکی کردەوە، ئەوسا دەنگی هەڵبڕی، تا هەمووان گوێیان لێی بێت و وتی، "من وەک باوکێک، دەبێت کچەکەم پێشکەش بەم کوڕە بکەم، بەڵام دڵنیا نیم داخۆ بتوانم یان نا." هەمووان بێدەنگی دای گرتن و چاوەڕوانی وشەکانی دواتر بوون، هێگبێرتیش لەژێر چاویلکەکەیەوە سەرنجێکی دام، وەک ئەوەی بڵێ ئارام بە، جارێ شت ماوە بیڵێم. جەیمییش بۆ دڵدانەوەم، دەستمی توند گوشی. "گەر دڵیشم دەر بێنم، هێشتا لام ئاسانترە لەوەی جەیمی لێم دوور بکەوێتەوە. بەڵام ئەوەی پێم خۆشە و دەمەوێت ئەنجامی بدەم، ئەوەیە دوو دڵی تر بەیەک بگەن و چێژ لەو خۆشییانە وەر بگرن، کە جەیمی پێی بەخشیوم. خودای گەورە نازونیعمەتی خۆی بەسەرتاندا ببارێنێ."

ئەوجا کتێبەکەی خستە لاوە. دەستی هێنا و ئەمنیش دەستیم گرت، جەیمییش دەستی هێنا و هەرسێکمان بازنەیەکمان پێک هێنا.

پاشان هێگبێرت بەڵێنەکانی دەگوت و ئێمەش لەدوای ئەوەوە دەمانگوتەوە. باوکم هات ئەو ئەڵقەیەی دامێ، کە لەگەڵ دایکمدا پێکەوە هەڵمان بژاردبوو، جەیمییش ئەڵقەکەی خۆی هێنا. پێکەوە هەردووکمان ئەڵقەمان خستە پەنجەی یەکتر و هێگبێرتیش تەماشای دەکردین. ئەوسا کە تەواو ئامادە بووین، وەک ژن و مێرد ئێمەی ناساند. لە جەیمی نزیک بوومەوە و ماچیم کرد، لەولاشەوە دایکم قورگی پڕ ببوو، لێشاوی فرمێسک زابووە نێو چاوەکانی. دواتر دەستی جەیمیم هێنا و خستمە نێو دەستمەوە. لە بەرچاوی خودای گەورە و لە بەردەم هەموو ئامادەبووانداا بەڵێنی خۆشەویستی و وەفاداریی خۆمم دووپات کردەوە، لە خۆشی و ناخۆشی، لە کاتی تەندروستی و نەخۆشی، لە هەموو ساتە خۆش و ناخۆشەکانی ژیاندا. هیچکات ئەوەندەی ئەو ساتە هەستم بە کامەرانی نەکردووە لە ژیانمدا.

بیرمە خۆشترین و بەنرخترین ساتی تەمەنم بوو.

ئێستاش چل ساڵ بەسەر ئەو کاتەدا تێپەڕیوە، هەموو شتەکانی ئەو ڕۆژەم لەیاد ماوە. ڕاستە ئێستا تەمەنم بەساڵا چووە و عەقڵم کامڵتر و دونیادیدەترم، ڕاستە ڕەنگە لەو کاتەوە ژیانێکی تر ژیابم، بەڵام یادەوەرییەکانی ئەو ڕۆژە تەنیا یادەوەرین، لە زەین و خەیاڵمدا بەردەوام دێن و دەچن. ئێستاش خۆشم دەوێت، لە ماوەی هەموو ئەو ساڵانەدا، هەرگیز ئەڵقەی پەنجەشم لا نەبردووە گەر بۆ چەند ساتێکیش بێت.

هەناسەیەکی قووڵ هەڵدەکێشم و هەوای سازگاری بەهار هەڵدەمژم. لەگەڵ ئەوەی ئێستا شارۆچکەی بیوفۆرت گۆڕاوە

و منیش لەگەڵیدا گۆڕاوم، بەڵام هەوا سازگارەکەی هێشتا
هەر ئەو هەوایەی جارانە و هیچ نەگۆڕاوە. هێشتا هەوای
ڕۆژانی سەردەمی منداڵیمە، هەوای تەمەنی حەڤدەساڵیمە.
وەختێکیش هەناسە دەدەمەوە، دەبینم تەمەنم پەنجاوحەوت
ساڵە، بەڵام هیچ نییە. زەردەخەنەیەک دەکەم و سەرم
هەڵدەبڕم بەرەو ئاسمان، دەزانم تەنیا یەک شت ماوە پێتان
بڵێم: ئەویش ئەوەیە، کە ئێستا هاتومەتە سەر ئەو بڕوایەی،
هەرکاتێک بێت، پەرجوو ڕوو دەدات.

